٧

# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە،



کۆمەڵەی رۆشنبیری مێژوویی کوردستان دەریدەکات



- شەڕی پارتیزانی لە ماوەی شۆڕشی ئەیلولدا
- پۆلینی قۆناغەکانی مێژوو (مێژووی کورد)
- فەلسەفەی مێژوو لای تۆینبی
- الدولة الأيوبية الكردية في اليمن
- ماقاله المؤرخون عن صلاح الدين
- مماليك العراق النظام والطبقة

ژمارە ١٤
ساڵی چوارەم
بەهاری ٢٠١٠

# مێژوو

گۆڤارێکی مێژوویی وەرزییە، کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی مێژوویی کوردستان دەریدەکات




ژمارە (١٤) سالی چوارەم بەهاری ٢٠١٠







* گۆڤار : مێژوو
* ژمارە : [ ١٤ ]
* تیراژ : [ ٥٠٠ ] دانە
* چاپخانە : گۆڤار

**کوردستان / هەولێر - کۆلانی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێر**

# پێرست

## سەرووتار

## مێژوو و زمان

### ◂ توێژینەوە



### ◂ وەرگێڕان



### ◂ القسم العربي

## ◄ کەشکۆڵی گۆڤار

سەرووتار

# مێژوو و زمان

لەچەند وتارێکی پێشووتردا لەسەر هەندێك لایەنی پەیوەندی نێوان زمان و مێژووم نووسیبوو بە تایبەتی زمانی نووسینی مێژوویی، لەم وتارەشدا لایەنی تر دەخەینە ڕوو .

هەرچەندە زمان مێژووی خۆی هەیە زمانی کوردی لەسەردەمی ئیدارەی شێخ مەحمود وەکو ئەو زمانە نییە ئێستا قسەی پێ دەکرێت و پێی دەنووسرێت، بەبەراووردکردنی دوو دەقی هەردوو سەردەمیش ئەم ڕاستییە بەتەواوی بەدیاردەکەوێت، بە تایبەتی کە زمانیش کائینێکی زیندووە گەشە دەکات کە لەوانەیە نەخۆش بکەوێت لقی لێ ببێتەوە تەنانەت لەوانەشە بمرێ وەکو چۆن زۆر زمانی مردوو لە مێژوودا تۆمارکراون هەربۆ نموونە زمانی سۆمەری .

لەهەمان کاتدا زمان زۆر ڕاستی مێژوویی لە نێو خۆیدا هەڵدەگرێ کە لەوانەیە لە نووسینە مێژووییەکاندا باسیان لێوە نەکرابێ لە کاتێکدا کە زمان بەدیاری دەخات .

بۆ نموونە سەرچاوە کوردییەکان کە باس لە جوو لە کوردستان دەکەن لە پێش کۆچکردنیان بۆ ئیسرائیل، زۆر جەخت دەکەنەوە لە پەیوەندی پتەو و دۆستانەی نێوان کورد بەگشتی و جووەکانی کوردستان بەشێوەیەك کە هیچ ناکۆکییەك لە نێوان جووەکان و دانیشتوانی تری کوردستان نەبوویێت، لە کاتێکدا لەناو زمانی کوردیدا پێچەوانەی ئەوە دەبینینەوە کاتێك جوو بوون نیشانەیە بۆ ترسنۆکی دەوڵەمەندی بێ شومار کە دیارە ترسنۆکیەکە لایەنێکی نەرێنییە، هەروەها سەبارەت بە ژن لە کۆمەڵگای کوردی سەرەڕای ئەوەی کە چەند ڕۆژهەڵاتناسێکیش لە نووسینەکانیاندا زێدەڕۆییان لەوە کردووە کە باسیان لە ئازادی پتری ئافرەت کورد کردووە بەبەراوورد لەگەڵ ئافرەتانی نەتەوەکانی دراوسێ ی کورد بەڵام دیارە لەنێو زمانی کوردیدا بە شێوەیەکی باش ژن هەڵنەسەنگێندراوە چونکە ژن هەرچەندە ستایش بکرێت بە ژنێکی پیاوانە ناو دەبرێت لە کاتێکدا کە زۆر سوکایەتی بە پیاوێك دەکرێت ئەگەر بە ژنانی ناو بهێندرێت، بەم شێوەیە لە نێو زماندا زۆر ڕاستی مێژوویی هەیە کە لەوانەیە مێژوونووسان باسیان نەکردبێ یان پینەیان کردبێ یان پەردەپۆشیان کردبێ ئەمەش تەنیا دوو نموونە بوو لە کاتێکدا ئەم بابەتە زۆر هەڵدەگرێ و دەتواندرێ کتێبێکیشی لەسەر بنووسرێت .

سەرنووسەر

# شەڕی پارتیزانی لە ماوەی شۆڕشی ئەیلولدا

قارەمان حەیدەر ڕەحمان

شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی ١٩٦١ بە ڕابەرایەتی مستەفا بارزانی و لەژێر سێبەری پارتی دیموکراتی کوردستان هەڵگیرسا وبەردەوامیدا تاکو ئازاری ١٩٧٥ کە لە ئەنجامی پیلانێکی سێ قۆڵی لەنێوان حکومەتەکانی عێراق و ئێران و جەزائیر، بە پاڵپشتی حکومەتی ئەمەریکا هەرەسی هێنا، دوای ئەوەی هەردوو حکومەتی عێراق و ئێران پرۆتۆکۆلێکی هاوبەش لە بەرژەوەندییان ئیمزا کرد لەپێناو لەناوبردنی بزاڤی نەتەوەیی کورد لە کوردستانی باشور کە بە ڕێکەوتننامەی جەزائیر ناسراوە. هەرچەندە شۆڕشی ئەیلول توانی ببێتە سەرەتایەك بۆ دروستبوونی هزری نەتەوەیی لەلای کوردەکانی کوردستانی باشوور و ڕەواندنەوەی متمانە بە خۆنەبوون لەلایەن نەتەوەی کورد لەپێناو ڕاوەستان و دەنگ بەرزکردنەوە بۆ داواکردنی مافە نەتەوایەتییەکانی، لەهەمان کاتدا بووە هۆی دروستبوونی چەندان ڕێکخراوی سیاسی تر لە کوردستانی باشوور چونکە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول تەنها حیزبی شیوعی عێراقی هاوبەش بوو لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە ناوچەکە، بەڵام دواتر بەهۆی هەرەسهێنانی شۆڕشەکە کە لە ئەنجامی ئەم ڕێکەوتنەی لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد، جیاوازی لە بیروبۆچوونەکان دروست دەبێ و لە بەرەنجامیشدا چەندان ڕێکخراوی سیاسی و گروپی چەکداری دروست دەبن و دێنە ناو بزاڤی ڕزگاریخوازی کورد لە ناوچەکە لە دیارتیشنیشیان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حیزبی سۆسیالیستی کوردستان و حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان و پارتی گەل و چەندانی تر، وێڕای درێژەدانی پارتی دیموکراتی کوردستان

بە خەبات لە شۆڕشێکی تر بەناوی شۆڕشی گولان. سەرەڕای ئەمەش پێشمەرگە لە شۆڕشی ئەیلولدا توانی متمانەیەك لای جەماوەرەکەی دروست بکات و لەهەمان کاتدا بەهۆی ئاستی بەرزی لە شەڕکردن و فشاری زۆری بەسەر حکومەتی عێراقی توانی حکومەتی عێراقی بۆ چەندان جار پەلکێش بکات بۆ سەر مێزی گفتوگۆکردن و دانوستاندن لەپێناو گوێگرتن لە داخوازییەکانی گەلی کورد.

دیاریکردن و هەڵبژاردنی ئەم بابەتە لەلایەن منەوە دەگەڕێتە بۆ نەبوون، یاخود کەمی، سەرچاوەی مێژوویی لەسەر شەڕی پارتیزانی لەبەرئەوەی زۆربەی ئەوانەی کەباسیان لە شۆڕشی ئەیلول کردووە زۆر بە پەرش و بڵاوی باسیان لە لایەنی سەربازی شۆڕشەکە کردووە، و بەڵکو زیاتر پێداگرییان لەسەر مەسەلە سیاسییەکان کردووە، جگەلەوەش ئەم شێوازە لە شەڕکردندا تاکو ئێستاکە لە ناوچە جیاجیاکانی جیهان پەیڕەو دەکرێت.

سەبارەت بە توێژینەوەکەم چەندین سەرچاوەی جۆراوجۆرم بەکارهێناوە، لە هەموویان گرنگتریش کە زۆر پشتم پێ بەستووە (البارزاني و الحركة التحررية الكوردية) بەرگی سێیەمی کە دانەرەکەی (مەسعود بارزانی)یە، و بەرگی دووەمی کتێبی (أحداث عاصرتها)ی (موحسین دزەیی)یە، لەگەڵ چەندین دیداری تایبەت لەگەڵ ئەم کەسایەتییانەی کە بەشداری ڕووداوەکانی ئەم سەردەمە بوون.

ئەم توێژینەوەیە لە پێشەکی و سێ تەوەری بنەڕەتی و کۆتایی پێکهاتووە. تەوەری یەکەم (شەڕی پارتیزانی لە مێژووی کۆن و هاوچەرخی کورددا)، کە تیایدا باس لە مێژووی شەڕی پارتیزانی دەکات لە ماوەی ٤٠٠ پ.ز تاکو هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول کە بەشێوەیەکی کورت باس لە ڕووبەڕووبوونەوەی کوردەکان دەکات لەگەڵ ئەو هێز و لەشکرانەی کە ڕوویان لە کوردستان کردووە. تەوەری دووەمی توێژینەوەکەم باسی (شەڕی پارتیزانی لە ماوەی شۆڕشە ئەیلولدا) دەکات، کە تیایدا بە ڕوونی و بە ووردی

ڕووداوکانی ئەم ماوەیە دەردەخات لە شەڕ و بەرەنگاربوونەوەی کوردەکانی کوردستانی باشوور بە سەرکردایەتی مەلا مستەفا بارزانی بەرامبەر بە لەشکرکێشی حکومەتی عێراقی بۆ سەر ناوچەکە، و چەندان شەڕی گرنگ لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٦١تاکو ١٩٧٠ ئامازەم پێکردووە و لەهەمان کاتدا ئاکام و دەرەنجامەکانیشم بەشێوەیەکی ڕوون دەرخستووە. جگەلەوەش لەم تەوەرەیەدا باس لە گرنگترین دانوستانەکانی نێوان حکومەتی عێراقی و سەرکردایەتی شۆڕشی کورد کراوە لەم ماوەیەدا.

سەبارەت بە تەوەری سێیەمی توێژینەوەکە باس لە (گۆڕانکارییەکانی عێراق و هاتنەدی مافەکانی نەتەوەی کورد) دەکات، لەم تەوەرەیەدا زیاتر جەخت لەسە ئاکامی شۆڕشەکە و ئەو گۆڕانکارییانەی لەنێو دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی لە عێراق ڕوویاندا لەئەنجامی چەند کودەتایەکی سەربازی یەك لەدوای یەك و وەرگرتنی دەسەڵات لەلایەن حیزبی بەعس و هەوڵەکانی هەردوو لا بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد کە دەرەنجامەکەی ڕێکەوتننامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ی لێکەوتەوە.

بەربەستی بەردەم توێژینەوەکەم کەمی سەرچاوە لەسەر لایەنی سەربازی لەم ماوەیەدا بوو، بۆیە زیاتر پشتم بە دیدار و چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە بەشداربوونە لە شەڕەکە، بەستووە، ئەگەرچی زۆربەی ئەوانەی بەشداربوون لە ژیاندا نەماون، یاخود بەساڵاچوون و توانای بیرکردنەوەیان لاواز بوون.

**دەروازە :**

شەڕێ پارتیزانی شێوازێکە لە شێوازەکانی شەڕ کە جۆرە تایبەتمەندییەکی خۆی هەیە و بریتی یە لەو شەڕانەی کە لەنێوان هێزە نیزامییەکان و هەندێك پێکهاتەی چەکدار ڕوودەدات لەپێناو بەدیهێنانی کۆمەڵە ئامانجێکی دیاریکراو بە پشتگیریکردنی جەماوەر یاخود بەشێکی جەماوەر، ئامانجی ئەم پێکهاتانە هەڵکەوتنی ئەو هەل و مەرجانەیە کە یاریدەی بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە دەدات کە خەباتی لە پێناو دەکەن،

لەهەمان کاتدا ئەو پارتیزانانەی کەوا پێکهاتەی شەڕی پارتیزانین لەو خۆبەختکەرانەن کە لە خەباتی خۆیاندا پشت بە جەماوەر دەبەستن بە هەردوو شێوازەکانی ماددی و مەعنەوی، ئینجا چ بە هاوبەشیکردنی جەماوەر بێت لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازیدا لەڕووی مرۆییەوە، یاخود کۆمەك کردنی پاتیزانەکان لەلایەنی دارایی و دابینکردنی خۆراك و پۆشاك و جێگای حەوانەوە[١].

جەنگاوەرە پارتیزانەکان پێیان دەووترێت گەریلا[٢] لەکاتێکدا کە هیچ پێناسەیەکی دیاریکراو نیە بۆ وشەی گەریلا بەلاّم هەندێکجار بەمانای شەڕی پارتیزانی یاخود شەڕی میللی یان شۆڕش دێت، هەندێکجار بە بزوتنەوەیەکی بەرگری یاخود ڕزگاری دەووترێت، هەندێ: وا پێناسەی پارتیزانەکان دەکەن کە شەڕی لەشکر و سوپا دیکتاتۆرەکان دەکەن کە لە ئاست و توانای سەربازی لە خۆیان پێشکەوتووترن هەر بۆیە پەنا دەبەنە بەر ئەم جۆرە شەڕە بەهۆی هاوسەنگ نەبوونی هێز لەنێوانیاندا، بەلاّم شەڕەکە بەشێوازێکی سادە ئەنجام دەدەن[٣].

هەندێ: وا پێناسەی پارتیزانەکان دەکەن کە شەڕی ئەو هێزانە دەکەن کە لە ئاست و توانای سەربازی و لەجۆری چەك و مەشقی سەربازی لەخۆیان پێشکەوتوترن، بەم جۆرەش بوونەتە تۆلّەسەندەرەوەیەکی سیاسی[٤].

شەڕی پارتیزانی شەڕێکی ترسناك و خوێناوییە و فاکتەرێکی کاریگەرە بۆ داڕووخـانی ورەی لایـەنی بەرامبـەر، فاکتـەرە پالّـەرەکان جێبـەجێکردنی ستراتیژییەتی جۆراو جۆرە بۆ لێکترازان و دوورخستنەوەی هێزەکانی بەرامبەریان شپرزەکردن و تێکدانی هاوسەنگی و سەقامگری هێزەکان و گەڕاندنەوەیان بۆ قۆناغی بەرگریکردن لە خۆیان، گەریلا پێویستە هەمیشە بەدوای خالّە لاوازەکانی لایەنی بەرامبەردا بگەڕێت لەکاتی جێبەجێکردنی بەرنامە و داڕشتنی پلانی شەڕ و پێویستە تاکتیکی شەڕ بزانێت[٥].

ماوتسی تۆنگ[٦] کە باس لە تاکتیکی شەڕ دەکات ئامۆژگاری پارتیزانەکان دەکات، دەڵێت: "بگەڕێنەوە کاتێك دوژمن بەرەوپێش دێت، سەرقاڵی بکەن کاتێك دەوەستێت، گورزی لێ بوەشێنن لەو کاتەی هیلاك دەبێت، و بەدوایان کەون کاتێك رادەکەن"[٧].

بۆ شەڕی پارتیزانی زیاتر ناو جەنگەڵ و دۆڵ و کێوەکان هەڵدەبژێردرێن وەك شوێن، و جێگەی حەوانەوە و باشترە کە دووربێت لە ناوچەی دەسەڵاتی لایەنی بارامبەر و کەنار کەوتبێت، هەروەها گونجاوترە نزیك بێت لە دێهات و ناوچە ئاوەدانییەکان، بەڵام ئەگەر لە شارەکان دووربێت چاکترە. بەشێوەیەکی گشتیش ئەو شوێنانەی کە شەڕی پارتیزانی تێدا ئەنجام دەدرێت پێویستە کەمتر رێگای هاتوچۆی ئۆتۆمبێلی لەسەر بێت تاوەکو هێزەکانی بەرامبەر بەئاسانی دەستیان پێی نەگات بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی رۆژانە و زیاتر پشت دەبەسترێت بە توانای ئاژەڵ بۆ هاتوچۆکردن لەو شاخ و چیایانەدا. ئەم شوێنانە هەڵدەبژێردرێ بۆ دامەزراندنی بنکە و بارەگاکانی گەریلا و ئەنجامدانی چالاکییە نهێنییە سەربازی و سیاسییەکان، چونکە لە رووی ئاسایشەوە هیچ مەترسییەکی لەسەر نییە، بەتایبەتی ئەگەر هاتو رووبەرووی شەڕەکانی ئاسمانی و زەمینی بۆوە، چونکە دەتوانن بەهۆی مکۆمی ناوچەکە بەباشی خۆیان بپارێزن. لەڕووی ئابووریشەوە شوێنی دارستان سودێکی زۆری هەیە، چونکە بەرهەمی درەختەکان باشترین هۆکاری بژێوین بۆ گەریلا، هەروەها سەرەڕای ئەوەی ئەم داروبارە سوودی لێوەردەگیرێت بۆ دروستکردنی بنکە و بارەگا و شاردنەوەی کەل و پەل و تفاقەکان[٨].

بەگشتی باشترە تەمەنی گەریلا لە ٣٥ساڵ تێنەپەڕێ و تەندروستی باش بێت و لەسەر بیروباوەڕێکەوە هاتبێتە ناو ریزەکانی پارتیزانی، هەروەها دەبێت بەراکبەر بە لێپرسراوەکانی توانا و لێهاتوویی خۆی دیاربیکات، ئاخۆ دەتوانێ چ کارێکی شۆڕشگێڕانە ئەنجامبدات، شەڕ دەکات یان دەستی نووسینی هەیە؟ لەڕووی هونەرییەوە چی دەزانێت؟ لەلایەکی تر دەبێت ناوبانگی باشی هەبێت و جێگای متمانە

بێت، گەریلا دەبێت نەترس و توندوتۆڵ بێت بەرامبەر بە هەر فەرمانێك كە پێی دەسپێردرێت گوێڕایەڵ بێت و جێبەجێی بكات(٩).

هەروەك ئاماژەمان پێدا شەڕی پارتیزانی لەلایەن هێزیكی كەم ئەنجام دەدرێت لەبەرامبەر هێزێكی گەورەی نیزامی كە كاریگەری زۆری هەیە، هەرچەندە ئەوانەی لەم شەڕە بەشداری دەكەن ڕەنگە ژمارەیان كەم بێت لەكاتی دانانەوەی بۆسە یاخود لەكاتی هەڵكوتانە سەر لایەنی بەرامبەر دەتوانن خۆیان لەگەڵ هەل و مەرجە دژوارەكاندا بگونجێنن، وەك نەبوونی خۆراك و پێداویستییەكانی حەوانەوە بەتایبەتی لەو كاتانەدا كە لە بنكە و كۆڵگە سەرەكییەكانی خۆیان دووردەكەونەوە، جگە لەوەی كەوا ئەم ژمارە كەمە بە زەحمەتتر لەلایەن هێزی بەرامبەر دەكەونە دەست و دەستگیر دەكرێن و زەرەر و زیانیشیان كەمترە، بە بەراوورد لەگەڵ ئەوەی هێزێكی گەورە ئەم شەڕە بكات(١٠).

ئەم پێكهاتە چەكدارانە بەپێی بەرنامە و پلانی سەربازی سادە و ساكار هێرش دەكەنە سەر بنكە و مۆڵگە سەربازییەكان، بەڵام گورزی زۆر كاریگەر لە یەكە سەبازییەكان دەوەشێنن چونكە زیاتر لەو كاتانەدا گورز دەوەشێنن كە لایەنی بەرامبەریان هیچ ئامادەكارییەكی نەكردووە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم جۆرە هێرشانە(١١).

ئەم شوێنانەی كەوا لەلایەن پارتیزانەكانەوە هەڵدەبژێردرێ بۆئەوەی هێرشی بكرێتە سەر زیاتر بنكەكانی پۆلیسن، بەتایبەتی ئەو بنكانەی دەكەونە ناوچە شاخاوییەكان؛ یاخود مۆڵگە و حەشارگەكانیان، هەندێكجاریش دانانەوەی بۆسە لەسەر ئەم ڕێگایانەی جموجوڵی سەربازییان لەسەرە بەمەبەستی پچڕاندنی پەیوەندی لەنێوان هێزە سەربازییە نیزامییەكان(١٢).

گەریلا جل و بەرگی تایبەت دەپۆشێ، بەگوێرەی وەرزەكانی ساڵ، لەبەهار جل و بەرگی سەوز دەپۆشێ و لە هاوینیشدا ڕەنگی خاكی لەبەر دەكات، مەبەستیش لە

گونجاندی ئەو بەرگانە لە کاتی وەرزەکانی ساڵ لەپێناو ئەوەیە لەکاتی جولانەوە و جموجوڵی سەربازییدا فڕۆکە جەنگییەکان ئەتوانن ئاشکرایان بکەن، زۆرکاتیش کە دەکەونە ناو چەم و دۆڵەکان، گەڵای دار لە خۆیان دەئاڵێنن تا وەکو درەخت دەربکەون[١٣].

لە شەڕی پارتیزانی زیاتر بایەخ بە چەکی سووک و ڕیز ئەدرێ وەکو کلاشینکۆف، چونکە سوکە بۆ هەڵگرتن و لەکاتی تەقاندنیشدا کەم دەوەستێ و بەکارهێنانی زۆر ئاسانە، بۆیە بەمەبەستی بەکارهێنانی گەریلا ڕادەسپێردرێ کە لەو کاتانەی توشی ئابلۆقەدان دەبێتەوە لەناو شەڕ پێویستە زۆر دەست بە تەقەمەنییەکانییەوە بگرێت و بەڕیزە تەقە نەکات بۆئەوەی زۆرترین کات پارێزگاری لەخۆی بکات تاکو دەتوانێ خۆی ڕزگار بکات[١٤].

چەندان جۆرە چەکی تر هەن کە بۆ شەڕی پارتیزانی سوودبەخشن، وەکو ڕەشاشی بی کەی سی و دیکتاریۆف و قەناس و ئارپی کەی و ئارپی جی و چەکی قورسیش وەکو هاوەنی ٦٠ ملم و ٨٠ ملم و ٥٧ ملم، ئەمانەیش بۆ گواستنەوە سوکن و دەگوێزرێنەوە. هاوەنی ٥٧ ملم و ئارپی جی زیاتر بۆ تێکشکانی تانك و زرێپۆش و تێکدانی سەنگەرەکان بەکاریان دێنن[١٥].

ئەم پێکهاتە چەکدارانە پێویستە پەیوەندییان لەگەڵ جەماوەر لەوپەڕی توندوتۆڵیدا بێت و هەمیشە لەنێوانیاندا دەبێ بجوڵێنەوە و ڕێباز و بەرنامە و بیروباوەڕ و ئامانجی خۆیانیان بۆ ئاشکرا بکەن، تاوەکو پشتیوانی جەماوەر بەدەست بهێنن کە یەکێکە لە فاکتەرە سەرەکییەکانی شەڕی پارتیزانی، ئەم ئەرکەش لە ئەستۆی ڕێکخستنەکانی ناوخۆی جەماوەردایە[١٦].

لێهاتوویی سەرکردە و سەرکردایەتییەکی سیاسی و عەسکەری بەهێز مەرجن بۆ دروستکردن و ئەنجامدانی شەڕی پارتیزانی و بەردەوام بوون لەسەر پەیڕەوکردنی ئەم

شەڕە، بەجۆرێك ئەو کەسەی سەرکردایەتی ئەو پێکهاتە چەکدارانە دەکات مەرجە لەلایەن جەماوەرەوە پشتی پێ ببەسترێ و جێگای متمانە و خۆشەویستی بێت، لەلایەن زۆربەی چینەکان، لەهەمان کاتدا پێویستە ئەو سەرکردەیە پەیوەندی دۆستایەتی و دیبلۆماسی دەرەکی لەگەڵ هاوسۆزەکانی هەبێت، جگە لەوەی سەرکردایەتییەکی سیاسی و عەسکەری بەهێزیش پێویستە بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکانی کارگێڕی و دانانی پلانی ئایندەیی و بەرنامەی کار و چالاکییەکان[١٧].

خۆراکی سەرەکی گەریلا و ئەم پێکهاتە چەکدارانە لە نان و شەکر و چای پێکهاتووە، کە بەهۆی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ جەماوەر بەدەستیان دەکەوێت. جگە لەوەی لەکاتی جوڵانەوەیاندا بەناو ئاوەدانییەکاندا لەلایەن خەڵکی ئەم ناوچانەوە میوانداری دەکرێن و جێگای حەوانەوە و خواردنی پێویستیان بۆ ئامادە دەکرێت، هەر گەریلایەکیش جگە لە چەکەکەی زەمزەمەیەکی ئاوی پێیە کە ئاوی تێدا خراپ نابێ[١٨].

لە کوردستاندا حوسێن حوزنی موکریانی بۆ یەکەمین جار لە گۆڤاری زاری کرمانجی لە بیستەکاندا بەم پێکهاتە چەکدارانەی لە چیاکانی کوردستان هەبوونە گوتووە پێشمەرگە، بەڵام بۆ یەکەمین جار ئەم ناوە بەکارهاتووە لە سەردەمی کۆماری کوردستان لە شاری مەهابادی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لەو کاتەدا کە لەشکرێك دروستبوو بەناوی لەشکری شۆڕشگێڕی کوردستان کە فەرماندەکەی جەنەراڵ مستەفا بارزانی بوو، و بە پێکهاتەکانی ئەم لەشکرە گووتراوە پێشمەرگە[١٩].

**تەوەری یەکەم**

**شەڕی پارتیزانی لە مێژووی کۆن و هاوچەرخی کورد**

بەدرێژایی مێژووی کۆن میللەتی کورد ئەم جۆرە شەڕەی ناسیووە و تارادەیەکی زۆریش سەرکەوتنیان تێدا بەدەستهێناوە، هۆکاری پەنابردنی کورد بۆ ئەم جۆرە شەڕە هەر لە سەرەتاوە دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری لاوازی هێزەکانیان لەڕووی چەك و مەشقی

سەربازی و پەرتەوازەیی و نەبوونی یەك سەرکردە و یەکنەگرتنی پێکهاتەکانی ڕێگربوون لەبەردەم دروستبوونی هێزی چەکداریی نیزامی، هەربۆیەش پەنایان بردۆتە بەر ئەنجامدانی شەڕی پارتیزانی لەو کاتانەی ڕووبەڕووی کێشە و گرفتە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بوونەتەوە، بەپشتیوانی چیا و دۆڵ و دەشتەکانی کوردستان کە فاکتەرێکی بەهێز بوون بۆ بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی بەرامبەریان، هەروەك لە کتێبەکەی زەینەفۆن بەدیارکەوتووە لە کتێبی ئەناباسیس کاتێك باسی گەڕانەوەی لەشکری یۆنانی دەکات لە (٤٠١– ٤٠٠ پ.ن) و تێپەڕبوونیان بە وڵاتی کوردانی چیایی، کە بە کاردۆخییەکان ناویان دەبات کە چەند هیلاکییان بۆ هێزەکەی دروست کردووە. هەروەها ئاماژە بە کورد کراوە لە کتێبی جوگرافیای یۆنانی بەناوی سترابۆ لە سەدەی یەکەمی پێش زایین و دەڵێت: "کوردەکان زۆر بەتوانا و زیرەکن لە هەڵمەت بردن و خۆقایمکردن لەڕووی سەربازی و لە هونەری ئابلۆقەدان و دەست بەسەرداگرتن زۆر پێشکەوتوون"[٢٠].

کورد لەبەرئەوەی پێکهاتە کۆمەڵایەتییەکەی هۆزایەتی بووە سیستەمی ژیانیان بریتی بووە لە کشتوکاڵکرن و ڕاوچییەتی، هەر بۆیە لە سەرەتاوە چەکیان ناسیووە و بۆ ڕاوکردن بەکاریان هێناوە، جگە لەمانەش هۆزە کوردەکان هەمیشە لە ناوخۆیان کێشە و ململانێیان هەبووە لەسەر مەسەلە کۆمەڵایەتییەکان، بۆنموونە لەسەر زەوی و زار و دەسەڵات گرتنە دەست، هەر بۆەیش ئەم ناکۆکییانە بوونەتە هۆی دروستبوونی شەڕ لە نێوانیاندا و بەم شێوەیەش هێرشیان کردۆتە سەر یەکتری. زەینەفۆنی سەرلەشکری یۆنانیەکان دەیگێڕێتەوە لە سەرچاوەی پێشوو کە ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام لەو شەڕە ئەو کۆمەڵە خەڵکانە بوون کە بە حیسسی ناویان دەبات لەناوچەکانی نێوان وڵاتی بابل و کاردۆخستان و دەڵێت: "ئەمانە هەرچەندە تیریان دەهاویشت تیروکەوانەکانیان لەدەست نەدەکەوتە خوارەوە، ئەمانە هەندێکیان بە

کۆمەڵ هێرشیان بردە سەر پاشەڵی لەشکری یۆنانییەکان و چەند کەسێکیان لێ بە پەڵە بەرد و تیر کوشتن و بریندار کردن، ئەمانە تەنیا چەند کەسێك بوون و یۆنانییەکان لە ناکاو هاتبوونە سەریان، ئەگەر بهاتبایە و ژمارەیان لەوە پتر بووایە گومان لەوەدا نییە کە لەشکری یۆنانییەکان دەکەوتە بەردەم مەترسی تەفر و تونابوونی تەواو"[٢١].

لە ساڵانی ١٢٨٠ هۆلاکۆی سەرلەشکری مەغۆل هێزێکی گەورە ئامادە دەکات بۆئەوەی بەرەو رۆژئاوای عەرەبی بکەوێتە رێگا بۆ لەناوبردنی خەلافەتی عەرەبی و دەستبەسەرداگرتنی ئاسیای رۆژئاوا، لە کرماشان هۆلاکۆ فەرمانی بە سوپاکەیدا بەرەو بەغدا بکشێت، لەشکرکێشییەکەی خستە ژێر فەرمانی ئەرقانۆیانەوە، تاوەکو رووبکاتە هەولێر و ئەو قەڵایەی کە تێیدایە پەلاماری بدات و ئەو لەشکرە کوردەی لە قەڵاکەدایە لەناوبەرێت، لەشکری مەغۆل قەڵای هەولێریان ئابڵوقەدا بە مەبەستی ئەوەی ئەو هێزەی لەناو قەڵاکەدایە بە بێ شەڕ خۆی بەدەستەوە بدات، بەڵام ئەو هێزە کوردە لەناو قەڵاکەدا بوو شەوێك لەناوقەڵایەکە هاتە دەرەوە و هەڵیکوتایە سەرلەشکری هۆلاکۆی مەغۆل، ئەوەی کەوتە بەردەستیان سەریانبڕی و کوشتییان و هەرچی کەرەستە و تفاقی ئابڵوقەدەرەکان بوو تەفروتونایان کرد و دواتر بەپەلە خۆیان کوتایەوە ناو قەڵاکە. ئەم کارەساتە ئەژنۆی ئەرقەنۆیانی هێنایە لەرزەوە، و دڵی لە ئابڵوقەدانەکە ساردکردەوە و دەستی هەڵگرت لە دەستبەسەرداگرتنی قەڵای هەولێر و دوای ئەوەی نائومێدبوو لەوەی بتوانێ بەشەڕ کۆنترۆڵی بکات، لەلایەکی تریشەوە خێڵە کوردیەکانی تر هەر بەشەڕی پارتیزانی رووبەڕووی لەشکری مەغۆل بوونەوە و لەناوچەکانی بۆکان و دیاربەکر، بەڵام دواتر بەهۆی زلهێزی لەشکری مەغۆل بەناچاری خۆیان تەسلیم کرد، لەدوو سەدە و نیوی دوای ئەوەدا حوکمداری مەغۆلەکان و ئیلخانییەکان و تەیمورلەنگی تەتەر و نەوە پاشماوەکانی هەمیشە لەلایەن کوردەکانەوە شان بەشانی ئەرمەنییەکان بەشەڕی پارتیزانی بەهەڵستییان کراوە[٢٢].

لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا ناوچە کوردییەکان بەرهەڵستی زۆری لەشکری موسوڵمانەکانیان کردووە وبە ئاسانی فەتحکردنیان تێدا ئەنجام نەدراون و بەرگریش لەم ناوچانە کراوە لەبەرامبەر لەشکری موسوڵمانەکان. هەر بۆیەش لەشکری موسوڵمانەکان زۆر توندڕەوبوون لەگەڵ خەڵکی ئەم ناوچانە. محەمەد ئەمین زەکی بەگ لە کتێبەکەی بەناوی (خلاصە تأریخ الکرد و کردستان) بەپشت بەستن بەزۆر سەچاوەی مێژوویی وای بۆدەچێت کە کوردەکان بەشدارییان کردووە لە هەموو ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەی لە کوردستاندا هەڵگیرساون لە ڕۆژگاری ئەبو جەعفەری مەنسور، وە کوردەکان هەڵگەڕانەوە لەسەردەمی خەلیفەی عەباسی موعتەسەم لە ناوچەکانی نزیك موسڵ بەسەرۆکایەتی جەعفەری کوڕی مەهر حەسەن کە ناسراوە بە میر حەسەن لە ساڵی ١٨٤٠ز، بەهەمان شێوەش لە سەردەمی موقتەدا یاخود لە سەردەمی بوەهییەکان جگە لەم شەڕانەش چەندان شەڕی تر لەنێوان سوپای خەلافەت و کوردەکان ڕوویانداوە، لەدوای لەناوچوونی خەلافەتی عەباسی و دروستبوونی دەوڵەتی عوسمانی کوردەکان بەردەوام بوون لە هەوڵە ڕزگاریخوازەکانیان لەڕێگەی ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەی کەوا لە ناوچە کوردییەکاندا هەڵدەگیرسان، بە پشت بەستن بە شێوازی شەڕی پارتیزانی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێز و لەشکرەکانی بەرامبەریان.

لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم بەشی باشوری کوردستان زۆر ڕاپەڕینی بەخۆوە بینیووە، وەك ڕاپەڕینی عەبدولڕەحمان پاشای بابان ساڵی ١٨٠٦ و هەوڵەکانی میر محەمەد ١٨١٣ و میری سۆران و دروستکردنی لەشکرێکی گەورەی کوردی و چەکدارکردنی بە شێوەیەکی ڕێك و پێك و هەروەها هەوڵدان بۆ ڕزگاری لە دژی سوڵتانی عوسمانی لەپێناو دروستکردنی کوردستانێکی یەکگرتوو[٢٣].

هەروەها بزوتنەوەی ئیسماعیل پاشای بادینان و بزوتنەوەی میر بەدرخان کە سنووری دەسەڵاتی فراوانبوو لە ڕۆژهەڵات و باشوری کوردستان لە ساڵی ١٨٤٢، و دواتر ڕاپەڕینی یەزدان شێر لە ساڵی ١٨٥٥ لە دژی دەوڵەتی عوسمانی نموونەیەکی تری بەهێزی کوردەکانە لە شەڕی پارتیزانی کە توانی دەست بەسەر شاری بەدلیسدا بگرێت و تەواوی ئەو ناوچانەی کەوتە دەست کە کەوتبووە نێوان وان و بەغدا و لەژێر چنگی دەوڵەتی عوسمانیان دەربهێنێت[٢٤].

شێخ عوبەیدوڵای نەهری گەورەترین شۆڕشی کوردایەتی لەبەرامبەر عوسمانیەکان بەرپا کرد، بەڵام شۆڕشەکە تا کۆتاییی سەری نەگرت، بۆیە دەگوترێ شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵا سەرهەڵدانێکی نەتەوەیی بووە[٢٥].

شێخ عوبەیدوڵای نەهری بە هاوکاری هەمزە ئاغای سەرۆکی هۆزی مەنگور و بەپشتیوانی کۆمەڵە سوارچاکێکی کورد لە کوردستانی تورکیا چوونە ناو ئێرانەوە و لەڕێگای چیای باشووری ئورومیە و لە ڕۆژئاوای بەسەرکردایەتی بیست هەزار جەنگاوەر توانیان گورزی کوشندە لە سوپای ئێران بوەشێنن و چەندان ناوچەیان کەوتە دەست، بنەماڵەی بەدرخانییەکانیش ڕۆڵێکی سەرکەوتوویان گێڕا لە ڕاپەڕینەکانی کورد و داوایان لە دەوڵەتی عوسمانی دەکرد سەربەخۆییان بداتێ و بەهۆی گوێنەدانی دەوڵەتی عوسمانی بە داخوازییەکانیان بەدرخانییەکان ڕویان کردە شەڕی پارتیزانی لە بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی و کوڕەکانی بەدرخان لە سەرووی ئەم پێکهاتانەوە بوون کە شەڕی پارتیزانیان لەبەرامبەر سوپا و لەشکری عوسمانیدا ئەنجام ئەدا. لەدوای کودەتای ئیتیحادییەکانیش لە تورکیا ١٩٠٨ کۆمەڵەی تەعاون تەرەقی لە کوردستانی باکوور دەرچوو بەسەرکردایەتی شێخ عەبدولقادری نەهری و ئەمین عالی بەدرخان، کە هەرچەندە بزوتنەوەیەکی ڕۆشنبیری و سیاسی بوو، بەڵام چەندان پێکهاتە و شانەی چەکداریشی هەبوو، بۆ پارێزگاریکردنی شارەکانی بەدلیس و وان و دیاربەکر و ئەرزرۆم لە هێرش و پەلاماری عوسمانییەکان[٢٦].

عەشیرەتە بارزانییەکانیش لە باشووری کوردستان بەسەرکردایەتی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی ڕاپەڕین لە ساڵی ١٩٠٩- ١٩١٠ لەبەرمبەر دەوڵەتی عوسمانی و ڕوویان کردە شەڕی پارتیزانی لە چیاکانی دەوروبەری ویلایەتی موسڵ، و ئەو هێزانەی کە ناردران بۆ سارکردنەوە و لەنابردنی ڕاپەڕینەکە نەیانتوانی ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن.

یەکەم زەنگی هۆشیاری نەتەوەیی ڕاستەقینە لەلای کورد لە ساڵی ١٩١٤ز لێیدا کە بە پلەی یەك میری جەزیرە بەدرخان بەگ پێی هەڵسا، کاتێك چووە قاهیرە و یەکەم بزوتنەوەی یەکگرتووی چالاکی دامەزراند بەناوی هێڤی کورد[٢٧].

لە ساڵی ١٩١٩ شێخ مەحمودی حەفید[٢٨] لە سلێمانی ڕاپەڕی لەبەرامبەر دەسەڵاتی ئینگلیزەکان داوای سەربەخۆیی دەکرد بە پشتیوانی ئەو هێزە چەکدارانەی کەوا لەگەڵیدا بوون کە ئاستێکی بەرزیان هەبوو، لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەشکری ئینگلیز، هەرچەندە ئینگلیزەکان خاوەنی لەشکرێکی زلهێز بوون و سەرکەوتووی جەنگی یەکەمی جیهانی بوون، بەڵام پێکهاتە چەکدارەکانی کورد بەهۆی پەیڕەویکردنی سیستەمی شەڕی پارتیزانی توانیان جموجوڵی هێزەکانی ئینگلیز لە ناوچەی سلێمانی پەك بخەن تا دواتر لەئەنجامی شەڕێکی سەخت و دژواردا لە ناوچە شاخاوییەکانی ئەم سنوورە و لەژێر بەردە قارەماندا شێخ مەحمود بریندار دەبێ و بەدیلی دەکەوێتە دەستی ئینگلیزەکان و ئەمانیش دووری دەخەنەوە بۆ بەغدا[٢٩].

شێخ سەعیدی پیران[٣٠] لە کوردستانی باکور بە پاڵپشتی ئەو هێزە چەکدارانەی کەوا لە خەڵك و جەماوەری ناوچەکانی پیران و دیاربەکر لەگەڵیدا بوون لە ساڵی ١٩٢٥ز شۆڕشێکی چەکداری بەرپاکرد لەپێناو ئازادی و ڕزگاری و بەدەستهێنانی مافە نەتەوایەتییەکانی کورد، ئەم کۆمەڵە و پێکهاتە چەکدارییانەی شێخ سەعید لە شۆڕشەکەیدا دروستی کرد بوون هەموویان پێکهاتەی پارتیزانی بوون لەبەرئەوەی لەشکری تورك لەشکرێکی بەهێز بوو لەڕووی چەك و تەقەمەنی و هونەرەکانی تری

سەربازی، هەر بەهۆی پەیڕەیکردنی سیستەمی شەڕی پارتیزانی شێخ سەعیدی پیران توانی چەندان ناوچەی کوردستانی باکور لەدەست هێزەکانی دەوڵەتی تورکیا دەربهێنێت، بەڵام دواتر بەهۆی خیانەتکردنی سەرکردەی پاسەوانەکانی شێخ سەعیدی پیران بەدیلی دەگیرێت لەگەڵ چل و حەوت کەس لە هاوەڵەکانی و لە ٤ی ئەیلولی ١٩٢٥ لەسێدارە دەدرێت[٣١].

لەساڵی ١٩٢٧ز ئیحسان نوری بەگ ڕاپەڕینێکی چەکداری هەڵگیرساند کە ماوەی سێ ساڵ بەردەوام بوو لە باکو و ڕۆژهەڵاتی چیای ئارارات بەڵام لەشکری تورکیا ئەم شۆڕشەی دامرکاندەوە، لەدوای شەڕێکی گەورە و زیانکی زۆر، لە باشووری کوردستانیشدا هەوڵەکان بەردەوام بوون لەلایەن دانیشتوانی ئەم ناوچانە بەمەبەستی گەیشتن بە مافە نەتەوایەتییەکان، بەتایبەتی دوای دەست هەڵگرتنی ئینگلیزەکان لە ئینتیدابی عێراق و بەر لەکاتی خۆی مەلا مستەفا بارزانی لەگەڵ برایەکەی شێخ ئەحمەدی بارزانی لە ساڵی ١٩٢٣ز هاتنە ناو ڕووداوەکان، دوای ئەوەی ئینگلیزەکان ڕاپەڕینەکەی شێخ مەحمودیان لەنابرد[٣٢].

زۆر کات ئەم هێز و لەشکرانەی ڕووبەڕووی شەڕێ پارتیزانی بوونەتەوە بەناچاری پەنایان بردۆتە بەر هێزی دەوڵەتانی تر لەپێناو ڕزگارکردنی هێزەکانیان لە پەلامار و هێرشی پارتیزانانە لەگەڵ ئەوەی ئەم شەڕە تۆقێنەرە و دەبێتە هۆی داڕوخانی ورەی لایەنی بەرامبەر، هەرچەند لەشکر و سوپای پێشکەوتوو و زلهێزی هەبێت، دەوڵەتی تورکیاش بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشی دەرسیم لە ساڵی ١٩٣٧ز دەستبەرداری زەوی زارێکی زۆری خۆی بوو بۆ دەوڵەتی ئێران لەبەرامبەر هاوکاریکردنی بۆ لەناوبردنی بنکەی شۆڕشگێڕانی کورد لە شاخەکانی ئاگری، کە بەهۆیەوە تورکیا توانی گەمارۆی کوردەکان بدات لەو ناوچانە[٣٣].

دوژمنە چاوەڕوانکراوەکانی وڵاتی میسۆپۆتامیا ناونیشانی ئەو بەڵگەنامە ئینگلیزیانەن کە ئەم ڕاستیە مێژووییەی بۆ پاراستووین لەبارەی شەڕەکانی نێوان کورد

و ئینگلیز و نووسیوویانە و دەڵێن: "کوردەکان لەبەرئەوەی شەڕکەری چاك و گورج و گۆڵن، دوژمنێکی خەتەر یان ترسناکن"[٣٤].

مەلا مستەفای بارزانی بەسەرکردایەتیکردنی چەند پێکهاتەیەکی پارتیزانی لە عەشیرەتی بارزانییەکان ساڵی ١٩٤٤ ڕاپەڕینێکی چەکداری بەرپاکرد لە ناوچەکانی باشووری کوردستان، بارزانییەکان شارەزاییەکی زۆریان لە شەڕی پارتیزانیدا هەبووە، هەر بۆیە کاتێك کۆماری کوردستان لە ڕۆژهەلات لە شاری مەهاباد دروستبوو لە ساڵی ١٩٤٥ز بە مەبەستی پشتیوانیکردن لە قازی محەمەد و کۆماری کوردستان بارزانییەکان خۆیان گەیاندە شاری مەهاباد و لەوێ لەشکرێکیان دروست کرد بەناوی سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان و مەلا مستەفای بارزانیش پلەی جەنەراڵی وەرگرت و بوو بە فەرماندەی سوپای کوردستان[٣٥].

بەهێز ترین شەڕ لە کۆماری کوردستان لەنێوان سوپای شۆڕشگێڕی کوردستان کە پێکهاتەکەی تەواو لە بارزانییەکان بوون لەگەڵ سوپا و لەشکری ئێران شەڕی تاراوا بوو لە ساڵی ١٩٤٦ز، لەم شەڕەدا لەشکری بارزانییەکان توانیان سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بهێنن بەسەر سوپای ئێرانی، لەبەرەودواهاتنی مانگی نیستانی هەمان ساڵدا فەوجی یەکەمی سوپای بارزانییەکان توانیان گەورەترین هێرشی سوپای ئێرانی تێك بشکێنن کە بەریارمەتی و پشتیوانی چەندان فڕۆکە و تانك و تۆپخانە و هێزێکی گەورەی پیادە بۆ قارراوا هاتبوو لە بەری سەقز. ئەنجامی ئەم شەڕە بووە کارەساتێك بۆ سوپای ئێرانی چونکە هەشتا سەربازیان لێ کوژرا و سەد و بیست کەسی تریان بەدیلی کەوتە دەستی بارزانییەکان[٣٦].

ئەزمونی دەوڵەمەندی بارزانییەکان لە شەڕی پارتیزانی و ئەو سەرکەوتنە گەورانەی کە لەم شەڕانەدا بەدەستیان هێنا بەرامبەر وڵاتە زلهێزەکانی وەکو تورکیا و ئێران، فاکتەرێکی زۆر بەهێزبوون بۆ بیرکردنەوە لە دروستکردن و سەرهەڵدانی شۆڕشێکی

گەورە لە باشووری کوردستان بە مەبەستی بەدیهێنانی مافە نەتەوایەتییەکانی کورد لەم ناوچەیە لەڕێگای پەیڕەوکردنی سیستەمی شەڕی پارتیزانی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لەشکر و سوپای دەوڵەتی عێراقی(٣٧).

تەوەری دووەم

شەڕی پارتیزانی لە ماوەی شۆڕشی ئەیلول

لە باشوری کوردستان لە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١ شۆڕشێکی گەورە و فراوان سەریهەڵدا بەسەرپەرشتی پارتی دیموکراتی کوردستان و بەڕابەرایەتی مەلا مستەفای بارزانی کە تەواوی ناوچەکانی باشووری کوردستانی گرتەوە، ئەو هێزە بارزانییانەی کە لەدوای ڕوخانی کۆماری کوردستان لە ڕۆژهەلات کۆچیان کرد بۆ ڕووسیا لەدوای ڕوخانی مەلەکیەت لە عێراق و هاتنی ڕژێمێکی کۆماری بۆ سەر تەختی دەسەلات، دوا بەدوای گفتوگۆیەکی دۆستانە لەگەڵ ڕژێمی نوێی عێراق گەڕانەوە نیشتمان و لەبەغدای پایتەختی عێراق دەستیان کرد بە وتووێژ لەگەڵ حکومەتی عەبدولکەریم قاسم، بەلام حکومەتی عێراق جارێکی تر مافە نەتەوایەتییەکانی کورد و داخوازییەکانی مەلا مستەفا بارزانییان سەبارەت بە مافی چارەی خۆنوسین فەرامۆشکرد، هەر بۆیە لە سەرەتای ئازاری ١٩٦١ز مەلا مستەفا بەغدای بەجێهێشت و گەڕایەوە بارزان(٣٨).

لەدوای بۆردومانکردنی ناوچەی بارزان و پشدەر لەلایەن فڕۆکە جەنگییەکانی حکومەتی عێراق سەرکردایەتی شۆڕشی کورد هەستا بە هۆشیارکردنەوەی جەماوەر و ئامادەکردنی بۆ هەر ئەگەرێکی چاوەڕواننەکراو. لەناوچەکانی پشدەر و ڕانیە ئەندامانی پارتی کە لە جەلال تالەبانی و عومەر دەبابە پێکهاتبوون لە ناوچەکە داویان لە سەرۆك هۆز و عەشیرەتەکانی ئەو ناوچەیە کرد کە ئامادەکاری بکەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپا و لەشکری حکومەتی عێرقا. لە بارزان بارزانی هەستا بە کڕینی چەك و دابینکردنی تەقەمەنی پێداویستییەکانی شەڕ بۆ پێشمەرگە و ئامادەکاری تەواوکرا بۆ

هەڵگیرسانی شۆڕش لەبەرامبەر ئەم هەوڵانەی شۆڕشگێڕانی کورد، حکومەتی ناوەندیی عێراقیش هەستا بە چەکدارکردنی هەندێ لە هۆزە کوردییەکانی وەکو زێباری و برادۆست و بریفکان بۆئەوەی لەبەرامبەر بزوتنەوەکەی کورد بەکاریان بهێنێ، پێشمەرگەی کوردستان دروشمی دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانیان بەرزکردەوە[39].

لە سەرەتای دەستپێکی شۆڕش بارزانی نوێنەرەکەی خۆی، کە جەلال تالەبانی بوو، ڕەوانەی پشدەر و ڕانیە کرد و لەڕێگەی ئەم نوێنەرەوە داوای لە جەماوەری ناوچەکە کرد کەوا بە شەڕی پارتیزانی ڕووبەڕووی هێز و لەشکری عێراق ببنەوە، چونکە تاکە ڕێگایە بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتن لەبەرامبەر زلهێزی سوپای عێراقی[40].

بارزانییەکان یەکێ بوون لەو هێزانەی کە توانیوویانە تەنها بە درکاندنی هێزەکانی بەرامبەریان بتۆقێنن، بەهۆی ئەزموون و مێژووی زۆریان لە ڕووبەڕووبوونەوەی لەشکرە پێشکەوتووەکان بەتایبەتی هێزە دراوسێکان، و دانانەوەی بۆسە بۆ یەکەکانی سوپای عوسمانی و سوپای عێراقی، بەم جۆرەش بوونەتە مامۆستا لە شەڕی پارتیزانی و شەڕی چیایی بێ ڕکابەر. لەو شوێنەی بۆسەیان بۆ هێزەکانی بەرامبەر دادەمەزراند توانایان هەبوو کە بە هیچ شێوەیەك نەجوڵێنەوە، تا ئەو کاتەی هێزەکانی بەرامبەریان لێیان نزیك دەکەوتنەوە ودەکەوتنە ناو بۆسەکەیانەوە، زۆر لێهاتوو بە توانابوونە لە جەنگ و تاکتیکی شەڕ و ئابڵوقەدانی زیرەکانە لەسەر بنکەکانی پۆلیس بەبێ ئەوەی گیانیان بخەنە بەر مەترسی تفەنگی هێزەکانی بەرامبەریان.

یەکێ: لەو خاسیەتانەی کە پێشمەرگەکانی کوردستانی باشور هەیانبوو لە ماوەی شۆڕشی ئەیلولدا، ئەم بەرە فراوانەبوو کە لە مەیدانی شەڕ کردبوویانەوە وکە فاکتەرێکی کاریگەربوو بۆ سەرلێشێواندنی هێزەکانی بەرامبەریان لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی کۆنترۆڵی تەواوی بەرەکانی جەنگ بکەن، لەهەمان کاتدا بارزانییەکان لە شەڕکردن دا زۆر

ئارام و لەسەرخۆ بوون، لەکاتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ ڕووداوەکانی جەنگ، و زۆر بەهێمنی چاوەڕێی یەکە سەربازییەکانی حکومەتیان دەکرد تاکو تەواو لێیان نزیک دەکەوتنەوە، ئینجا ئاگربارانیان دەکردن(٤١).

هێزەکانی حکومەتی عێراقی بەهۆی ناشارەزاییان لەو ناوچانەی شەڕیان لێدەکرد و ئەو بەرە فراوانەی جەنگ کە بەڕوویاندا کرابۆوە، و بەهۆی بەکارهێنانی پلان و فرت وفێڵی جۆراوجۆر لەلایەن پێشمەرگەوە، هێزەکانی پەرتەوازە و لاواز و هیلاك بوو، ورەی سەربازەکانی حکومەت داروخابوو، لەهەمان کاتدا ناکۆکی و ناخۆشی زۆر لەنێو ئەفسەرە پایە بەرزەکانی دروست بووبوو. بەرەکانی جەنگ زۆر فراوان بوو، کردەوە سەربازییەکان دەستی پێکرد و پێشمەرگەکان لەسەر شاخ و چیاکاندا ڕووبەڕووی مەترسی هێرش و پەلامارەکانی هێزی عێراق بوونەوە(٤٢).

سەرکردایەتی سیاسی کورد ئاگاداری ئەندام ولایەنگرانی حزب و شۆڕشی کردەوە خەڵك لە ناو شارەکان هۆشیاربکەنەوە و بەرنامە و ئامانجی حیزب و شۆڕشیان بۆ ڕوون بکەنەوە، هەربۆیە شانە نهێنییەکانی پارتی لەناو شارەکانی کوردستان هەستان بە جێبەجێکردنی فەرمانی سەرکردایەتی سیاسی لە کوردستان و دەستیان کرد بە کاروبارە سیاسیە نهێنییەکانیان و ڕێکخستن و ئامادەکردنی جەماوەر بۆ پشتگیریکردنی پێشمەرگە و شۆڕشەکە، و لەهەمان کاتدا چەند پارچە چەك و تەقەمەنییەکی زۆریان کڕی و کۆکردەوە، و بە نهێنی گەیاندییانە دەستی پێشمەرگە لە ناوچەی بارزان، جگە لەوەی هەر یەك لە حکومەتەکانی یەکێتی سۆڤیەت و ئێران ئامادەیی خۆیان پیشاندا بۆ هاوکاریکردنی شۆڕشی کورد لە باشور بە پێدانی مەبلەغێك پارە بۆ کڕینی چەك و تەقەمەنی و گواستنەوەی لەڕێگای ئەوانەی کە بازرگانی کڕین و فرۆشتنی چەکیان دەکرد لە کوردستاندا. باڵیۆزخانەی ڕوسیا لە بەغدا هێڵێکی پەیوەندی کردەوە لەنێوان حکومەتەکەی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد، و بەرپرسی ڕاستەوخۆی ئەم کارە

سکرتێری یەکەم بوو لە باڵیۆزخانەی ڕووسیا کە ناوی ناسکۆف بوو لەلای کوردەکانیش حەمید کاوانی[٤٣] ڕاسپێردرابوو بە وەرگرتنی پارەکە و کڕینی پارچە چەکەکان و ناردنی بۆ بارزان بە هاوکاری لقی پارتی لە هەولێر، بەتایبەتی لەڕێگەی ئەو شانە نهێنیانەی کەوا لە ریزەکانی پۆلیسدا بوون[٤٤].

لە کۆتایی مانگی ١٠ی ١٩٦٢ حکومەتی ئێران لەڕێگای پەیوەندییەکانی لەگەڵ چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی پارتی، پەیوەندی سیاسی و دیپلۆماسی لەگەڵ کورد دروست کرد و ئامادەیی خۆیان نیشاندا بۆ هاوکاریکردنی شۆڕشی کورد لە ڕووی ئابووری و سەربازی، لەهەمان کاتدا ئامادەیی نەخۆشخانەکانی وڵاتەکەیان پیشاندا بۆ وەرگرتنی بریندارانی پێشمەرگە و چارەسەرکردنیان لەسەر ئەرکی حکومەت و بەشێکی زۆری داودەرمانی وەکو هاوکاری و کۆمەك ڕەوانە کرد بۆ بەرەکانی شەڕ لەڕێگەی هەریەك لە عومەر دەبابە و عەلی عەسکەری ، ئەو ناوچانەی بنکە و بارەگای سەرەکی پێشمەرگەی تێدا بوو، دەرمان و کەرەستەکانی پزیشکی زۆری بۆ دابینکرد[٤٥].

پرۆسە جەنگییەکان دەستی پێکرد بە هێرشێکی گەورەی سوپای عێراقی بۆ سەر شاری سلێمانی و توانی بچێتە ناو شارەکە بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی هیچ بەرگرییەکی چەکداری ببێتەوە، لەبەرئەوەی بەشێکی زۆر لەو هۆز و عەشیرەتانەی کە لە ناوچەکە بوون بە نهێنی لەگەڵ حکومەت ڕێکەوتنیان کردبوو لە بەرامبەر دەستکەوتنی هەندێك بەرژەوەندی تایبەت بە خۆیان، ئەندمانی پارتی دیموکراتی کوردستان لەدوای بێ ئومێد بوونیان لە پشتیوانی ئەو هۆز و عەشیرەتانە، ڕوویان کردە شاخ، لەوانەش جەلال تاڵەبانی چووە چەمی ڕێزان و عومەر دەبابەش لە ناوچەی بیتوێندا خۆی حەشاردا. لە هەولێر پێشمەرگە ڕوویانکردە چیای سەفین و لەوێ بنکە و مۆڵگەی خۆیان داکوتا لەدوای ئەوەی هەواڵەکانی شاری سلێمانیان پێگەیشت. لە دهۆکیش بە هەمان شێوە لەدوای ئەوەی ئەندامانی پارتی و جەماوەری ناوچەکە دەستیان دایە چەك بەرەو

شارۆچکەی زاخۆ هەڵکشان و هەڵیانکوتایە سەر بنەکەکانی پۆلیس و بارەگای حکومەت و لەماوەی چەند کاتژمێرێك دەسەلاتی کارگێڕی و سەربازی حکومەتیان لەم شارۆچکەیە لەناوبرد، ودواتر لە ناوچەکەدا کشانەوە و ڕوویانکردە ناو چیا و شاخە دژوارەکانی ئەم سنوورە، بەڵام ئەم تێکشکانەی هێزەکانی پێشمەرگە بەشێوەی کاتی بوو، تاکو دواتر هێزەکان ڕێکخران و چەندان یەکە و پێکهاتەی پارتیزانیان لێ دروستکران و بۆ شەڕ ئامادە کران(٤٦).

لە ساڵەکانی ١٩٦١ و ١٩٦٢ بەرەکانی جەنگ کەوتە دەوروبەری زاخۆ و هەردێرەکان و ناوچەی باتوفە، سوپای عێراق لەم شەڕانەدا شکستی هێنا لەبەرامبەر هێزە پارتیزانەکانی پێشمەرگە و زەرەر و زیانێکی مرۆیی زۆری پێگەیشت. لە بەهاری ١٩٦٣ شەڕێکی گەورە لە سنوورێکی بەرفراوان بەتایبەتی لەسەر چیای مەتین ڕوویدا کە دەکەوێتە سنووری ڕۆژئاوای شارۆچکەی ئامێدی، لەم شەڕەشدا پێشمەرگە سەرکەوتن و شکستێکی تریان بە سوپا و لەشکرە نیزامییەکان و غەیرە نیزامییەکانی حکومەتی عێراقی گەیاند، هەرچەندە لە ١٨ی تشرینی دووەمی ١٩٦٣ کودەتایەکی سەربازی لە بەغدا لە دژی عەبدولکەریم قاسم ڕوویدا بەڵام چالاکیە سەربازییەکان و پرۆسە جەنگییەکانی حکومەتی عێراق بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد لە باشووری کوردستان هەر بەردەوامبوو(٤٧).

بەشێك لە شیوعییەکانی عێراق لەژێر زوڵم و ستەمی دەسەڵاتی ڕەهای حکومەتی مەرکەزی ڕایانکرد و پەیوەندییان بە شۆڕشی کورد کرد و توانیان ڕۆڵی کاریگەر ببینن لە لاوازکردنی دەسەڵاتە سەربازی و کارگێڕی و ئابورییەکانی حکومەتی عێراقی، لە کوردستانیش هەستی نەتەوەیی زۆر بەهێز بوو، لەلایەن چین و توێژەکانی نێو کۆمەڵگەی کوردستانی، بۆیە کوردستانییەکانی غەیرە موسڵمانیش ئینتیمایان بۆ کێشە نەتەوەییەکان هەبوو، بەبێ ئەوەی گوێبدەنە جیاوازییەکانی بیروڕای ئاینی، هەربۆیە

توانیان ئەمانیش ڕۆڵێکی کاریگەر ببینن لە شۆڕشی ئەیلولدا، کە ئەمەش یەکێك بوو لە خاسییەتەکانی شۆڕشەکە. کە چەندان بیروڕای جیاوازی تێدا کۆبووەوە لەوانە ئاشوورییە کوردستانیەکان کە بەشداری بەرچاویان هەبوو لە شەڕە پارتیزانییەکان و چەندان سەرکردە و کەسایەتی دیاریان کردە قوربانی کێشەکە، ئاشوورییەکان لە شۆڕشی ئەیلول لەلایەن هورمز ناوێك سەرکردایەتی دەکران، یەکێك بوو لە گەورە پیاوەکانی ئاشووری، هورمز لە ئەنجامی شەڕێکی گەورە لە ساڵی ١٩٦٤ دەکوژرێ لەو کاتەی بە نارنجۆك هێرش دەکاتە سەر کاروانێکی سوپای سوریا کە بۆ هاوکاریکردنی سوپای عێراق هاتبوونە ناوچەی باشوری شاری دهۆك، هەر لەنێوان شۆڕشگێڕاندا ئافرەتێکی ئاشووری مەسیحی هەبوو بەناوی مارگێت جۆرج[٤٨] کە تەمەنی لە ٢٥ ساڵ زیاتر نەبوو، ئەم ئافرەتە لە دەرەوە بە جان دارکی کوردستان ناسرابوو، زۆرجار وا باسیان کردوە کە پێشمەرگەکان نەدەچوونە شەڕ ئەگەر وێنەی ئەم ئافرەتە شۆڕشگێڕەیان لەسەر سنگی خۆیان هەڵنەواسیبووبە[٤٩].

شەڕی پارتیزانی لە باری کۆمەڵایەتی جیاناکرێتەوە، چونکە ئەم شەڕە لەپێناوی ئامانجێکە کە چینێك یان چەند چینێك بەشداری تێدا دەکەن، لەم بارەیەوە مەسعود بارزانی لە کتێبەکەیدا دەڵێت "ئەو چینەی بەڕاستی خۆی بۆ شۆڕش بەختکرد چینی جوتیاران بوو، چونکە هەر لە سەرەتای هەڵگیرسانی ئاگری شۆڕشەوە هەتا کوژانەوەی لە ناوچەرگەی جوتیاراندا بوو، ئەو جوتیارانەی ماڵی خۆیانیان بۆ کردینەوە، نانیان پێدا ین و بەڵکو زیاتریش لەوە کردیانین بە هاوبەشی هەموو بەرهەمێکی خۆیان کە بە ڕەنجی شان و ئارەقی ناوچەوانی خۆیان پەیدایان کردبوو، تەنانەت لەم خانووە ساکارانەی خۆیاندا ئێمەیان حەواندەوە، یارمەتی شۆڕشیان ئەدا و لە تەنگانەترین کاتدا هەتا چەکیشیان پێداوین، ئەوەش لەبیرناچێتەوە کە چەندان ڕۆڵەی خۆیان کردە قوربانی شۆڕش و ئازادی میللەتی کورد"[٥٠].

سوپای پێشمەرگە لە ناوەڕۆکیدا سوپایەك بوو لە جوتیاران پێکهاتبوو، ئەو گوندانەی کە سوتێنران و خاپوورکران، موڵکی ئەوان بوون، و ئەو شوێنانەی کە جێگا و کۆڕی شەڕ و شۆڕبوون هەر جێگا و موڵکی ئەوان بوون، بۆیە ئەو شۆڕشەی کورد لە بناغەدا شۆڕشی جوتیاران بوو.

شەڕی پارتیزانی لە شۆڕشی ئەیلولدا پشتگیرییەکی فراوانی لێ کراوە لەلایەن جەماوەری کوردستانەوە کە ئەمەش فاکتەرێکی کاریگەربووە بۆ بەردەوامی شۆڕش. پشتیوانی جەماوەر بۆ شۆڕش بە چەندەها شێواز ئەنجامدراوە، ئینجا چ لە رێگەی کۆکردنەوەی یارمەتی مادی چ بەدابینکردنی هوکاری مەعنەوی، سەرکردایەتی شۆڕش هەر لە سەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولدا، هەرکاتێك رووبەڕووی کێشە و گرفتی مادی دەبۆوە ڕاستەوخۆ رووی دەکردە لایەنگرانی شۆڕش و جەماوەرەکەی داوای کۆمەك و هاوکاری لێ دەکردن، بەتایبەتی لەناو ئەوانەی کەوا خەڵکی بەدەسەڵات بوون لەلایەنی داراییەوە، لەڕێگەی رێکخستنە نهێنییەکانی ناو شارەکاندا هاوکارییە داراییەکان بۆ شۆڕش کۆدەکرانەوە[٥١].

کەسایەتی بەهێز و دادپەروەرانەی بارزانی هۆیەکی بەهێزبوو بۆ دروستبوونی هاوسۆزی جەماوەری کوردستان و چەند پێکهاتەی تری عێراقی بۆ شۆڕشی ئەیلول، پشتیوانی جوتیاران بووە و لەگەڵ سەرکردە سیاسیەکاندا بە هاوکاری کاری دەکرد و دەسەڵاتی بە یەکسانی بەسەریاند دابەش دەکرد، و ئەو بڕیارەی پەسەند دەکرد کە بە بڕوای زۆرینە پەسەند بوو، و هەرکاتێك پلانێکی سەربازی دابڕشتایە دەیخستە دەنگدانەوە لەنێو سەرکردە سەربازییەکان بۆ پەسەندکردنی و بە ڕەزامەندی هەموو لایەك کارەکە ئەنجام دەدرا[٥٢]. بۆیە جەماوەری کوردستان وەکو سەرکردەی هەموو چین و توێژەکان سەیریان دەکرد و پشتگری و پشتیوانیان لێ دەکرد[٥٣].

ئەم فاکتەرانە هاندەربوون بۆ هەڵبژاردن شەڕێ پارتیزانی لەنێو شاخەکانی کوردستان لەبەرامبەر سوپای عێراقی جگە لەوەی کورد لە شەڕی پارتیزانیدا زۆر لێهاتوو بووە

لەبەرئەوەی کردەکان هیچ چارەیەکی تریان نەبووە لە شەڕکردن لەگەڵ هێزە نیزامییەکانی حکومەت بەهۆی هاوسەنگ نەبوونی هێز لەنێوانیاندا، کەربۆیە هەمیشە هەوڵیداوە ئەو هێزە نیزامیانە پەلکێش بکات بۆ ناوچە دابڕاوەکان لە بەرزایی چیاکاندا، چونکە لەم شوێنانە مەترسی لە هیچ هێزێك نەبوو، تەنها فڕۆکە جەنگییەکان نەبێت ئەگەر ئاشکرایان بکات، چونکە تەنها دارێك یاخود بەردێك بەس بوو بۆئەوەی خۆیان لەژێریدا حەشار بدەن. بەشێك لە سەرچاوەکان بەشێوەیەك ئاماژە بە پێشمەرگەی کورد دەدەن کە چیا ناسە و چالاکی زۆری تێدایە و ئارەزووی زۆری هەیە لە هێرشکردن بەتایبەتی لە شەو و لەنێو دۆڵەکاندا و ترس و دڵەڕاوکێ و تۆقاندن دروست دەکات، و بڵاودەکاتەوە، و هێزە نیزامییەکانی حکومەت تەنها بە ڕۆژ خۆیان بەدیاردەخست و هەندێك جاریش بە یارمەتی زرێپۆشەکانیان ڕێگا و بانەکانیان کۆنترۆڵ دەکرد، تاوەکو ڕێگا لە جموجوڵی پێشمەرگەکانی چیایی بگرێت لەسەر ڕێگا و لەنێو دۆڵەکاندا[٥٤].

شەڕەکانی زۆزك و بیرە و ڕواندوز کە کۆتاییان هات بە گەورەترین و تاڵترین ئەنجام بۆ سوپای عێراقی، لەکاتێکدا بوو کە لەشکری پێشمەرگەی کوردستان بە خەنجەر و تفەنگ بەرامبەر بە چەك و ئامێرە جەنگییە پێشکەوتووەکانی شەڕیان دەکرد، لەگەڵ ئەوەی ڕووبەڕووی بۆردومانی بەردەوامی تۆپهاوێژە بەهێزەکان و فڕۆکە جەنگییەکان بوونەوە، پێشمەرگەی کوردستان لەم شەڕە سەرکەوتنێکی گەورەیان تۆمارکرد و تەواوی دوو تیپی سەربازی نیزامی حکومەتیان تێکشکاند و ئەوانەی مانەوە ڕایان کرد و پێشمەرگە بەدوایان کەوتن لە ئەنجامی تۆمارکردنی ئەم داستانەدا سەدان تەرمی سەربازی کوژراوی حکومەت و چەندن دیلیان کەوتە دەست، لەگەڵ بەشێکی زۆر لە چەك و تەقەمەنی[٥٥].

لە ناوچەی ڕانیەش بەهەمان شێوە پێشمەرگەکانی کوردستان کەوتنە دانانەوەی بۆسە لە کاروانێکی سەربازی حکومەت کە بەرەو قەڵادزێ دەچوو، کاتێك کاروانی

سەربازەکان گەیشتنە گوندی سەیداوا کەوتنە نێو بۆسەی پێشمەرگە لەناو گوندەکە لە ئەنجامدا تەواوی سەربازانی کاروانە سەربازیەکە لەناوچوون و کوژران و چوارادە ئۆتۆمبێلی جۆری زیلی سەربازی کە لەنێو کاروانەکە بوون تێك و پێك شکان و بەجێمان لە ناوچەکە و ئامرفەوجەکەشیان کە ناوی عەقید کافی بوو بەدیل گیرا. لە ڕۆژی ١٩٦٢/٩/٢٥ سەرکردایەتی شۆڕشی کورد پلانێکی تۆکمەی دانا بۆ هێرشکردنە سەر خواکورك بە پشتیوانی هێزێکی چەکدار کە لە سێ سەد کەس پێکهاتبوون لە بارزانییەکان و نێروەییەکان و دۆسکییەکان و گەردییەکانی تورکیا و هێزەکانی بتوێن و پشدەر بەسەرکردایەتی حاجی بێرۆخی، لەهەمان کاتدا هێزێکی تر پێکهات لە بارزانی زێبارییەکان کە نزیکەی سەد و پەنجا پێشمەرگە دەبوون، بە فەرماندەیی حەمید ئاغای دۆڵەمەری بەمەبەستی ئەوەی لەلایەکی جیاوازی تری هێزەکانی پێشوو هێرش بکات لەلایی گوندی خنێرەوە هێرش بکەنە سەر دۆڵی خواکورك، لەشەودا شەڕ دروست بوو لەنێوان پێشمەرگە و هێزەکانی حکومەت، لە ماوەی چەند کاتژمێرێك هێزەکانی حکومەت ڕایانکردە سنووری تورکیا و پێشمەرگەکانی کوردستان بەدوایانکەوتن و لەسەر سنووری نێوان تورکیا و عێراق شەڕێکی تری خوێناوی لەنێوان هەردوو لادا دروست بوو تاوەکو هێزەکانی حکومەتی عێراقی هاوکاری ئەو سەربازە تورکانەی کە بۆ هاوکارییان هاتبوونە سەر سنوور خۆیان ڕزگارکرد و پەڕینەو ناو خاکی تورکیا[٥٦].

لە ١٧ی تەموزی ١٩٦٣ حکومەتی عێراقی بە پشتیوانی دەیان تانك و زرێپۆش هێزێکی زۆری پیادەی نیزامی و غەیرە نیزامی بە دوو ڕەتل هێرشیان کردە سەر هێزەکانی پێشمەرگە لە ناوچەی مەیدان مۆریك، هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان لوقمان بارزانی سەرپەرشتی دەکردن، لەشکری عێراقی تۆپخانەیەکی قورس و هاوەن و فڕۆکەی بەکارهێنا لە شەڕەکەدا، هێزەکانی پێشمەرگە بەهۆی هاوسەنگ نەبوونی هێز لەگەڵ سوپا و لەشکری عێراقی پاشەکشەیان کرد بۆ بناری چیا و لەوێدا سەنگەریان

داکوتا، کاتێك سەربازانی عێراقی لە مۆلگەی پێشمەرگە نزیك بوونەوە لە بناری چیادا ڕووبەڕووی هێرشی بەهێزی پێشمەرگە بوونەوە، لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی ڕژێم کوژران و بریندار کران و ژمارەیەکی زۆریشیان بەدیل گیران و کەوتنە دەستی پێشمەرگە سەرەڕای چەندان کەل و پەل و تفاقی سەربازی کە هێزە عێراقییەکان لەپاش ڕاکردنیان لە مەیدانی شەڕەکە لە دوای خۆیان بەجێیان هێشت[٥٧].

لە مانگی ئابی ١٩٦٢ پێشمەرگە سەرکەوتنێکی گەورەی تریان بەدەستهێنا بەسەر سوپای عێراقی لە چامە شێروان، ئەم سەرکەوتنە زۆر گرنگ بوو بەلای پێشمەرگەوە چونکە لەشکری عێراق بەهۆی ئەم شکستەوە بێ ئومێدبوو لەسەر بەردەوامیدان بەشەڕ لەم ناوچەیە و دەستی هەڵگرت، لە ئابلۆقەدنی ناوچەی بارزان، بەم شێوەیەش ناوچەکە بووە شوێنی حەسانەوەی پێشمەرگە، چونکە لە مەترسی پەلاماری لەشکری عێراق دوورکەوتەوە[٥٨].

لە ١٠ی تشرینی ١٩٦٣ بارزانی گەیشتە گوندی گەزنە داوای لە پێشمەرگەکانی ناوچەی باڵەکایەتی کرد کار بکەن لەپێناو ئازادکردنی ئەم ناوچانەی لە ئەنجامی هێرشی بەربڵاوی حکومەت لە دەست پێشمەرگە وەرگیرابوون لە چیای هەندرێن و زۆزك، هەر بۆیە ڕاستەوخۆ هێزێك پێکهێنرا بەسەرکردایەتی عەقید نەبەوی دایانکوتایە سەر ناوچەکە و توانیان هەندرێن و زۆزك و حەسەن بەگ بگەڕێننەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان[٥٩].

پێشمەرگە لە کاتی ئەنجامدانی شەڕی پارتیزانی بەهیچ شێوەیەك کاروکردەوەی ڕفاندنی پیاوەکانی حکومەتی عێراقیان ئەنجام نەداوە وەکو ڕەوشتێکی بەرزی پێشمەرگە بۆ بەرز ڕاگرتنی ناوی پێشمەرگە، هەربۆیە کاتیك لە ساڵی ١٩٦٣ هەندێك پێشمەرگە هەڵدەستن بە ڕفاندنی بەڕێوەبەری پۆلیسی هەولێر و دەیگوازنەوە بۆ شوێنێکی شاراوە لە کەسنەزان کە بنکەیەکی کاتی پێشمەرگەی لێ بوو، دەستبەجێ لەلایەن چەند لێپرسراوێکی حیزب ئازد کرا

و ئەوانەی ئەو کارەشیان ئەنجامدابوو ڕاستەوخۆ سزا دران، چونکە پێشمەرگە بەدوای مافە نەتەوایەتییەکانی خۆیەوە بووە و سەکردایەتییەکەی ڕەوشت بەرز بووە و ڕێگای نەداوە کاری ناشیرین ئەنجام بدەن، و پێشمەرگە دوژمنداری خەڵکی عێراقی نەدەکرد، چونکە یەکێك لە دروشمەکانی شۆڕشەکەی برایەتی و پێکەوە ژیان بووە لەنێوان کورد و عەرەب و پێکهاتەکانی تری عێراق، بەڵکو کورد لەپێناو بەدیهێنانی مافە نەتەوایەتییەکانی لە دژی حکومەتی عێراقی شەڕی دەکرد، لەبەرئەوەی حکومەتی عێراقی دانی بە مافەکانی کود نە ئەنا لە کوردستاندا(٦٠).

لەو کاتەی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم ساڵی ١٩٦٣ لەناوچوو لەسەر دەستی بەعسیەکانی عێراق، شۆڕشی کورد لەوپەڕی بەهێزیدا بوو و چەندان شکستی گەورەیان بەسەر لەشکری عێراقیدا هێنا و شۆڕشەکەش تەواوی ناوچەکانی کوردستانی گرتبۆوە، بۆیە لەو کاتەی کەوا حکومەتی عەدولڕەحمان عارف دەمەزرا هەستیکرد لەو هەلومەرجە ناسکەیاندا توانای ڕووبەڕووبوونەوەیان نیە لەگەڵ کوردەکان بۆیە بەباشیانزانی داوای دانوستاندن بکەن لەگەڵ کوردەکان بۆ ڕاگرتنی شەڕ و گوێ لە داواکارییەکانی کورد بگرن، هەر بۆیەش لە ئازاری ١٩٦٣ وتوێژ لەنێوان کود و حکومەتی عێراق دەستی پێکرد، بەڵام لەو کاتەی هەردوو لا خەریکی دانوستاندن بوون هێزێکی پێشمەرگەی کودستان لە ناوچەی سپیلك هێرشیان کردە سەر کاروانێکی سەربازی حکومەت و بیست لە سەربازەکانیان کوشتن لە سەرەتاکانی حوزەیرانی ١٩٦٣، بەم شێوەیەش پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو لاتێکچوون و لەهەمان ڕۆژدا حکومەتی عێراق ی هێرشێکی بەربڵاوی کردە سەر کوردستان، لەم هێرشەدا حکومەت تەواوی کەرەستە و ئامێرە پێشکەوتووەکانی جەنگیان بەکارهێنا بۆ لەناوبردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد. لە نیسانی ١٩٦٥ لەسەر ڕێگای کورکوك- سلێمانی هەندێك پێشمەرگە ڕووبەڕووی پێکدادانێك بوونەوە

ـەگـەڵ کـاروانێکی سـەربازی حکومـەت کـە بـووە هـۆی کوشـتنی چـەند سـەباز و ئەفسەرێکی حکومەت. ئەم شەڕە بووە هۆی شکاندنی ئاگر بەست لـەنێوان شۆڕشـی کورد و حکومەتی عێراقی بۆیە حکومەت شەڕ دەستپێدەکاتەوە لەگەڵ کورد ـ بەڵام وا ڕێکەوت کە لە گەرمەی شەڕدا بوو عەبدولسەلام عارف کوژرا لە نیسانی ١٩٦٦[٦١].

شەوی ٢/١ ی حوزەیرانی ١٩٦٦ حکومەتی عێراقی توندترین و بەربڵاوترین هێرشـی وشکانی و ئاسمانی بەناوی (توكلنا علـى الله) هێنایـە سـەر ناوچـەی باڵـەك کـە ئامـانجی هاتنە پێشەوە بوو لە حەوشەی ڕەواندوز و هەرەو هەندرێن و زۆزك و داگیرکردنـی حـاجی ئۆمـەران، و مـاوەی مـانگێکی بـۆ هێرشـەکە دانـا، لـەدوای شـەڕێکی تونـد و سـەخت هێزەکانی حکومەت توانیان چەند هەنگاوێك لە ڕۆژئاوای چیای هەندرێن بێنە پێشەوە و بەشێکی گرنگیان لە چیای زۆزك دەست بەسەرداگرت[٦٢].

لە ١١ی ئایاری ١٩٦٦ هـەموو هێزەکـانی پێشمەرگە لـەم ناوچـەیە کۆبوونـەوە کـە هێزێکیان لەلایەن سەید کەمال نوعمانـەو سەرپەرشـتی دەکـرا، سـەر بـەحیزبی شـیوعی عێراقی بوون و هێزەکەی تر سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان بوو لەژێر سەرپەرشتی عیزەتی سلێمان بەگ کە ئامر بەتالیۆنی چواری هێـزی پێشمەرگە کوردسـتان بـوو، لـە ١٢ی ئایاری ١٩٦٦ هێزێکـی بیـست و پێـنج کەسـی لـە پـارتی و هێزێکـی بیـست و پێـنج کەسـی لـە شـیوعی و دە کـەس لـە هێـزی سـاڵح ئـاکۆکی، هـەموو ئـەم هێزانـە لـەژێر فەرماندەیی ئیدریسی کوڕی مـەلا مـستەفا بـارزانی پێکهێنـران بەمەبەسـتی هێرشـکردنە سەر سوپای عێراقی و مۆڵگەکانیان لە چـیای زۆزك و هەنـدرێن، لـە ئەنجامـدا هێزەکـانی پێشمەرگە توانیان کەپکەمۆ دەست بەسـەردا بگـرن و ژمارەیـەکی زۆر تـۆپ و هـاوەن و ڕەشاش و چەکی سوك و بێتەل و وڵاغ و زۆر شتی تر کەوتە دەستی پێشمەرگە[٦٣].

دەرەنجام لەشکر و سوپای عێراقی ڕایکرد و لەناوچەکە کشایەوە بەرەو ڕەوانـدوز و زیانی گیانی گـەورەی پێکـەوت، بـەم شـێوەیە حکومـەتی عێراقـی بـاوەڕی تـەواوی هێنـا

بەوەی کە ناتوانێ کۆتایی بە بزوتنەوەی عەسکەری بهێنێ لە کوردستاندا بۆیە دەستی کرد بە ناردنی ناوبژیوانان و دەواکردنی دانوستان لەگەڵ سەرکردایەتی شۆڕش و لەنێوان ئەو کەسایەتییانەی کە بە ناوبژیوانییەکە هەڵسان محەمەد حەسەن دزەیی و زەید ئەحمەد عوسمان هاتنە کوردستان، سەرکردایەتی شۆڕش ڕەزامەندی نیشاندا بۆ گفتوگۆکردن و شاندێکی کوردی بەسەرکردایەتی حەبیب محەمەد کەریم بۆ وتوێژکردن لەگەڵ حکومەتی عێراقی لە حوزەیرانی ١٩٦٦ ڕەوانەی بەغدا کران، لەدوای چەند کۆبوونەوەیەك لەنێوان هەردوولادا بڕیاری ئاگربەست و ڕاگرتنی شەڕ درا(٦٤).

تەوەری سێیەم

گۆڕانکارییەکانی عێراق و هاتنەدی مافەکانی نەتەوەی کورد

دوا بەدوای ڕاگرتنی شەڕ لەنێوان کورد و حکومەتی عێراقی ڕاگەیاندنی ئاگربەست لەنێوان هەردوو لا، حکومەتی عێراقی بۆ بەدیارخستنی نیازپاکی خۆی لەگەڵ خواست و داواکارییەکانی کورد بڕیاریدا بە تەرخانکردنی دوو کورسی لەنێو حکومەت بۆ دوو نوێنەری کورد کە یەکێکیان موحسین دزەیی و ئەویتریان ئیحسان شێرزاد بوو، بەم شێوەیەش حکومەتی عێراقی توانی لە پەیوەندییەکانی لەگەڵ کورد و شۆڕشەکەی هەنگاوی بەهێز و زۆر باش بێتە پێشەوە، لە هەمان کاتدا وا پێدەچێ حکومەت بەهۆی تەرخانکردنی ئەم دوو پۆستە وزارییە بۆ کوردەکان هەوڵیدابێت کوردەکان دوور بخاتەوە لە هەندێك داواکاری کە پەیوەندی هەبێت بە مافە نەتەوایەتییەکانی جگە لەوەی پلانێك بووە بۆ ڕێکخستنەوەی ریزەکانی سوپا و لەشکرەکەی لەپاش ئەوەی لە زۆربەی شەڕەکانی بەرامبەر بە کورد، ڕووبەڕووی شکست بۆوە، لە هەمان کاتدا ئاگر بەستەکە لەنێوان هەردوو لای شەڕکەر کەشێکی ئارامی لە عێراقدا دروست کرد بە تایبەتی لە ناوچە کوردییەکاندا کە ماوەیەکی دوورودرێژبوو بووبووە مەیدانی شەڕەکانی کورد و حکومەت، لەگەڵ ئەوەی ناوچە کوردنشینەکان و سەرکردایەتی شۆڕشی کورد

هەریەکەیان بە جیاواز سوودیان لە ئاگربەستەکە کرد لەبەرامبەریشدا حکومـەتی عێراقـی ئەم هەلەی قۆستەوە بۆ دروستکردنی چەند یەکەیەکی چەکداری غـەیرە نیزامـی لـە نێـو کوردە بە کرێگیراوەکان و پێکهاتەیەکی بـەهێزی چـەکداری دروسـتکرد کـە تـەواویان لـە کورد پێکهاتبوون، بۆ ئەم مەبەستەش سوودی لە هەندێك هۆز و عەشیرەتە کوردییـەکان وەرگرت لەوانەی هەست و سۆزی نەتەوەییان لاواز بووە و ناکۆکی ناخۆشیان هەبووە لە پێشتر لەگەڵ بنەماڵەی بارزانییەکان، لەدوای ڕێکەوتنی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ سـەرۆك وەزیرانی ئەوکاتەی عێراق کە تاهیر یەحیا بوو بە سـەردانێکی فـەرمی گەیشتە ناوچـەی خەلەکان، بە مەبەستی چاوپێکەوتنی بـارزانی لـە دواتـر عەبدوڕەحمان عـارفی سـەرۆك کۆمـار هـەر بـە مەبەسـتی تونـدوتۆڵکردنی پەیوەندییـەکانی نێـوان هـەردوو لا گەیـشتە ڕەواندوز و بە دیداری مەلا موستەفا گەیشت، دوای ئـەم گفتوگۆیانـەی نێـوان هـەردوو لا سەرکردایەتی شۆڕش بڕیاریدا بەشداری بکات لە حکومەتەکەی عێراق[٦٥].

بارودۆخی ئاسایش لە عێراق ئارام و سـەقامگیر بـوو بـەهۆی ئـەو ڕێکەوتنەکـەی کـە لەنێوان کورد و حکومەتی عێراقی ئیمزا کرا تاکو لە ٣٠ی تەموزی ١٩٦٨ حیزبـی بـەعس بە سەرکردایەتی ئەحمەد حەسەن بەکر کودەتایـەکی بـەرپاکرد لـەدژی عەبـدولڕەحمان عارف و دەسەڵاتیان لە عێراقدا گرتـە دەسـت و کۆتاییـان بـە دەسـەڵاتە هاوبەشـەکەیان هێنا، بەعسیەکان کاتێك هاتنە سەر دەسەڵات سیاسەتێکی نەرمیان لەگەڵ کورد پەیڕەو کرد دوای ئەوەی سەرکردایەتی شۆڕشی کوردی پیرۆزبایی وەرگرتنـی دەسـەڵاتی بۆیـان ڕەوانە کـرد. کوردەکـان گـەش بـین بـوون بـەو گۆڕانکارییـەی ڕوویـدابوو بـەو ئومێـدەی بەعـسییەکان چـاوێك بـە دواکارییـە نەتەوەییـەکانی کـورد بخـشێنن و چـیتر ئینکـاری ناسنامەی کوردی نەکرێت لە عێراقدا بـەڵام بەعـسییەکانیش وەکـو دەسـەڵاتەکانی تـری عێراقی پێشووتریان هەوڵیاندا سوود لە هەڵوێستی کـورد وەربگـرن لـە بەرامبـەر خۆیـان ولە کێشەی کورد دوور بکەونەو تا ئەو کاتەی دەسەڵاتەکەیان بـەهێز دەکـەن و توانـای

ڕووبەڕووبوونـــەوەیان دەبـــێ لەبەرامبـــەر کوردەکـــان چـــونکە دەیـــانزانی ئـــەوان لـــەو هەلومەرجەدا توانای ئەوەیان نیە بەسەر کوردەکاندا زاڵ ببن، هـەر بۆیـە لەسـەر بڕیـاری ئەحمـەد حەسـەن بـەکری سـەرۆك کۆمـاری عێـراق سـێ کورسـی وەزاری بـۆ کوردەکـان تەرخان کرا، دووانیان هەمان ئەو وەزیرانەی کورد بوون کە لە حکومەتە هەڵوەشاوەکەی عەبـدولڕەحمان عـارف بەشـداربوون کـە موحـسین دزەیـی و ئیحـسان شـێرزاد بـوون، لەکاتێکدا کە تەواوی وەزیرەکانی پێشووتر دەرکران لە پۆستەکانیاندا بـەهۆی جیـاوازی بیروبۆچـوونەکانیان لەگـەڵ بەرنامـە و کـاری بەعـسییەکان سـەرکردایەتی سـاڵح یوسـفی پێشنیارکرد بۆ وە رگرتنی کورسی سێیەمی ئـەم وەزارەتـەی بـۆ کـورد تـەرخان کرابـوو دوای ئـەوەی ڕەزامەنـدی دەربـڕی لەسـەرئەوەی پاڵێوراوەکـانی پێـشووی کـورد لـەنێو وەزارەتەکەی حکومەت بمێننەوە، حکومەتی عێراقی درزێکی لـە پەیوەندییـەکانی خـۆی کردەوە لەگەڵ کورد دوای ئەوەی داواکاری سەرکردایەتی شۆڕشی کـوردی فەرامۆشـکرد سـەبارەت بـە پۆسـت و کورسـی سـێیەمی وەزارەتـی بـۆ سـاڵح یوسـفی، بـەڵکو هەسـتا بەدانانی تەها محێدین مەعروف بەناوی کورد لە وەزارەتەکە لە شوێنی ساڵح یوسفی کـە پاڵێوراوی کوردەکان خۆیان بوو. دوای بەرزبوونەوەی دەنگی ناڕەزایـەتی سـەرکردایەتی شۆڕشـی کـورد بەرامبـەر بـەو کـارە، ئەحمـەد حەسـەن بـەکر بیـانووی بـۆ مەسـەلەکە هێنایەوە کە گوایە تەها مـەعروفیش هـەر کـوردە و بـە نیـازخراپی ئـەم کـارەی ئـەنجام نەداوە لە دژی کورد، لـەدوای هەرەسـهێنانی وتوێـژە دیبلۆماسـییەکان لـەنێوان کـورد و حکومەت سەبارەت بە پۆستە وزارییەکان، سەرکردایەتی شـۆڕش پاڵێوراوەکـانی خـۆی لـە حکومەتەکـەی ئەحمـەد حەسـەن بـەکر کێـشایەوە و دوای ئـەوەی داخوازییـەکانیان فەرامۆشکرا[٦٦].

حکومەتی عێراقی ئەم هەڵوێـستەی کـوردی بـە هـەلێك زانـی بـۆ دەسـتپێکردنەوەی شەڕ بەمەبەستی لەناوبردنی بزوتنەوە ڕزگاریخوزییەکەی کوردستان، هەربۆیە ڕاستەوخۆ

-دەستی کرد بە پێکهێنانی یەکە سەربازییە غەیرە نیزامییەکان لە کوردە بەکرێگیراوەکان بۆ ئەوەی هەر لە دژی کوردەکان بەکاریان بهێنێ، هەر بۆیەش پارەو چەکێکی زۆری بۆیان تەرخانکرد، لەبەرئەوەی شارەزایی هەبوو لەوەی کە بەشێك لە هۆز و عەشیرەتە کوردییەکان هەمیشە لە پێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیان ئامادەبوون شەڕی کورد بکەن. وا پێدەچێ حکومەتی عێراقی بەهۆی سەختی ناوچە شاخاوییەکان و بێ ئەزموونیان لە شێوازی شەڕی پارتیزانی هەمیشە پشتیان بە کوردە خۆ فرۆشەکان بەستووە چونکە دڵنیابوون لەوەی کە کوردەکان شارەزایی زیاتریان هەیە لە شەڕی پارتیزانی و ناوچە شا خاوییەکان، ئەمە فاکتەری بەهێز بوون بۆئەوەی حکومەتە عێراقیەکان پشت بە کوردە بەکرێگیراوەکان ببەستن لەپێناو لەناوبردنی شۆڕشی کورد. لەهاوینی ١٩٦٩ شەڕ زۆر بەتوندە هەڵگیرسا لەنێوان هەردوو لاو ناوچەیەکی بەرفراوانی کوردستانی گرتەوە، حکومەتی عێراقی تەواوی هێز و تواناکانی خۆی بەکارهێنا بۆ لەناوبردن و سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد بەڵام نەیتوانی هیچ ئەنجامێکی سیاسی و عەسکەری بەدەست بهێنێ، هەرچەندە بەشێوەیەکی کاتی توانی لە هەندێك ناوچەی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە پێشڕەوی بکات، بەڵام دواتر هێزەکانی لەژێر دەستی پێشمەرگەدا تێکشکێنران و هێزەکانیان پاشەکشەیان کرد و دەستیان هەڵگرت لەسەر ئەم ناوچانەی دەستیان بەسەردا گرتبوو(٦٧).

لە هەمان ساڵدا چەکێکی زۆر گەیشتە دەستی پێشمەرگە، لەم چەکانەش برنۆ و کاتیۆشا و ڕەشاش و تۆپی ١٠٦ و ١٠٧ ملم، لەماوەی تەنها حەفتا ڕۆژدا سی و حەفت هەزار پارچە چەك دابەشکرایە سەر پێشمەرگە لە بەرەکانی شەڕدا، کە کاریگەرییەکی پۆزەتیڤی هەبوو بەسەر وورەی پێشمەرگە لە شەڕەکەدا، هەر بۆیە لەشکر و هێزەکانی پێشمەرگە لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٦٩ هێرشێکی گەورەیان کردە سەر هێزەکانی سوپای عێراقی لە ناوچەکانی سورداش و قەڵادزێ و لەئەنجامدا توانیان دەست بگرن

بەسەر سەربازگە و مۆڵگەی سوپا هێزە غەیرە نیزامییەکان کە لە ناوچەکەدا بوون، لە هەمان کاتدا گورزێکی کوشندە و زیانێکی زۆریان گەیاندە لایەنی بەرامبەر و ڕێژەیەکی زۆریشیان لە چەك و تەقەمەنی کەوتە دەست(٦٨).

چەند شەڕێکی زۆر بەهێز و سەخت ڕوویاندا لە ناوچەکانی مەرگە و سەرگەڵو و لە دەروازەی دۆڵی شەهیدان لە ناوچەی پشدەر و پێنجوێن و هەڵەبجە و چەندان شوێنی تر لە کوردستاندا، ئەو ناوچانەی کەوا سوپای عێراقی دەستی بەسەردا گرت لە ناوچەی سەنگەسەر و دەروازەی دۆڵی شەهیدان کە دەکەوێتە نێوان ڕانیە و قەڵادزێ مەترسی خستە سەر بنکەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لە ناوچەکە، بە مەبەستی ڕەواندنەوەی ئەم مەترسییانە و دوورخستنەوەیان لە بنکەکانی سەرکردایەتی پێشمەرگەی کوردستان بە فەرمانی بارزانی گەورەترین شەڕی پارتیزانیان بەرامبەر بە لەشکر و سوپای عێراقی ئەنجامدا، بە هاوکاری پەنجا پێشمەرگەی هەڵبژاردە، ئەم هێزەی پێشمەرگە کرایە دوو بەش، بەشێکیان لە دەوروبەری نزیکی ڕەبیەکانی پێشەوەی سەربازانی عێراقی، خۆیان حەشاردا و بۆسەیان دانایەوە، بەشێکی تری هێزەکانی پێشمەرگە سوڕانەوە بە دەوروبەری ڕەبیەکانی دواوەی سوپای عێراقی و لەپشتەوە پەلاماری ئەم ڕەبیانەیاندا بەشەو. لە ئەنجامی دروستبوونی شەڕو دەست بەسەرداگرتنی ڕەبیەکانی دواوەی لەشکری عێراقی هێزەکانی پێشەوەی سەربازانی حکومەت دەستیان کرد بە ڕاکردن لە ڕەبیەکانی پێشەوەدا و لە ناکاو کەوتنە نێو ئەو بۆسەی پێشمەرگە کە لە دەوروبەری نزیکی ڕەبیەکانیان بوون و چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە لە ڕەبیەکان بێنە دەرەوە، ئەم بارودۆخە سەری لە سوپای عێراقی شێواند و بارودۆخەکەیانی ئاڵۆز کرد لە ئەنجامدا تەواوی هێزەکانیان کەوتە بەردەستی هێزی پێشمەرگە، بەتەواوی چەك و تفاقی سەربازییانەوە، بەم جۆرەش سوپای عێراقی گەورەترین شکستی خوارد لە ناوچەکانی مەرگە و سەرگەڵو چەندان شوێنی تریش،

هەربۆیە حکومەتی عێراقی ناچار بوو بەدوای ڕێگە چارەیەکدا بگەڕێت، کە جیاوازبێ لە ڕێگەی عەسکەری بۆ چارەسەکردنی کێشەکانی لەگەڵ کورد[٦٩].

دەسەڵاتی مەرکەزی هەموو تواناکانی بەکارهێنا لەلایەنی سەربازییەوە لەپێناو سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد و زۆربەی ڕێگاکانی هەڵبژارد، بەڵام هەوڵەکانی بێسوود بوون و نەیتوانی پێشکەوتن لە ئامانجەکانیدا بەدەت بهێنێت.

لە سەرەتای هاتنی بەعسییەکان لە عێراق بۆ سەر دەسەڵات، حکومەت بارودۆخەکەی زۆر شپرزە و ناسەقامگیربوو، و نەیتوانی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەیارەکانی لەناو بەرێت، لەو کاتە ناکۆکی نێوخۆیی لەنێو عێراقدا زۆربوو، بەتایبەتی ململانێیەکی زۆر لەنێو خودی دەسەڵاتدارانی حکومەت هەبوو، لە هەمووشیان توندتر ئەو پیلانە دەرەکی و ناوخۆییانە بوون کە لە دژیدا نەخشەیان بۆ دەکێشرا. شۆڕشی کوردی بە یەکێك لە گرنگترین فاکتەرەکانی بێهێزکردنی دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی لە عێراق دەژمێردرێت لەو کاتەدا، لەبەرئەوەی توانی زۆربەی تواناکانی دەسەڵاتدارانی عێراقی لەناوبەرێت لە ڕێگای سەربازیدا، بەم جۆرەش بەهۆی سەرقاڵبوونی حکومەتی عێراقی لە هەوڵەکانی بۆ سەرکورتکردنی شۆڕشی کورد ڕێگا بۆ نەیارەکانی تریان خۆشبوو بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکانیان، هەموو ئەم فاکتەرانە حکومەتی عێراقییان هاندا کە بیر لە چارەنووسی داهاتووی خۆی بکاتەوە و بەدوای ڕێگەیەك بگەڕێت لەپێناو بەهێزکردنەوەی دەسەڵاتەکەی. هەندێك پەیوەندی نهێنی دەستی پێکرد لەنێوان کورد و حکومەتی مەرکەزی بەشێوەیەکی نا ڕاستەوخۆ، دواتر ئەم پەیوەندییانە پێشکەوتن و چوونە بازنەیەکی پێشکەوتووترەوە، لەدوای ئەوی حیزبی بەعس داوای لە سەرکردایەتی شۆڕشی کورد کرد گفتوگۆ بکەن لەگەڵیاندا لەپێناو چارەسەرکردنی گرفتەکانی نێوانیان. دواتر ئەم هەڵوێستەی حکومەت لەلایەن سەرکردایەتی شۆڕش پێشوازییەکی گەرمی لێکرا، حکومەتی عێراقی پێشنیاری کرد شاندێکی پایەبەرز سەردانی بارزانی

بکـات لــە کوردســتان، و ڕۆژی ٣١/١٢/ ١٩٦٩ دە ستنیــشانکرد بــۆ ســەردانەکە و سـەرکردایەتی شۆڕشـیش لـە کوردسـتان ئامـادەیی خـۆی دەربـڕی بـۆ پێشوازیکردنی شاندەکەی حکومەت لە ڕۆژی دیارکراو(٧٠).

لە ڕۆژی دیاریکراو شاندێکی پایەبەرزی حکومـەت گەیشتە کوردستان کـە زۆربـەی شاندەکە لە فەرماندە پایەبەرزە سەربازییەکانی دەوڵەت بوون، شاندەکە لەگەڵ بـارزانی و ئەندامانی تری سەرکردایەتی پارتی دیموکراتی کوردسـتان کۆبوونـەوە، تاکـە کێشەی بـەردەم گفتوگۆکانیـان کێشەی دوا ڕۆژ و چارەنووسـی کـەرکوك بـوو، چـونکە شـاندی حکومەت بە هەموو شێوەیەك هەوڵی ئەدا لیوای کەرکوك دابڕێنێ لە ناوچـە کوردییـەکان و کورد ناچار بکات دەست لـەو خاڵـە هـەڵبگرێت، بـەڵام بـارزانی جـەخت لەسـەر ئـەوە دەکاتــەوە کـە کـەرکوك شـارێکی کوردییـە و ناسـنامەیەکی کـوردیی هەیـە، لــەدوای گرژییەکی زۆر کە دەکەوێتە نێوان گفتوگۆکان بەڵام دانوستاندن لەنێوان هەردوو لادا هەر بـەردەوام دەبێـت، لـە ٨ی کـانونی دووەمـی سـاڵی ١٩٧٠ شـاندێکی کـوردی لەسـەر بانگهێـشتی حکومـەتی عێراقـی سـەردانی بەغـدا دەکـات بـە مەبەسـتی درێـژەدان بـە گفتوگۆکانی نێوانیان، لە بەغدا شاندە کوردییەکە لەگەڵ ئەحمەد حەسەن بەکر کۆبۆوە، دواتـر زنجیرەیـەك دانیـشتنی تریـان ئەنجامـدا لەگـەڵ دەسـەڵاتدارانی تـری حکومـەتی عێراقی، ئەم سەردان و گفتوگۆیانە بەردەوامبوون لـە هـەردوو لا لـە کوردسـتان و بەغـدا تـاکو مـاوەی چـەند مانگێـك، دواتـر هـەردوو لا گەیـشتنە ڕێکـەوتنێك سـەبارەت بـە چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیان، لەدوای ئەوەی سەدام حوسـەین جێگـری سـەرۆکی عێراق لەو کاتەی خـۆی سـەردانی بـارزانی کـرد و لەگـەڵ سـەرکردایەتی شـۆڕی کـوردی کۆبـۆوە، لـە ٩ی ئـازاری ١٩٧٠، گفتوگۆیـەکانی نێـوان هـەدوو لا بـە ئـەنجام گەیـشتن، حکومـەتی عێراقـی دانـی بـە مافـەکانی گـەلی کورددا نـا لـە چوارچێوەی دەسـەڵاتێکی ئۆتۆنۆمی لـە عێراقـدا، لـەدوای ئیمزاکردنـی ڕێکەوتنەکـە لـەنێوان هـەردوو لادا لـە نیـوە

شەوی ١٠-١٩٧٠/٣/١١، بەم شێوەیە کوردەکانی عێراق دوای بەدەستهێنانی بەشێك لە مافەکانیان لەنێو ڕێکەوتننامەی ١١ی ئازار بەشێوەیەکی کاتی دەستیان لە شەڕکردن هەڵگرت و ڕوویانکردە ئاوەدانییەکان نێو شارەکان و بەشدارییان کرد لە کابینەیەکی نوێی حکومەتی عێراقی لەدوای وەرگرتنی پێنج کورسی وەزارەت، تاکو ڕادەیەك بنکەکانی پێشمەرگە لە شاخ و چیاکانی کوردستان هەڵگیران، و کوردەکان کۆتاییان هێنا بە شەڕی پارتیزانی خەباتی چەکداری و ڕوویان کردە خەباتی سیاسی[٧١].

---

## پەراوێزەکان

[١] حسن خليل غريب، تأريخ حرب العصابات، المحرر (مجلة)، العدد (٢٥١)، لسنة ٢٠٠٦، موقع مهاجر الإسلامي www.googlc.com.

[٢] گەریلا: بەمانای شەڕی بچووك دێت، بچووككراوەی ووشەی شەڕ یان جەنگە، لە زمانی ئیسپانیەوە وەرگیراوە. هەمان سەرچاوە.

(٣) سابیر ئەحمەد، پێشەکییەك لەبارەی شەڕێ پارتیزانی لە کوردستاندا، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٨٤، ل٦.

(٤) حسن خليل غريب، المصدر السابق.

[٥] دیدار: حەمید ئەفەندی، هەولێر، ٢٠٠٧/٩/٢٢. ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٩ لە سیدەکانی سەر بە پارێزگای هەولێر لەدایکبووە و، لە ساڵی ١٩٦١ چۆتە ڕیزەکانی شۆڕشە ئەیلول لە باشووری کوردستان.

(٦) ماوتسی تونگ سەرکردەی شۆڕشی شیوعییەکان بووە لە چین، لە ساڵی ١٩٤٩ توانی ببێتە یەکەم سەرۆك کۆماری چینی میلی، و ڕۆڵێکی کاریگەری بینی لەو شۆڕشە ڕۆشنبیرییەی کە حیزبی شیوعی چینی پێی هەڵسا، و لە ساڵی ١٩٧٦ کۆچی دوایی کرد. حسن خليل غريب، المصدر السابق.

[٧] المصدر نفسه.

(٨) سابیر ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل٨.

[٩] هەمان سەرچاوە، ل٩.

(١٠) دیدار: حەمید ئەفەندی، هەولێر، ٢٠٠٧/٩/٢٣.

(١١) دیدار: محەمەد عەزیز بەربەیار، هەولێر، ٢٠٠٧/٣٠١١. ناوبراو ساڵی ١٩٢٩ لە هەولێر لە دایك بووە ، لە ساڵی ١٩٦٣ چۆتە ڕیزی شۆڕی ئەیلول.دیدار،

(١٢) محەمەد عەزیز بەربەیار، هەولێر، ٢٠٠٧/١١/٣٠.

(١٣) دیدار: حەمید ئەفەندی، هەولێر، ٢٠٠٧/٩/٢٣.

(١٤) دیدار: محەمەد عەزیز بەربەیار، هەولێر، ٢٠٠٧/١١/٣٠.

(١٥) دیدار: حەمید ئەفەندی، هەولێر، ٢٠٠٧/٩/٢٣.

(١٦) سابیر ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل٨.

(١٧) حسن خلیل غریب، المصدر السابق.

(١٨) دیدار: محەمەد عەزیز بەربەیار، ٢٠٠٧/١١/٣٠.

(١٩) شەکەوت شێخ یەزدین، بارزانی لە مەهابادەوە بۆ ئاراس، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠١، ل٣٦.

(٢٠) کاظم حبیب، لمحات من نضال حرکة تحریر الوطني للشعب الکردي ١٩٦١– ١٩٧٥، الجزء الثالث، دار آراس، ٢٠٠٣، ص٣٢.

(٢١) ئارشاك سافراستیان، کورد و کوردستان، وەرگێڕانی ئەمین شوانی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٤٠.

(٢٢) هەمان سەرچاوە، ل٥٢.

(٢٣) کاظم حبیب، المصدر السابق، ص٥٥.

(٢٤) المصدر نفسه، ص٥٧.

(٢٥) مایکل کەنتەر، فەرهەنگی مێژووی کورد، وەرگێڕانی مامکاك، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل١٨٢.

(٢٦) کاظم حبیب، المصدر السابق، ص٥٩.

(٢٧) رینیة موریسیس، کردستان أو الموت، ترجمة جرجیس فتح الله، مطبعة وزارة التربیة، الطبعة الثانیة، أربیل، ١٩٩٩، ص٤٣.

(٢٨) بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ مایل کەنتەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨٢.

(٢٩) ولیم ایغلتین ألابن، جمهوریة مهاباد، ترجمة جرجیس فتح الله، مطبعة وزارة التربیة، الطبعة الثانیة، أربیل، ١٩٩٩، ص٢٨.

(٣٠) بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ مایل کەنتەر، سەرچاوەی پێشوو، ل١٨١.

(٣١) نوری دەرسیمی، دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا، وەرگێڕانی ئەحمەد فەتاح دزەیی، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٩٩.

(٣٢) رینیة موریسیس، المصدر السابق، ص٤٦.

(٣٣) نوری دەرسیمی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٦.

(٣٤) کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ئامادەکردنی: عەبدوڵا زەنگەنە، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠١، ل١٣.

(٣٥)

(٣٦) مەسعود بارزانی، بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد (شۆڕشی بارزان ١٩٤٥- ١٩٥٨)، کوردستان، ١٩٩٦، ل٥٣.

(٣٧) حبیب محمد کریم، تأریخ حزب الدیمقراطي الکردستاني- العراق (١٩٤٦- ١٩٩٣)، مطبعة خبات، دهوك، ١٩٩٨، ص٣٨.

(٣٨) مسعود البارزاني، البارزاني والحرکة التحریر الکردیة (١٩٥٨- ١٩٦١)، مطبعة خ بات، دهوك، ص١٣١.

(٣٩) نفس المصدر، ص١٠٩.

(٤٠)عەبدوڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری، شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ دژی ڕژێمی قاسم، بەشی دووەم، هەولێر، ١٩٩٧، ل١٦.

(٤١) ویلیم أیغلتن ألابن، المصدر السابق، ص١٧١.

(٤٢) مسعود البارزاني، البارزاني و الحرکة التحرریة الکردیة (١٩٦١- ١٩٧٥)، أربیل، ٢٠٠٣، ص١٠٤.

(٤٣) بۆزانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ عەبدوڵا ئەحمەد ڕەسول پشدەری، سەرچاوەی پێشوو، بەشی سێیەم، ٢٠٠٧، ل١٠٠.

(٤٤) مسعود البارزاني، المصدر السابق، ص٢٢.

(٤٥) عەبدوڵا ئەحمەد پشدەری، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٢.

(٤٦) رينيه موريسيس، المصدر السابق، ص٨٦.

(٤٧) حبيب محمد كريم، المصدر السابق، ص٧٣.

(٤٨) بۆزانیاری زیاتر بگەڕێوە بۆ مایکڵ گەنتەر، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣٥.

(٤٩) رينيه موريسيس، المصدر ال سابق، ص٩٣.

(٥٠) سابیر ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل٦.

(٥١) محسن دزقيى، أحداث عاصرتها، الجزء الثاني، دار آراس، أربيل، ٢٠٠٣، ص٩٢.

(٥٢) دیدار لەگەڵ حەمید ئەفەندی، ٢٣/١٢/ ٢٠٠٧، هەولێر.

(٥٣) عەبدوڵا ئەحمەد پشدەری، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٢.

(٥٤) رينيه موريسيس، المصادر السابق، ص١٠٥.

(٥٥) نفس المصدر، ص١٠٧.

(٥٦) عەبدوڵا پشدەری، سەرچاوەی پێشوو، ل١١١.

(٥٧) عومەر عوسمان، ژیانی کوردێك، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٥٦.

(٥٨) هەمان سەرچاوە، ل٢٥٧.

(٥٩) مسعود البارزاني، المصدر السابق (١٩٦١– ١٩٧٥)، ص١٢٠.

(٦٠) محسن دزقيى، المصدر السابق، ص٩٤.

(٦١) حبيب محمد كريم، المصدر السابق، ص٢٩.

(٦٢) عومەر عوسمان، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٢.

(٦٣) عومەر عوسمان، هەمان سەرچاوە، ل٢٥٦.

(٦٤) حبيب محمد كريم، المصدر السابق، ص١٠٨.

(٦٥) نفس المصدر.

(٦٦) محن دزقيى، المصدر السابق، ص١٦٨.

(٦٧) كاظم حبيب، المصدر السابق، ص١١٤.

(٦٨) عومەر عوسمان، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٧.

(٦٩) محسن دزقيى، المصدر السابق، ص١٨٧.

(٧٠) نفس المصدر، ص١٩٠.

(٧١) نفس المصدر، ص١٩٨.

لیستی سەرچاوەکان :

أ- سەرچاوە کوردییەکان :

١- ئارشاك سافراستیان، کورد و کوردستان، وەرگێڕانی ئەمین شوانی، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥.

٢- سابیر ئەحمەد، پێشەکییەك لەبارەی شەڕی پارتیزانی لە کوردستان دا، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٨٤.

٣- ەوکەت شێخ یەزدین، بارزانی.. لە مەهابادەوە بۆ ئاراس، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٦.

٤- عەبدوڵا ئەحمەد ڕەسوڵ پشدەری، شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ دژی ڕژێمی قاسم، بەشی دووەم، هەولێر، ١٩٩٧.

٥- عومەر عومان، ژیانی کوردێك، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٧.

٦- کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ئامادەکردنی عەبدوڵا زەنگەنە، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠١.

٧- مەسعود بارزانی، بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگار یخوازی کورد (شۆڕشی بارزان ١٩٤٥- ١٩٥٨)، کوردستان، ١٩٨٦.

٨- مایکل گەنتەر، فەرهەنگی مێژووی کورد، وەرگێڕانی مامکاك، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.

٩- نوری دەرسیمی، دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا، وەرگێڕانی، ئەحمەد فەتاح دزەیی، دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠١.

ب- سەرچاوە عەرەبییەکان :

١- حبيب محمد كرم، تأريخ حزب الديمقراطي الكردستاني- العراق (١٩٦٤-١٩٩٣)، مطبعة خبات، دهك، ١٩٩٨.

٢- رينيه مورسيس، كردستان أو الموت، ترجمة : جرجيس فتح الله، مطبعة وزارة التربية، الطبعة الثانية، أربيل، ١٩٩٩.

٣- (٧١) كاظم حبيب، لمحات من نضال حركة تحرير الوطني للشعب الكردي ١٩٦١-١٩٧٥، الجزء الثالث، دار آراس، ٢٠٠٣، ص٣٢.

٤- مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحرير الكردية (١٩٥٨- ١٩٦١)، مطبعة خ بات، دهوك.

٥- مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية (١٩٦١- ١٩٧٥)، أربيل، ٢٠٠٣.

٦- محسن دزهيي، أحداث عاصرتها، جزء الثاني، دار آراس، أربيل، ٢٠٠٢.

٧- ويلم يغلتن ألابن، جمهورية مهاباد، ترجمة: جرجيس فتح الله، مطبعة وزارة التربية، الطبعة الثانية، أربيل، ١٩٩٩.

أنترنت :

١- حسن خليل غريب، تأريخ حرب العصابات، المحرر (مجلة)، العدد (٢٥١)، لسنة ٢٠٠٦، موقع مهاجر الإسلامي www.google.com.

دیدارەکان :

١- دیدار لەگەڵ حەمید ئەفەندی، پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول، هەولێر ٢٣/٩/٢٠٠٧.

دیدار لەگەڵ محەمەد عەزیز بەربەیار، پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلول، هەولێر، ٣٠/١١/٢٠٠٧.

# کۆمەڵەی زانستی

## ( ١٩٢٦ ـ ١٩٣٩ )

هێرۆ محمد إبراهیم

**پێشەکی :**

جەنگی جیهانی یەکەم (١٩١٤ – ١٩١٨) کە جیهانی راپێچی جەنگێکی دژوار و سەخت کرد ، سەرەڕای ئەوەی چەندین گۆڕانکاری نوێ وەکو دەرەنجامی گرینگی جەنگ بە سەر شانۆی سیاسی جیهاندا هێنا ، چەندین پێکهاتەی سیاسی نەتەوەیی لە سەر شانۆی جیهان پەیدا بوون . لەم هەلومەرجەدا کورد وەکو نەتەوەیەکی چەوساوەی ژێر دەستی دەوڵەتی عوسمانی بەو ئومێد و چاوە دەیڕوانیە ئەو دەوڵەتە سەرکەوتوانە کە لانی کەم مافی نیمچە سەربەخۆی یەکی پێ بدەن ، بەڵام بەرژەوەندی زلهێزی جیهانی و ناوچەیی مێژووی بە جۆرێکی تر نوسیەوەو کوردی بێ بەش کرد لەو مافە .

کورد وەك هەر نەتەوەیەکی تر کەم تەرخەمی نەکرد لە هەوڵ و تێکۆشان و گرتنە بەری ڕێگەو شێوازی خەباتی سیاسی و شۆڕشگێری ڕۆشنبیری بە هەموو کەم و کوڕی و هەڵە سیاسی و سەربازیەکانیەوە، ڕووداوەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیست سەلمێنەری ئەم ڕاستیەن. بەتایبەتیش دوای دەرك کردنی سەرکردەکانی کورد بە پێویستی هەبوونی ڕێکخراو و کۆمەڵەی سیاسی و ڕۆشنبیری وەکو شێوازێکی سەردەمیانەی خەبات و وریاکردنەوەی نەتەوەکەیان و ئاشنا کردنیان بە خوێندن و خوێندەواری . ئەم خە باتەش بە درێژکراوەی خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی

دادەنرێ، هۆکارەکانی سەرهەڵدن و دامەزراندنی ئەم جۆرە کۆمەڵانە نزمی ئاستی خوێندەوار و کەمی ڕێژەی خوێندەواران بووە، کە زۆرێك لە لێکۆڵەران و مێژوونووسان بە فاکتەرێکی گرنگی دواکەوتنی کوردی دەزانن .

دیارە (کۆمەڵەی زانستی) وەکو کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری لە سەردەم و قۆناغێکدا نەشونمای کرد کە کۆمەڵگای کوردی پێویستی زۆری بەم جۆرە چالاکیانە هەبوو، بۆ گرتنە بەری پرۆسەی بە خوێندەواری کردنی خەڵك و هاندانیان بۆ ناردنی منداڵەکان بۆ بەر خوێندن. ئەم توێژینەوەیە تایبەت کراوە بە ڕۆڵ و چالاکیەکانی کۆمەڵەی (زانستی)، کە لە قۆناغێکی پێویستی مێژووی کوردا سەری هەڵ دا و خاوەنی ئامانج و ستراتیژی خۆی بوو بۆ خزمەتکردنی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی. ئارەزووم بۆ توێژینەوەیەك لەسەر بارودۆخی ڕۆشنبیری و شارستانی دوور لە خەباتی سیاسی و چەکداری لە پشت دیاری کردنی بابەتێکی لەم جۆرەوە بوو .

بێگومان نووسینی هەر بابەتێکی لەم جۆرەش ڕێگر و کۆسپی خۆی هەیە، منیش وەك هەر کەسێکی تر تووشی کۆمەڵێك گرفت بووم دیارترینیان کەمی زانیاری بووە لە سەر کۆمەڵەکە لە سەرچاوەکاندا، وە نەبوونی کاتێکی زیاتر بۆ گەڕان بە دوای سەرچاوەی زیاتر و سەر قاڵیمان بە خوێندن و چەند گرفتێکی تر ...، ئەم توێژینەوەیە لە دەروازە و سێ تەوەرە پێکهاتووە، سروشتی توێژینەوەکەش وای خواستووە کە بە دەروازەیەك دەست پێ بکەم لە سە ربارودۆخی کوردستان بەر لە دامەزراندنی کۆمەڵەکە، لە تەوەرەی یەکەم دا: باسم لە دامەزراندنی کۆمەڵەکە و هۆکارەکانی دامەزراندنی و ناساندنی دامەزرێنەرانی و پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمەڵەکە کردووە.

لە تەوەرەی دووەم دا: باسم لەڕۆڵ و چالاکیەکانی کۆمەڵەکە و چالاکیەکانی لە مەیدانی ڕۆشنبیری کوردا کردووە. تەوەرەی سێیەمم تایبەت کردووە بە هەڵوێستی لایەنە جیاجیاکان لە هەمبەر دروست بوونی کۆمەڵەکە و پاشانیش هەڵوەشانەوە و

هۆکارەکانی. پاشان وەکو سروشتی هەر توێژینەوەیەك بە دەرەنجامێك کۆتایم بە توێژینەوەکە هێناوە.

بۆئەوەی توێژینەوەکە شێوازێکی ئەکادیمی بگرێتە خۆ و میتۆدی لێکۆڵینەوەکە زانستی و بێ لایەنی پێوە دیار بێ پەنام بردۆتە بەر سەرچاوە ڕەسەن و نزیکەکانی سەردەمی دامەزراندن و چالاکیەکانی کۆمەڵە، هەرچەندە زانیاریەکان کەم بن بەڵام بە بایەخ و گرنگن، لە دیارترینیان ڕۆژنامەی ( ژیان )ە کە هاو سەردەمی کۆمەڵەیە وە کتێبی ( تەقەلالایەکی دڵسۆزانە بۆ لە ناوبردنی نەخوێندەواری– کۆمەڵەی زانستی، لە نووسینی غەفووری میرزاکەریم )ە کە سوودێکی زۆرم لێ بینیوە، چونکە ئەم سەرچاوەیە زانیاریەکانی بەشێوەیەکی ئەکادیمی خستۆتە ڕوو لەسەر کۆمەڵەی زانستی. هەروەها ( کورد و کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بریتانیادا، کە لە نووسینی ولید حمدی )یە، لەم سەرچاوەیەشدا زانیاریەکی باشی خستۆتە ڕوو لە سە رئەم کۆمەڵەیە. وە کتێبی ( چیم دی) کە هی ( ئەحمەد خواجە)یە ئەمەش سودێکی زۆرم لێ بینیوە لەبەر ئەوەی ئەم نووسەرەش لە ڕوانگەیەکی زانستی یەوە باسی لە زانیاریەکانی تایبەت بەم کۆمەڵەیە کردووە. وە ( شاری سلێمانی ) لە نوسینی ( ئاکۆ عبدالکریم شوانی )یە، کە بە شێوازێکی ئەکادیمیانە تیشکی خستۆتە سەر کۆمەڵەی زانستی. بێگومان ئەو کارەی ئێمە کردوومانە هەرچەندە ئەرك و ماندوبوونێکی زۆرمان لەسەر کێشاوە، بەڵام بێ کەم و کوڕی نی یە، ئومێدەوارم هەوڵ و کۆششەکانمان بەرهەمدار بێت و توانیبێتمان هەڵسەنگاندنێکی مێژوویی بخەینە بەر دیدی خوێنەرانی توێژینەوە کە ببێتە مایەی خزمەتێکی بچووك بە مێژووی نەتەوەکەمان .

دەروازە :

**پوختەیەکی بارودۆخی کوردستان لە سەروبەندی دروست بوونی کۆمەڵەی (زانستی )دا**

ئەو بارودۆخە ئاڵۆزەی کە لە ئاکامی جەنگی یەکەمی جیهانیەوە هاتە ئاراوە زۆربەی میللەتانی جیهانی گرتەوە ، لەم چوارچێوەیەدا میللەتی کوردیش بێ بەش نەبوو ، کوردەکان زەبرو زیانێکی زۆریان لێکەوت گەورەترین زەبر کە بە کوردەکان کەوت ژمارەی کوژراو یان زیانە کانیان نە بوو ، بەڵکو ئەو وێرانی خاك و سوتانی گوندو دورخرانەوەی خەڵك و دادگایی و ئەشکەنجەو ئازارە بوو کە لە ئەفسەران و جەندرمەکانی تورکیایان دەبینی . [1]

لەم سەردەمەدا ناکۆکی سەرەکی لە عێراقدا بریتی بوو لە دووبەرەکی و ململانێ لە نێوان گەل بە گشتی و ئیمپریالیزم دا ، کورد و عەرەب هەریەکەی بە پێی هەل و مەرجی تایبەتیان تێ دەکۆشان قوربانیان دەدا بۆهێنانە دی مافی ڕەوایان [2]. لە کوردستانی باشوور ژمارەیەك ڕاپەڕینی کوردی بەرپا بوو[3] لەو ڕاپەڕینانە لە سلێمانی ڕاپەڕینەکەی شێخ محمود بوو ، کە لە کوردستاندا هێزی سەرەکی و بەر بەرەکانی و داواکاری مافی گەل لە ڕیزی ئەم بزوتنەوەیەدا خۆی دەنواند ، ئەم بزوتنەوەیە هەرچەندەدووچاری زۆر تەنگ و چەڵەمە بوو بوو بەڵام هەرچۆنێ بێ توانی لەو سەردەمەدا دەسەڵاتێکی نیشتیمانی و دەورێکی میللی بهێنێتە کایەوە وە ببێتە جێگەی ئاواتی کورد لە باشووری کوردستاندا[4].

سیاسەتی شۆڤێنیانەی تورکە کەمالیەکان لەو کاتەدا هۆکارێك بوو کەوای کرد ڕووناکبیران بە یەکجاری ڕوو لە سیاسەتی ئینگلیز بکەن[5]. دوای ئەوەی کۆنگرەی ( لۆزان) کە لە ٢٤ی تە موزی ١٩٢٣ بەسترا نەیتوانی کێشەی ویلایەتی موسڵ چارەسەر بکات، لە ٢٠ی ئەیلولی ١٩٢٤ کێشەکە خرایە بەردەستی کۆمەڵەی گەلان، لەو کاتەی ئینگلیزەکان خەریکی یەکلایکردنەوەی کێشەی موسڵ بوون زۆریان لامەبەست

بوو کە زۆرترین لایەنگر لە خۆیان کۆ بکەنەوە، ئەو سەردەمەش جگە لە ڕوناکبیرانی سلێمانی، بازرگانەکان و خاوەن موڵکەکانی سلێمانی کە نزیکترین دەستە و توێژبوون کە ئینگلیز بەردەوام متمانەی پێ دەکردن ئەوانیش لایەنگری دەوڵەتی عێراق بوون، چونکە بەرژەوەندیە ئابوریەکانیان لەگەڵ بەغداد بوو [٦].

بارودۆخی کوردستان بەگشتی لەو کاتەدا دووچاری چەندین گرفت و کێشە هاتبوو ، بەتایبەتی لە دوای لکاندنی ویلایەتی موسڵ بە عێراق و ڕەزامەندی بەریتانیا لە سەر وەرگرتنی عێراق وەك ئەندام لە کۆمەڵەی گەلان[٧]. ئەو سەردەمە هێشتا کەس نەیدەوێرا بە ئاشکرا خۆی لە قەرەی هیچ جۆرە چالاکیەکی سیاسی بدات هێندە نەبێت ئەندامە کوردەکانی نێوپەرلەمانی عێراقی، لایەنگیری (عبدالمحسن السعدون ) سەرۆك وەزیرانی عێراقییان دەکرد و کەوتبوونە جم وجۆڵ، بەتایبەتی پاش ئەوەی نێو براو لە ڕێکەوتی ٢١ی کانونی دووەمی ١٩٢٦ دا لە نێو پەرلەماندا وتارێکی خوێندەوە ، کە بە ئاشکرا داوای دەکرد کە مافەکانی کورد لە بەرچاو بگیرێت لە دامەزراندنی فەرمانبەرانی کورد لە نێوچە کوردییەکان ویلایەتی موسڵ و بە ڕەسمی کردنی زمانی کوردی[٨].

ئینگلیزەکان لەو ڕۆژگارەدا زۆریان لامەبەست بوو سلێمانی بێدەنگ بکەن لە ناوچەکانی دیکەی کوردستانی دابڕێن، تەنانەت ئەو هەنگاوەش کە (عبدالمحسن السعدون) هەڵێنا لە سەردەمی سێهەمین حوکمداریەتی شێخ محمود دا بە وەی کە بەشی زۆری قەزاو ناحیەکانی لە سلێمانی دابڕی تەنها بۆ ئەوەبوو ڕووداوەکانی ئەو شارە هیچ کاریگەریکیان بە سەر دەوروبەری خۆیانەوە نەبێت، چونکە ئەو کاتە کە کێشەیەك لە ناوچە کوردنشینەکاندا ڕووبەڕووی وەزارەتەکەی سەعدون دەبۆوە کێشەی کوردەکانی سلێمانی بوو، لەو کاتەدا ئینگلیزەکان هەموو هاوکاری و پاڵپشتیەکی حکومەتی عێراقیان دەکرد، بە مەبەستی جێگیر کردنەوەی ئیدارەو دەسەلأت لە شارەکەدا، شێخ محمودیش تا دەهات توشی نوشوستی دەبوو لە سایەی سیاسەتی

بریتانیاوە، حکومەتی عێراقیش هیچ ئاوڕێکی لە چاک کردنی بارودۆخی شارەکە نەدەدایەوە[٩].

ئەوکاتە حکومەت بودجەیەکی زۆری بۆ مەبەستی سەربازی لە سلێمانی و دەوروبەریدا تەرخان کرد بوو، لە ئەوەی ئاوڕێک لە باری ناهەمواری سلێمانی بداتەوە[١٠]. حکومەت هەر لە هەوڵی ئەوە دابوو لە رووی سەربازییەوە کۆنترۆڵی بکات[١١]. کاتێک ڕوناکبیرانی سلێمانی کەوتنە چالاکی و کاری سیاسی کردن لەو کاتەدا دوو ڕەوت لە گۆڕەپانەکەدا هەستی پێ دەکرا، کە بریتی بوون لە ڕەوتی میانڕەو کە مەبەستیان تەنها بەدەست هێنانی جۆرێک بوو لە (ئۆتۆنۆمی)، بەلآم ڕەوتی دووەم کەسانێکی توندڕەو بوون وخاوەنی دەیان خەونی گەورەی نیشتیمانی بوون، جودابوونەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆ ئاواتی هەرە پێشینەیان بوو[١٢]. لە سەرەتادا ڕەوتە میانڕەوەکە پێیان وابوو دەتوانن لە سایەی بەریتانیادا، لە هەموو مەسەلەیەک زیاتر گرنکیان بە خوێندن و خوێندەواری دەدا، بۆ ئەم مەبەستەش دەستەیەکیان (ئەنجومەنی معاریفی سلێمانی)یان دامەزراند، لە ڕێکەوتی ١٢ی شوباتی ١٩٢٥ دا یەکەم دانیشتنیان ئەنجام دا[١٣].

جگە لەوەش لە چەند ژمارەیەکی ڕۆژنامەی ( ژیان )دا ، داوا لە نوێنەرانی کورد دەکەن لە پەرلەمانی عێراقدا، کە هەموو هەوڵ و کۆششێکیان بخەنە گەڕ بۆ پێشخستنی خوێندن و خوێندەواری لە کوردستاندا و مامۆستا و پرۆگرام دابین بکەن و خانەی مامۆستایان بکەنەوە[١٤]. ڕووناکبیرانی ئەوسای سلێمانی زۆر چاک ئەو ڕاستیەیان دەزانی کە لیوای سلێمانی لە بواری خوێندن و فێرکردندا لە هەموو لیواکانی دیکەی عێراق دواکەوتووترە و لە سالآنی ڕابردوودا زۆر ناخۆشی و نەهامەتی تووش هاتووە[١٥].

سلێمانی لەبواری خوێندن و فێركردندا زۆر پشتگوێ خراوە لەلایەن حكومەتەوە، چەندین جار داوای دروست كردنی قوتابخانە ونەخۆشخانە یان كردووە لە سلێمانی، بەلاَم حكومەت ئاوڕی لەم داواكاریانەی ئەوان نەداوەتەوە[١٦]. لە سەردەمی دووهەمین حكومداریتی شێخ محمودا سێ قوتابخانە هەبووە لە سلێمانی[١٧].

(( بەتێپەڕبوونی كات مەڵبەندی جولاَنەوەی نیشتمانی لە دێهاتەكانەوە كەوتە ناو جەرگەی شار هەر وەكو جڵەوی سەركردایەتی كەوتە دەست ڕۆشنبیران و قوتابیان و لاوانی خوێن گەرم، بەم ڕەنگە خەباتی ڕۆژنامەگەری هاتە مەیدانەوە دەستەی ڕۆشنبیران كەوتنە چالاكی نواندن و نووسین و بلاَوكردنەوەی بیروڕای خۆیان هەروەكو بۆ یەكەم جار وەك دان نانێك بە مافی بەڕێوەبردنی كاردا ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ[١٨]، لە ساڵی ١٩٢٦ وەكو كوردێك جڵەوی كاروباری سلێمانی پێ سپێردراو بوو بەمتصرف. لەم هەل و مەرجە تازەیەدا ڕۆشنبیرانی كورد بەزیرەكانەوە هاتنە كۆڕی مەیدانەوە و خۆیان گونجان لەگەڵ ئەم ڕێبازە تازەیە و لە هەوڵی خۆیان بەردەوام بوون، بۆ یەكەم جار ئەحمەدی عەزیز ئاغا كە یەكێك بوو لە دەستەی ڕۆشنبیران نووسراوێكی نووسی لە ڕۆژنامەی ژیان ساڵی ١٩٢٦ كە تیایدا داوای دانانی كۆمەڵێكی ڕۆشنبیری دەكات داوای یەكگرتن و لە ناوبردنی كرمی دوو دڵی و ناكۆكی دەكات، هاوار لە گشت چینەكانی دانیشتوان دەكات كە تێكڕا تێكۆشن بۆ پێكەوەنانی كۆمەڵێك بۆ قۆڵكردن بە قۆڵی یەكدا تا بتوانن بە هێز و توانای هەموو لایەك گورگی نەخوێندەواری بدەن بە زەویدا تۆڵە لە دوا كەوتنی چەند ساڵ بكەنەوە، ئاسۆی پێشكەوتن بهێننە دی، ئەمە وێنەی ئەو ڕۆژە بوو كە سەرەتای دامەزراندنی كۆمەڵی زانستی كوردانی لێوە هات))[١٩].

## تەوەرەی یەکەم :

## دامەزراندنی کۆمەڵەی زانستی

**فاکتەرەکانی دروست بوونی کۆمەڵە :**

چەند فاکتەرێکی گرنگ وای کرد کەوا کۆمەڵەی زانستی بهێتەکایەوە کە ئەم فاکتەرانە ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە دروست بوونی کۆمەڵەدا :

فاکتەری سەرەکی کەوا ڕۆڵی هەبوو لە دروستبوونی کۆمەڵەی زانستی دا ئەوە بوو کە زیاتر پەیوەندی بە لایەنی سیاسیەوە هەبوو، لەبەرئەوەی لەو کاتەدا ئینگلیز و حکومەتی عێراقی بە هەموو شێوەیەك چاودێری جموجۆڵی ڕوناکبیرانی سلێمانیان دەکرد، لەبەر ئەوە نەدەکرا، هێندە بە ئاسانی چالاکی سیاسی ئەنجام بدرێت، بۆیە لە سەرەتاوە نیشتیمان پەروەران بیریان لەوە کردەوە کەوا پەنا بۆ چەند کۆمەڵە و ڕێکخراوێك ببەن کە سیمایەکی سیاسی ئاشکرای نەبێت، هەربۆیە لە (١)ی شوباتی ١٩٢٦ بە نووسراوێکی ڕەسمی داوای مۆڵەتی دامەزراندنی جەمعیەتێکیان کرد بە نێوی (جەمعیەتی زانستی کوردان) و لە ٢٤ ی شوباتی هەمان ساڵدا ڕێگایان پێدرا[٢٠].

بە هۆی نالەباری بارودۆخی کوردستان لەو کاتەدا ئاستی خوێندەواری وەکو پێویست نەبوو، نیشتیمانپەروەران و ڕۆشنبیران پێیان وابوو کەوا پێویستە لە هەموو شت زیاتر بایەخ بە خوێندەواری و زانست بدەن، ئەم ڕێگایەشیان بە چاکترین شێواز دەزانی بۆ گەیشتن بە کاروانی پێشکەوتن و ڕۆشنبیر کردنی کۆمەڵگەی کوردی[٢١].

دوای ئەوەی نیشتیمانپەروەرانی کورد بە گشتی و سلێمانی بە تایبەتی ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە ئینگلیز و دەوڵەتی عێراق هیچ نیازپاکیەکیان بەرامبەر بە کورد نیە، کەوتنەوە خۆئامادەکردن بۆ خەبات کردن، کە لەو ڕۆژگارەدا ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکانی باکوری کوردستان لە ژێر زوڵم و ستەمی کەمالیەکان هەڵاتبوون خۆیان گەیاندبووە باشوری کوردستان، ئەمەش بۆ خۆی فاکتەرێکی دیکەی ئەو گوڕ و تینە بوو کە ڕوناکبیرانی گرتبۆوە[٢٢].

دوای بەستنەوەی کوردستانی باشوور بە عێراق کە کۆمەڵەی گەلان ڕێکەوتن لەسەر بڕیاردانی[23] پشت گوێ خستنی حکومەتی عێراق لەو بڕیارانەی کە بەڵێنی دابوو جێ بە جێی بکات، لەوانە ڕاگەیاندنی مافی پێدانی ڕۆشنبیری و نەتەوەیی کورد، ئەمەش پاڵنە رێکی تر بوو بۆ قوتابیان و ڕۆشنبیرانی کورد لە دامەزراندنی کۆمەڵە و ڕێکخراوەکانی[24].

فاکتەرێکی تر کە کاریگەری هەبوو لە دامەزراندنی کۆمەڵە، لایەنگیریەکی زۆری لێکرا لە لایەن کۆمەڵانی گەلەوە بە پارە و یارمەتیدانی کۆمەڵەکە لەلایەن کەسایەتیە ناسراوەکانی کورد لە هەموو باشوری کوردستاندا[25]، ڕۆژنامەی ژیان فاکتەرێکی بە هێزی تر بووە کەوا ڕۆڵێکی کاریگەری بینیوە لە دامەزراندنی کۆمەڵەی زانستی، ڕۆڵی هەبووە لە هاندانی بزافی ڕۆشنبیری لە کوردستاندا ، تەنانەت چەندین جار نووسراوی جیاجیای بلاو کردۆتەوە بۆ پاڵپشتی کردن لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا[26].

ب- ڕاگەیاندنی ( کۆمەڵەی زانستی ):

کۆمەڵەی زانستی لە ٢٤ ی شوباتی ١٩٢٦ بە فەرمی دامەزرا کاتێ بە نووسراوێکی ڕەسمی لە لایەن وەزارەتی ناوخۆ ڕێگە درا بە دامەزراندنی، ئەمە دوای ئەوە بوو کە دامەزرێنەرانی کۆمەڵە داوایەکیان پێشکەش بە حکومەتی عێراقی کرد بۆ دامەزراندنی ئەو کۆمەڵەیە، کە ئامانجی ئەدەبی و پەروەردەی هەبوو، کە سەرەتا داواکاریەکە لە لایەن سێ ڕوناکبیرەوە پێشکەش کرابوو کە بریتی بوون لە ( فائق مەعروف، ڕەفیقی محامی، ڕەمزی فەتاح )[27].

دامەزرێنەرانی کۆمەڵە ئەم بانگەوازەیان لە ڕۆژنامەی( ژیان) بلاو کردەوە

(( ئیجرای ئیستحفال بەرەسمی گوشادی (جەمعیەتی زانست )

(( شەوی شەموی ئاتی کە موافیقی ٣/٢ ی نیسانی ١٩٢٦ هەیئەتی مونەسیسەی جەمعیەتی زانستی کوردان لە دائیرەی بەلەدیەدا بە حفلەیەك ڕەسمی گوشادی جەمعیەت ئیجرا دەكات)).

(( تەمەنا دەکەین کە ئەم ئیجتیماعە گەورە عیلمیە ببێتە فاتیحەی تەرەقی و سەعادەتمان وە ئەم تەشەبوسە بە ئەهمیەتەی هەیئەتی مونەسیسەی جەمعیەتی مەزکور تەقدیر و تەبریك دەکەین)) [٢٨].

ژیان رۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە ڕاگەیاندنی (کۆمەڵەی زانستی) دا کە تیایدا هاتووە :-

(( مژدەیەکی گەورە بۆ هەموو کوردان ))

(( مەعلومی خوێندەوارانی کیرامەکە تاکو ئەمڕۆ بۆ هەموو شارەزوو ئەمەلمان حەسرکردۆتە سەر بلأوکردنەوەی عیلم ومەعاریف. ئەوا ئەمڕۆ شوکرەن لیلا بە کەمالی ئیفتیخارەوەری ئەم سەعیە ئەخەینە بەرچاوی میللەت. بینا لەسەر تەشەبوساتی چەند کەسانێکی میللەت پەروەر وتەسدیقی وەزارەتی داخیلیە و معاوەنەتی گەورەی جەنابی موتەسەریف و، موفەتیشی ئیداری قەدردان، پرۆغرام و نیزامنامەی (جەمعیەتی زانستی کوردان) نەشر و ئیعلان دەکەین)).

(( ئومێدوایە کە ئەم جەمعیەتە بناغەیەکی عیلمی مان بۆ دابمەزرێنیٚ و پێشەوایی هەموو میلەت بکات و، ئەم تەشەبوسە خەیریەیە بۆ ولأت و میلەت ببیٚ بە خاڵێکی خێر. وە تەمەنا ئەکەین کە ئەم جەمعیەتە بە سایەی هەموو ئەشراف و عولەما و تیجار و منەوەرینەوە بژی و بەردار ببیٚ)).

(( بە نەشرو تەقدیم کردنی ئەم مژدە خۆشە و، ئەم خەبەرە بە قیمەتە ( ژیان ) جدەن مەسرور و موفتەخیرە)) [٢٩].

دوای ئەوە بڕیار لەسەر دامەزراندنی کۆمەڵە درا ، کە لە ڕێکەوتی ١٣ / ٤ / ١٩٢٦ ئاهەنگی کردنەوەی کۆمەڵەی زانستی سازکرا[٣٠]. کە تیایدا بەڕێز رەفیق ئەفەندی سەروتارێکی خوێندەوە دوابەدوای محمد بەگ وتارێك وە پیرەمێرد هۆنراوەیەکی خوێندەوە لە دوایدا جمال بابان و شێخ مستەفا قەرەداخی وتاریان داو پێشوازیەکی

گەرم کرا لە لایەن قوتابیان بە وتەی جوان  هەربژی ئەوانـەی هـەوڵ بـۆ عـیلم و زانـستی دەدەن، پاشان دەست کرا بـە پـارە کۆکردنـەوە و دواتـر هەڵبـژاردن کـرا لـە ئـەنجام دا دەستەی بەڕێوەبەرێتی  کۆمەڵە هەڵبژێردران(٣١).

ج – دامەزرێنەرانی کۆمەڵە :–

دامەزرێنەرانی کۆمەڵە لە چەند کە سـانێکی ڕونـاکبیر و خـاوەن پلـەو پایـە پێك هاتبوون، بەڵام  وەکو دەستپێکی دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، کە ڕۆڵێکی سەرەکیان  بینیوە لە بناغە دانانی (کۆمەڵەی  زانستی) دا لە ڕێگەی پێشکەش کردنی نووسراوێکی ڕەسمـی لـە ١ ی شـوباتی ١٩٢٦ داوایـان کـرد کـە مۆڵـەت وەربگـرن  لـەلا یـەن حکومەتـەوە بـۆ دامەزراندنی (کۆمەڵەی  زانستی) لە سلێمانی ئەوانیش پێکهاتبوون لە :–

( رەفیقی محامی، رەمزی فەتاح، فائق معروف بەگ ) (٣٢).

بەڵام لە ئاهەنگی ڕاگەیاندنی کۆمەڵەکـە، کـە پێشتر باسمـان کـرد – دەسـتەی بەڕێوەبەرێتی  کۆمەڵە هەڵبژێدرا کە لەم کەسایەتیانە پێك هاتبوون :–

| | |
|---|---|
| ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی موتەسەریف | سەرۆك |
| جەمال بەگی بابان – دادپەروەر | جێگری سەرۆك |
| ر ەفیق ئەفەندی – پارێزەر | سکرتێر |
| فائق معروف بەگ – موڵکدار | ژمێریار |
| شێخ مستەفا قەرەداخی – قازی | ئەندام |
| محمد ئاغای ئەورەحمان ئاغا | ئەندام |
| عزت بەگی عوسمان پاشا | ئەندام |

| | |
|---|---|
| غەفوور ئاغا | ئەندام |
| رەمزی فەتاح | ئەندام |

ئەمانەش دەستێکی بالآیا گێڕا لە بناغە دانانی کۆمەڵەدا[٣٣].

ئەگەر هەڵوەستە یەك لە ئاست ناوی ئەندامانی دەستەی بەڕێوەبەر بکەین دەبینین سەرجەمیان کەسانی بەرچاو و ڕۆشنبیرو خاوەن پلەو پایەن، هیچ مۆرکێکی سیاسیان پێوە دیار نیە، بەلأم دواتر لە سەر دەستی جەمال بەگی بابان، کە جێگری سەرۆك بوو، ئاراستەیەکی سیاسی وەرگرت[٣٤].

د- پەیڕەو و پرۆگرامی کۆمەڵە :

کۆمەڵەی زانستی خاوەن پەیڕەو پرۆگرامی خۆی بووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (زانستی) لە شێوەی کۆمەڵەیەکی هاوچەرخ بووە. دەقی پرۆگرامی کۆمەڵەکەو پەیڕەوی ناوەخۆی لەسەردەمی خۆی لە ڕۆژنامەی ( ژیان) دابلاوکراوەتەوە، هەروەها چەند سەرچاوەیەکیش ئاماژەیان پێداوە و ڕایانگواستووە. لەبەر گرنگی بابەتەکە ئێمەش دەقی پرۆگرام و پەیڕەوەکە بە شێوازی خۆیان لێرەدا دەنووسینەوە:

(( پرۆغرامی جەمعیەتی زانستی کوردان ))

(( ناوی جەمعیەت و مەرکەزی ))

١ – ناوی جەمعیەت :- (جەمعیەتی زانستی کوردان)ە و مەرکەزی لە سلێمانیە.

٢ – مەقسەدی جەمعیەت:تەعمیمی عیلم و مەعریفەتە لە کوردستان بە پێی ئەم وەسائیتە:

ا- بە نەشری غەزەتە و رەسائیلی موەقەتە.

ب- تەرجومە و تەئلیفی کتێبی تەدریسە و سائیرە.

ج-مەکتەب کردنەوەو ئیجرای تەدریسات بە ڕۆژو بە شەو.

ح- بە سورەتی موحازەرە ئەهالی تەنویر کردن.

د- کتێبخانە کردنەوە.

هـ- بۆ ئیکمالی تەحسیل بۆ مەمالیکی موتەرەقیە قوتابی ناردن.

٣- جەمعیەت ئەحوالی تاریخیە، جوغرافیە، ئیتنۆغرافیەی کوردان بە سورەتی مەخسوسە تەدقیق و مەحسولی مەساعی نەشر دەکات.

٤- جەمعیەت بۆ تەئمینی مەحەبەت و موئانەسەت لە مابەینی ئەهالی و حکومەت دا و بۆ تەقوبەی رۆحی ئیتاعەت بە سورەتی مەخسوسە و بە واسیتەی واعیزانی مەخسوس پەند و نەسیحەت ئیجرا دەکات .

٥- جەمعیەت بە هیچ سوڕەتێك لەگەڵ سیاسەت دا خەریك نابێ .

مەعروف بەگ زادە فئق - محامی رەفیق - حاجی فەتاح زادە رەمزی[٣٥].

## نیزامنامەی داخلی

سورەتی قەید و قبوڵی ئەعزا و ئیخراجات :

١- بیلا تەفریقی جنس و مەزهەب هموو کەسێك بەو شەرائیتە کە لە ژێرەوە نووسراوە ئەتوانێ بە قەراری هەیئەتی ئیدارە داخلی جەمعیەت ببێ :

أ- عومری لە ٢٠ساڵ کەمتر نەبێ .

ب- لە حقوقی مەدەنیە ساقیت نەبێ و ساحیبی حوسنی ئەخلاق بێ.

٢- هەچ کەسێك موخالیفی مەقاسیدی جەمعیەت حەرەکات بکات وە یاخود مانگانە و دخولیەی جەمعیەت نەدات وە یا خود حەرەکەتێك بکات کە لە ناو ئەهلی وەتەن دا موخیللی شەڕەف بێ، بە قەراری هەیئەتی ئیدارە لە جەمعیەت دەردەکرێت.

صورەتی تەشکیلی هەیئەتی ئیدارەو وەزائیفیان :

٣- جەمعیەت بە واسیتەی هەیئەتی ئیدارەوە که لە ٣ کەس کە متر نابێ و لە ٧ کەس زیاتر نابێ ئیدارەدەکرێ .

٤- هەیئەتی ئیدارە بە ئینتیخابی ئەکسەریەتی موجتەمعین لە هەیئەتی عمومیە ئینتیخاب دەکرێ .

٥- رەئیس و کاتب و محاسبی جەمعیەت و مەئمورین لە هەیئەتی ئیدارە یاخود لە ئەعزای جەمعیەت تەعین و ئینتیخاب دەکرێ وەلاکین دەبێ رەئیس لە هەیئەتی ئیدارە بێ.

٦- هەیئەتی ئیدارە بۆ ئیجرای مەقاصیدی جەمعیەت هەرچی لازم بێ دەیکات. واریدات و مەصاریفاتی جەمعیەت تەسبیت دەکات. بودجەی ساڵی موستەقبەل ئیحزار وتەقدیمی هەیئەتی عمومیەی دەکات و هەموو ساڵێك هەرچی کردوە و هەرچی لازمە بکرێ بۆ ئیجرای مەقاصیدی جەمعیەت بە ڕاپۆرتێکی موفەصەل عەرزی هەیئەتی عمومیەی دەکات.

٧- هەیئەتی ئیدار وەزائیفی مەئمورین و کەتەبە تەعین دەکاو موراقەبەیان دەکات[٣٦].

**واریداتی جەمعیەت و مەصاریفاتی :**

٨- واریداتی جەمعیەت عیبارەتە لە دخولیە و مانگانەی ئەعزاکان و عیبارەتە لە تەبەروعات و هیبەی ئەصحابی خیرات.

٩- هەموو ئەعزایەك لە حینی دخولی دا بەپێی ئیقتیداری خۆی مەجبورە مەبلەغێك بە ناوی دخولیەوە بدات. حەدی ئەصغەری ئەم مەبلەغە روپیەیەکە و، دیسان مەجبورە بە پێی ئیقتیداری خۆی مانگی شتێك بدات بە جەمعیەت.

١٠- بۆ ئیجرای مەقاصیدی جەمعیەت زیاتر بۆ شتێکی کە واریداتی جەمعیەت صەرف ناکرێ و هەموو مەصرەفێك بە ئەمروتە صدیقی هەیئەتی ئیدارە دەکرێت.

١١- هەیئەتی ئیدارە مەجبورە ئەو دەفتەرانە کە قانونی جەمعیەت ئەمری پێ دەکات هەیئەتی عومیە.

١٢-هەیئەتی عومیە هەموو ساڵێك لە ئەوەلی تشرینی ئەوەل دا ئیجتیماع دەکات و وەزائیفی هەیئەت ئەمەیە :

أ- واریدات و مەصاریفاتی جەمعیەت تەسپیت دەکات.

ب- ئیجاب بکات پرۆغرام تەعدیل دەکات.

ج- هەیئەتی ئیدارە ئەز سەر نو ئینتیخاب دەکات.

د- بۆ ساڵی ئایندە مەساعی جەمعیەت تەنزیم دەکات.

١٣- رەئیسی هەیئەتی ئیدارە ریاسەتی هەیئەتی عومیەش دەکات.

١٤- رەئیسی هەیئەتی ئیدارە وە یاخود وەکیلێك کە جەمعیەت تەعینی دەکات لەمەحاکیم و دەوائیری حکومەت دا جەمعیەت تەمسیل دەکات.

١٥- چ لە هەئیەتی ئیدارە و چ لەهەیئەی عومیە موزاکەرەو ئیتیخازی قەرار بە ئەکسەریەتی موجتە معین دەبێ.

١٦- هەیئەتی عومیە عیندە لیئجاب لەسەر دەعوەتی هەیئەتی ئیدارە جگە لە ئیجتیماعی عادی سەنەوی هەموو وەقتێك دەتوانێ گردبێتەوە و وەزائیفی خۆی بەپێی ئەم پرۆغرامە بەجێ بهێنێت.

٢٧ کانوونی ساڵی ١٩٢٦.

مەعروف بەگزادە فائیق | محامی رەفیق | حاجی ڕەمزی

فەتاح زادە رەمزی[٢٧].

کۆمەڵەی زانستی خاوەنی پرۆگرامێکی ڕوون و نوسراوبووە. ئامانجەکانی دیار و دیاریکراو بووە، کە شوێنکەوتوێکی وێژەیی و پەروەردەیی هەبوو، هەروەها کۆمەڵەی

زانستی نیزامنامەیەکی نوسراوی هەبوە، جۆری وەرگرتنی ئەندام و مەرجە قانونیەکانی و ما ف و ئەرکەکانی و، دروست کردنی داو و دەزگاکانی، بەڕوونی دیاری کردووە[٣٨].

## تەوەرەی دووەم :
## ڕۆڵ و چالاکیەکانی کۆمەڵەی زانستی

### أ- گرنگی کۆمەڵەی زانستی لە بوژانەوەی لایەنی ڕۆشنبیریەوە.

بێگومان ئەم کۆمەڵەیە ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووە لە گەشە کردن و پیشکەوتنی لایەنی زانستی و بوژانەوە لایەنی ڕۆشنبیری، بەئەنجام گەیاندنیچەند چالاکیەك لەلایەن کۆمەڵەوە، خەڵکی بەرەو ئاراستەیەکی وشیاری و ڕووناك کردنەوەی کوردەواری برد ، کەچالاکیەکانی پەروەردەی زیاتر گرتەوە، هەروەها بلاوکردنەوەی زانست و زانیاری وە کردنەوەی قوتابخانەکان و وتنەوەی وانە و ڕێکخستنی کۆڕ[٣٩]. وە کردنەوەی خولەکانی فێرکردنی خوێندنەوە و نوسین و فێرکردنی زمان[٤٠]. وە هەروەها لەبەرنامەیاندا هەبوو کە قوتابیانی کورد بنێرێتە ئەوروپا بۆ خوێندن[٤١].

بە مەبەستی هاندان لەسەر خوێندنەوە و خوێندن کتێبخانەیەکیان کردەوە لە بارەگای کۆمەڵە لە حوزەیرانی ١٩٣٠ وە هەروەها مەسەلەی هاندانی وەرگێرانی کتێبی گرنگ لەزمانی بێگانەکانەوەبۆ زمانی کوردی وە بۆ دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردی و بلاوکردنەوە ڕۆشنبیری. وە بۆئەو ئامانجانە کۆمەڵە هەوڵیدا بۆ کڕینی چاپخانەیەك بۆ چاپکردنی کتێب و دەرکردنی کتێب وە بڕیاری دا بە دەرکردنی گۆڤار هەموو پازدە ڕۆژێك لە سنوری (١٦-٢٤) پەڕە دەبوو[٤٢].

بۆ وەرگرتنی مقالەی زانستی و ڕۆشنبیری بەسوود هەستان بە چالاکی دیکە وەك شانۆو یارمەتی دانی قوتابیە هەژارەکان[٤٣]. وە کۆمەڵە زۆربە دڵسۆزی وبەوپەڕی

تێکۆشانەوە ئیشی دەکرد بۆخزمەت کردنی زمانی کوردی کە گرنگیەکی زۆری بەو زمانە دەدا بە تایبەتی پاك کردنەوە و بژارکردنی زمانی کوردی لەو وشانەی کە لە زمانی بێگانەکانەوە وەرگیراون و تێکەڵاوی بوون و دانانی وشە کوردیەکان لە شوێنی خۆیان، بۆ ئەم مەبەستە لیژنەیەکیان پێك هێنا بۆ بژار کردنی زمانی کوردی بە ناوی ( کۆمەڵەی بژاری کوردی) لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٦ بە پێشنیاری ئەحمەد بەگ ( سەرۆکی کۆمەڵە) خۆی لە سەر ڕای ڕۆشنبیرانی کوردی وە دلواکاری ئەندامەکان لە زانستی دا هەستان بەو لێکۆڵینەوەیە وەکۆبونەوە دووجار لە هەفتەدا بۆ باسکردنی ئەم بابەتە(٤٤).

بایەخ پێدانی کۆمەڵەی زانستی بە ( قوتابخانەی زانستی شەوان ) کە یەکێك بوو لەو خزمەتانەی کۆمەڵەی زانستی کە کردبویەوە بۆ هەموو ئەو کەسانەی بەڕۆژ سەرقاڵی کارو کاسبی بوونە، وە یاخود زۆر جاریش تەمەن ڕێگر بووە لە بەردەم ئەوەی کەوا نەتوانن لە قوتابخانەی حکومەت بخوێنن، بۆیە زانستی شەوان کاریگەریەکی بەهێزی هەبووە لە بێدارکردنەوەی خەڵکی و پێشکەوتنی ڕوناکبیریاندا و بێ بەش نەبوونیان لە خزمەتکردندا بە تایبەت لە بواری خوێندندا(٤٥).

وە لێرەدا (ژیان) پێناسەیەکی زانستی دەکات و دەڵێت :-

((زانستی شوێنێکە " ئەو کەسانەی لە پێشدا بە بازاڕدا دەسوڕانەوە و شەڕە شەقیان دەکرد و بە شەو بە سەر خۆشی و جنێو فرۆشی و قومار ڕایان دەبوارد هەزاری لە وانە کردووە بە پیاوێکی خۆێندەواری بە حیسیەت و ئەهلی کەسب و صنعت )) (٤٦).

متصریف سلیمانی

(( بۆ زانین

(( بۆ ئەو کەسانەی طالبی فێربوونی زمانی ئینگلیزین لە ( زانستی )دا صنفێکی تازەکراوەتەوە لە لایەن معلمی مقتدر( رفعت غوث افندی) یەوە بە شەو تدریسی تیا

دەکرێت. هەر کەس طالبە بۆ قەید و قبول و مراجعت لە گەڵ ئەمەشدا پێویستە تشکری مۆمی الیە بکەین چونکە بۆ خزمەتی ئەهلی محترم و بۆ منفعتی زانستی ئەم وەزیفەیەی مجانا دەر عهدە کردووە. تەمەننای زیادبوونی ئەمثالی ئەم چەشنە منەوەرە بە حمتیانە دەکەین[٤٧].

چاکی ڕوناکبیرانی کۆمەڵەی زانستی وایکرد کەوا ئەم کۆمەڵەیە لقی تری هەبوو لە ناوچەکانی تری کوردستان لەوانە لە کەرکوك لە ٢١ ی حوزەیران ١٩٢٦ ئەندامانی پێك دەهات لە مەلا قادر ئەفەندی سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی ئەوقاف وە سەرۆکی ئەو لقە بوو، وە هەروەها مصطفی ئەفەندی خانەنشین جێگری سەرۆك بوو، وە عبد الخالق ئەفەندی کوڕی حسین نەقشبەندی بە هەمان شێوە جێگری سەرۆك بوو، وە ئەندامەکانی تری ئەحمەد ئەفەندی کوڕی تۆفیق ئاغا وە هەندێ لەسەرۆك عەشائیرەکان، ئەو لقە پەیوەندیەکی پتەوی هەبوو لەگەڵ کۆمەڵەی زانستی سلێمانی لەڕێگای پەیوەندی کردن بە نامە و کەسایەتیە دڵسۆزەکان ئەوانەی گرنگیان بە بابەتەکەدەدا لەهەولێر و لە ڕواندوزیش کوردەکان داوای دامەزراندنی یانەیەکی زانستیان کرد بەڵام وەزارەتی ناوخۆی عێراق داواکاریەکەی ڕەتکردنەوە[٤٨].

هەروەها لقێکی تری هەبوو لە (پردێ) بە سەرۆکایەتی صالح ئاغای کوڕی محمد وەلی ئاغا[٤٩] وە هەروەها کۆمەڵەی زانستی لقی تریشی هەبوو لە شارەکانی هەولێر و موصل[٥٠]. بەڵام لە ساڵی ١٩٢٧ کاتێك حکومەت هەستی کرد کەوا ئەم کۆمەڵەیە گۆڕاوە بۆتە مینبەرێکی حیزبی بۆنەتەوەی کوردی وە زیاتر بەلای سیاسەتدا دەڕوات بۆیەداخران[٥١].

**ب – کاریگەری لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە :**

کۆمەڵەی زانستی کاریگەریەکی زۆری هەبووە لە سەرجەم بوارەکاندا بە تایبەتی لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە پێشکەوتنێکی بەرچاو و گۆڕانێکی زۆری بە خۆیەوە بینیوە، سەبارەت بە مەسەلەی خوێندنی کچان کە چەندەها گیرو گرفت هەبووە لە بەردەم خوێندن و بەشداری کردنیان لە خوێندن و هەنگاونانیان بەرەو پێشەوە، چونکە ئافرەتان لە ڕێگەی خوێندنەوە دەتوانن بەرهەمێکی باش بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن، بەلام بەهۆی بوونی گیروگرفتی زۆر لەلایەن حکومەتەوە و داب و نەریتی کۆمەڵگاش کاریگەری هەبووە لە بەردەم ڕێگەنەدانی کچان و ئافرەتان بۆ بەشداری کردنیان و چونیان بۆ قوتابخانەکان[٥٢].

بەلام لەگەڵ ئەم هەموو گیرو گرفتانەشدا لەو ڕۆژگارەدا کەسایەتیەکی وەکو (حەپسەخانی نەقیب) کە دەورێکی بالای هەبووە لە پشتگیری کردنی خوێندنی کچان تەرخان کردبوو کردبووی بە قوتابخانە بۆیان[٥٣]. لەلایەکی دیکەوە ڕۆشنبیران هەوڵێکی زۆریان دا ل ڕێگەی ڕۆژنامەی ( ژیان )ەوە کە بە ئاشکرا داوایان لە حکومەت دەکرد کە قوتابخانەی زانستی تایبەت بە کچان و ئافرەتان بکەنەوە کە تیایدا بخوێنن و چاویان بکرێتەوە و وشیار بن و لەم بارەیەوە نووسیویەتی: (( میللەت کە ئافرەتی نەخوێندەوار بوو منداڵی باش بۆ نایەتە بەرهەم)) [٥٤].

لە ڕاستیشد ا هەردوو ڕۆژنامەی ( ژیان) و(ژین) ڕۆڵی بەرچاویان لە بلاو کردنەوەی خوێندن وخوێندەواریدا هەبووە[٥٥]. کە هێرشی گەورە گەورەیان دەبردە سەرخو و نەریتی کۆن، پەردەیان لە سەر ئەو بیروڕایە لادەدا کە ئافرەتی کردبووە دیل و کۆیلەی کۆمەڵ، بۆیە ئەوان دژی ئەوە بوون کە ئافرەت لە چوارچێوەیەکی تەنگەبەری نەخوێندەواریدا بمێنێتەوە بەڵکو ئامانجیان فێرکردن و خوێندەوارکردن و چاوکردنەوە

و هاوبەشی کردنیان بوو لەگەڵ پیاودا تا لە پێناوی گەل و پێشکەوتنی وڵات دا هەنگاو بنێت، بۆ یەکەمجار لە مێژووی کوردستانی عێراق لە سلێمانی لە ٢١ ی نیسانی ١٩٢٦ یەکەمین قوتابخانەی کچان کرایەوە، ئەمەش دەرگایەك بوو بۆ بەدیهاتنی ئاواتەکانی چەندین ساڵەی کچانی کورد، بۆ ئەم مەبەستەش ڕۆژنامەی ( ژیان ) ڕۆڵێکی کارای گێڕاوە لە ئاگادار کردنەوە و بانگەوازی کردن بۆ ئەوەی دایکان و باوکان کچەکانیان بنێرنە بەر خوێندن و لەو قاڵبە کۆنە بیانهێننە دەرەوە و چاویان بە ڕووی زانست و زانیاری ڕۆشن بکەن و هەڵبهێنن[٥٦].

بەم شێوەیە کۆمەڵەی زانستی لە ڕێگەی هەوڵی ڕوناکبیرانیەوە کاریگەریەکی زۆریان خستە سەر ئافرەتان کە سوودمەند بن و هاندەرێکی سەرەکی بوون بۆ ئەوەی ئافرەتان بهەژێنن، ئەوە بوو دواتر ئافرەتان توانیان کۆمەڵەیەکی تایبەتی زانستی بۆ خۆیان دابمەزرێنن لە ٢٨ ی تەموزی ١٩٣٠ بۆ یەکەمجار ئەم کۆمەڵە زانستیە تایبەت بە ئافرەتانیان دامەزراند، دیارترین کەسایەتیش لەو بوارەدا کە دەورێکی باڵای هەبووە ئەویش (حەپسەخانی نەقیب)بووە لەگەڵ کۆمەڵێك لە ئافرەتان کۆبوونەوەیان ساز کرد لە ماڵی حەپسەخانی نەقیب ئەوەبوو لە ئەنجام دا توانیان جێگای خۆیان بکەنەوە لە نێو ئەم کۆمەڵەیەدا[٥٧].

لەدوای (حەپسەخانی نەقیب) چەند ئافرەتێك ڕۆڵی خۆیان بینیوە لە خوێندنەوەی وتار و روونکردنەوەی مەبەستە کانی خۆیان لە بەستنی کۆبوونەوەکانیان لە وانەش لە دوای حەپسەخان، حەپسە عرفان کە قوتابیەکی شەشی قوتابخانەی کچان بووە، و بەدریەی شێخ قادری نوری ئەفەندی و پاشان زکیە میرزا توفیق قەزاز، ناهیدەی شێخ سەلام، لە ئەنجامدا بڕیاری کرینی خانویەکیان دا لەگەڵ پێداویستی یەکانیان بۆ ئەوەی تەرخانی بکەن بۆ کۆمەڵ، دواتر چالاکی تری ئافرەتان لە زیادبوون دا بوو هاوکاریەکی زۆری کرا لە ڕووی ماددیەوە لە لایەن دڵسۆزانی کۆمەڵە

و حەپسەخان دیاریەکی بە نرخی پێشکەش بە کۆمەڵ کرد کە بریتی بوو لە مەکینەیەکی سنگری دروومانی بە کارەبائیشکەر، کە بە ۳۹٥ روپیە کریبووی، دواتریش (شفیقە سعید ئەفەندی) ئەمیش کە قوتابیەکی قوتابخانەی کچان بوو سوپاسی بێ پایانی ئەو کەسانەی کرد کە ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون و هاوکاریان کردوون، بەم شێوەیە ئافرەتان رۆڵیان هەبووە لە پێشکەوتنی کۆمەڵگادا بۆ ئەوەی ئافرەتانیش بتوانن بە بەرهەمێکی زانستیانە پێشرەوی کۆمەڵگاکەیان بکەن، ئەوەبوو توانیان شەوی تاریکی و نەزانی بەچرای زانست رووناك بکەنەوە و ئافرەتانیش شان بە شانی پیاوان هاوکار بن لە پێشکەوتنی گەلەکەیاندا ، ئەمەش دەرەنجامێکی باش بوو دەتوانین بڵێین بەرهەمی کۆمەڵەی زانستی بوو کەوا کاریگەر بوو بە سەر لایەنی کۆمەڵایەتیەوە کە بگاتە ئەم ئاستە بەرزە[٥٨].

ج – هەڵوێستی کۆمەڵەی زانستی لە بەرامبەر راپەڕینە کوردیەکان :

لە سەرەتای کۆمەڵەی زانستی بە ئامانجی بڵاوکردنەوەی زانست وزانیاری و بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندەواری میللەتی کورد بوو لەناوەندەکانی کوردی دا، بەڵام هەرزوو گۆڕانی بەسەردهات و گۆڕلو بانگەشەی نەتەوەی دەکرد، کە بە بۆچوونی دامەزرێنەرەکانیشی یەکەمین مەرجیان خەبات بوو بۆوەدەست هێنانی سەربەخۆیی ،ئەوەی زۆر دەوری هەبوو، لەم گۆڕانەدا جەمال بەگی بابان کە جێگری سەرۆکی کۆمەڵە بوو لەگەڵ ژمارەیەك لە ئەندامانی تری کۆمەڵە توانیان رەوتێکی سیاسی بە کۆمەڵە بدەن، بە سەرکەوتوولنە کۆڕو کۆبوونەوە ساز بکەن و لە رێگەی قوتابخانە زانستی شەولنەبانگەشەی نەتەوەییان دەکرد هەروەها لەرێگەی دەستەی ( ژیان ) یشەوە کە ئەمەش رۆڵ و گرنگی و بەرچاوی هەبووە[٥٩].

ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە لە سلێمانی و کەرکوکیش بەردەوام لە پەیوەندی کردن دابوون لەگەڵ شێخ محمودی حەفید، هەرچەندە ئەم کۆمەڵەیە لە ڕواڵەتیدا وا دیار دەکەوت کەوا تەنها هەڵدەستێ بە بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری لە ناو کوردەکان دا، بەلاّم سەرەڕای ئەمەش تا دەهات کوردەکان هەڵوێستی نەتەوەیی یان زیادی دەکرد و لە کاری خەباتی سیاسی نهێنی خۆیان بەردەوام بوون(٦٠).

لەبەڵگە نامەکانی بەریتانیا ئاماژە بەوە دەکەن کەوا لە دوای دورخستنەوەی شێخ محمودی نەمر بۆ ئێران کۆمەڵەیەکی تر بە ناوی (کوردستان) کە ئەمەش ڕێکخراوێکی سیاسی نهێنی بوو لە کەرکوك هەڵدەستا بە بڵاو کردنەوەی کاری زانست و زانیاری لە ناو کوردەکان دا، وا پێ دەچێ ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە ئەندامی کۆمەڵەی زانستی بووبن بەلاّم لە پاش ساڵی ١٩٢٧ هیچ هەواڵێکی نەبوو، ئەم کۆمەڵەیەش لە ڕواڵەتدا زیاتر پەروەردەیی بوو بەلاّم بەردەوام بوو لە پەیوەندی کردن لەگەڵ کۆمەڵەی زانستی سلێمانی و لەگەڵ چەند کەسانێکی گرنگ لە هەولێر و ڕواندوز لە ڕێگەی ئاڵوگۆڕکردنی نامەوە(٦١).

دوای ئەوەی کۆمەڵەی زانستی ڕەوتێکی سیاسی پێ بەخشرا، بەردەوام لە هەوڵدان دا بوو بۆ بەدیهاتنی خەونی چەندین ساڵەی کورد، هەر وەکو دواتر دەبینین کە یەکێك لە هەوڵەکانیان ئەوە بوو کەوا توانیان لە ڕێگەی قوتابیانی قوتابخانەی زانستی شەوانە، ڕۆڵێکی بەر چاو ببینن لە جۆش دان و گەرم کردنی ڕاپەڕینی شەشی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٦ ی بەردەرکی سەرا، بەم شێوەیە کۆمەڵەی زانستی قوتابخانەیەکی گرنگ بوو بۆ میللەتی کورد کەوا توانی هەم لە لایەنی ڕۆشنبیریەوە بەرهەمی باش بەدەست بهێنێ و هەم لە لایەنی سیاسی یەوە ڕۆڵی خۆی هەبێت(٦٢).

## تەوەرەی سێیەم
## هەڵوێستی لایەنە جیاجیا کان لە هەمبەر دروستبوونی کۆمەڵەی زانستی و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵە

### أ- هەڵوێست لەهەمبەر (زانستی) :

دامەزرێنەرانی کۆمەڵە لە پەیڕەو و پرۆگرامی خۆیاندا بە ئاشکرا دانیان بەوەدا دەنا کە بە هیچ شێوەیەك دەست لە کاری سیاسی وەرنادەن و هیچ چالاکیەکی سیاسی نانوێنن، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە هەستی نەتەوەیی کورد لاواز بووبێ بەڵکو ڕوناکبیران و نیشتیمانپەروەران ویستیان لە ڕێگەی زانست و زانیاریەوە بگەنە ئامانجی خۆیان، چونکە ڕوناکبیرانی سلێمانی نەیان دەتوانی بە ئاسانی چالاکی سیاسی ئەنجام بدەن لە بەر ئەوەی ئینگلیز و حکومەتی عێراق بە هەموو شێوەیەك چاودێری جم و جۆڵیان دەکردن، بۆیە نیشتیمانپەروەران پەنایان بردەبەر دامەزراندنی چەند کۆمەڵە و ڕێکخراوێك لەوانە دامەزراندنی کۆمەڵەی زانستی بوو[٦٣].

کە لە ڕێگەی ئەم کۆمەڵەوە بایەخ بە زانست بدەن و هەوڵ بدەن بۆ گەیشتن بە کاروانی پێشکەوتن و ڕۆشنبیرکردنی کوردەواری[٦٤] چونکە لە ڕاپۆرتی بەریتانیەکاندا هاتووە کە سەبارەت بە دامەزراندنی کۆمەڵە دەڵێ :

(( نابێ ڕێگە بەم کۆمەڵەیە بدرێ کە بە مەبەستی سیاسی کارەکانی بکات و بکەوێتە دەست کەسانی نەتەوەیی توندڕەوەوە)) هەڵوێستی ڕاپۆرتەکە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کەوا مەترسی خۆی دەردەبڕێ لەبەرامبەر چالاکی کۆمەڵە و بەرنامە ڕێژیەکەی، کە لە سەر ڕێبازێکی پێشکەوتوانە دامەزراوە[٦٥].

لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵەی زانستی کوردان لە سلێمانی و لە ٢١ ی حوزەیرانی ١٩٢٦ لە کەرکوك چەند کەسایەتی دڵسۆز و ناسراوی کورد، لەوانە ئەسیری، ویستویانە

ئیجازەی دامەزراندنی ( کۆمەڵەی زانستی) و، لە هاوینی هەمان ساڵدا لە رواندوز ئیسماعیل بەگ و هەندێ لە کەسایەتیە ناسراوەکانی ئەوێ داوایان کرد کە ئیجازەی دامەزراندنی لقێکی تر سەر بە کۆمەڵەی زانستی بە ناوی ( کۆمەڵەی هۆشیاری ) کە دور دەبێ لە سیاسەت لە وەزارەتی ناوخۆی عێراق وەربگرن، بەلام وەزارەتی ناوخۆی عێراق هەڵوێستی بەرامبەر ئەم داواکاریە نەبووە و ئیجازەی پێ نەداون(٦٦).

هێزەکانی عێراقی بە پاڵپشتی هێزەکانی ئاسمانی بەریتانی بەردەوام هەوڵیان داوە کە کورد نەگات بە ئامانجی خۆی ، هەروەکو دەبینین دواتر کە بزوتنەوەکەی شێخ محمودی حەفیدی رزگاریخوازیان بەتوندترین شێوە کوژاندەوە، ئەمە لە کاتێکدا بوو کەوا هەستیان کرد کە شێخ پەیوەندی کی پتەوی هەیە لەگەڵ کۆمەڵەی زانستی لە سلێمانی و کەرکوك(٦٧).

ئەم کۆمەڵەیە وێرای خزمەتی زۆری پێشکەش کرد لە شاری سلێمانی دا، بەلام لە ئاستی پێو یستیدا نەبوو، چونکە مافی ئەوە یان هەبووە لەدەرەوەی سنوری سلێمانیش لقی تری کۆمەڵەی زانستی دا بمە زرێنن وەخزمەت بکەن، بەلام چالاکیەکانیان لەئاستی سلێمانی نەچووە دەرەوە، دواتر دوای ئەوەی نیشتیمان پەروەرانی کورد بەگشتی و سلێمانی بەتایبەتی ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە ئینگلیز و دەوڵەتی عێراقی هیچ نیاز پاکییەکیان بەرامبەر بەکورد نیە، بۆیەکەوتنەوە خۆئامادەکردن بۆ خەبات کردن(٦٨).

### ب – هەڵوەشانەوەی کۆمەڵە و هۆکارەکانی:

کۆمەڵە لە سەرەتادا چالاکیەکانی بە کاروباری پەروەردە و خوێندن و کردنەوەی قوتابخانەی ئێواران و موحازەرەگوتنەوە دەربارەی زانست و باسی جۆراوجۆر بلاو کردنەوەی زانیاری بۆ پێشکەوتنی گەل و نیشتیمانەکەی و رۆشنبیری کردنی کوردەواری خەریك بووە(٦٩).

کاتێـك ئـاڵو گـۆڕکرا لـە لیژنــەی کـارگێری چـەند ناکۆکیــەك کەوتــە نێــوان دامەزرێنەرانی کۆمەڵە، بەتایبەتی کاتێ مستەفا پاشا یاملکی کە لە مـانگی مایسی ١٩٢٦ دا گەیــشتەوە سـلێمانی، کۆمەڵـەی خـستە پێنـاو جـێ بـە جـێ کردنــی مەبەستەکانی خۆیەوە، ویستویەتی کۆمەڵەی زانستی بۆ پـڕو پاگەنـدەی هەڵبـژاردن بـۆ خۆی بەکار بهێنـێ ، جـەمال بابـان لەمـەدا هاوکـاری کـردووە. موتەسـەریفی سـلێمانی ، ئەحمەد بەگ تۆفیق بەگ ، ئەم کارەی پێ بـاش نـەبووە بـەڵکو ویـستویەتی کۆمەڵـەی زانستی دووربێ لە کاری سیاسی ، خەریکی کاروبـاری خوێنـدەواری و ڕۆشـنبیری بـێ ، بەڵام جەمال بابان ویستویەتی (( دوای لابردنی موتەسەریف کۆمەڵـەی زانـستی بکـات بە بنکەی بڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسی نەتەوەیی کوردی، چونکە باوەڕی وابووە کـە ((بیری حوکمی زاتی بۆ کوردستانی عێراق بەبێ بوونی بنکەیەکی ڕێکخراوەیی پتـەو نایەتــە دی)) لـە سـەر ئەمـە نـاکۆکی کەوتۆتـە نێـوان موتەسـەریف و جـەمال بابـان و هەندێکی دیکە لە ئەندامانی لیژنەی کارگێری، ئەم ناکۆکیەش بـە هۆکـارێکی سـەرەکی دادەنرێت لە لاواز کردنی کۆمەڵە و کەمکردنـەوەی چـالاکیەکانی، کـە لـە ئەنجامـدا بـووە هۆی دەست لە کار کێشانەوەی چـەند کارمەنـدێکی بـە توانـای کۆمەڵـە لەوانـە جـەمال بابان و مستەفا قەرەداخی و ئەحمەد بەگ[٧٠].

حکومــەتیش بــە هۆکــارێکی تــر دادەنــرێ لــە لاواز کردنــی چــالاکیەکانی کۆمەڵەدا، دوای ئـەوەی کۆمەڵـەی زانـستی لقـی تـری لێ بـۆوە لـە کـەرکوك و هـەولێر و موصل لە ساڵی ١٩٢٧[٧١]. دەسەڵاتدارانی بەریتانی و عێراقـی هەسـتیان بـەوە کـرد کـە ئەم کۆمەڵەیە بۆتە وە سیلەیەك بۆ بڵاو کردنەوەی بیرو باوەڕی نەتـەوەیی کـوردی بڕیاری داخستنی هەموو لقەکانیان دا[٧٢].

هەرچەندە کۆمەڵە لە ڕاپەڕینەکەی بەردەرکی سەرا لە شەشی ئەیلولی ١٩٣٠ بە ئاواتی خۆی نەگەیشت بـەڵام شۆڕشـگێڕان توانیـان ڕێبـازێکی نـوێ لـە مێـژوودا بـۆ

خۆیان تۆمار بکەن ، ئازایەتی و پاڵەوانیەتی بۆ ڕۆڵەکانی دوا ڕۆژ هێشتەوە و ریسوایی و سەرشۆری هەمیشەیی بۆ ئەوانە بەجیٚ‌هێشت کە بووبوونە دیلی ڕژێمی پاشایەتی بەم شێوەیە بارەگای کۆمەڵە داخرا و ڕۆژنامەی ژیان لە نووسین و بڵاوکردنەوە کەوت کە لەو ڕۆژگارەدا دەردەچوو تا جارێکی تر لە ساڵی ١٩٣٢ بە هاتنەوەی ئەحمەد بەگ موتەسەریف سەر لە نوێ دەرگای زانستی کرایەوە و دەست بە هەڵبژاردنی لیژنەی بەڕێوەبەرایەتی کراو دام و دەزگای کۆمەڵ کەوتەوە گەڕ و خزمەتکردن[٧٣] .

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا حکومەت لە دەست تێوەردانی کارو باری کۆمەڵە دا بەدوور نەبوو، بە تایبەتی لە سەردەمی پیرەمێرد[٧٤]، کە ئەو کات قوتابخانەی زانستی شەوانەی هەڵدەسوڕاند لە نێوان ساڵانی ١٩٣٢ – ١٩٣٨ ئیدارەی دەدات ا دواجار لە سەر دەستی (مەجید یەعقوب)ی موتەسەریفی سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٨ دا داخرا[٧٥]. ڕاستیەکەی ئاستەنگەکانی بەردەم خوێندن یەکجار زۆر بووە، حکومەت ئەم کەرتە زیندووەی پشتگوێ خستبوو بەم شێوەیە هەریەك لەو هۆکارانەی کە لە پێشووتر باسمان کرد کاریگەریان هەبووە لە هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەی زانستی دا[٧٦] .

ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە :

لە ئەنجامی ئەم توێژینەوەیەم گەیشتمە چەند دەرەنجامێك :

١- دەرك کردنی سەرکردەو ڕۆشنبیرانی کورد بە پێویستی هەبوونی کۆمەڵەیەکی ڕۆشنبیری هانیدان بۆ دامەزراندنی (کۆمەڵەی زانستی) لەو قۆناغەی مێژووی کوردا.

٢- ئەم کۆمەڵەیە لە بەرواری ٢٤ی شوباتی ١٩٢٦ بە فەرمی لە سلێمانی دامەزرا لە لایەن سێ ڕوناکبیرەوە (فائق معروف، ڕەمزی فەتاح، ڕەفیق محامی ).

٣-چالاکیەکانی کۆمەڵە زیاتر لە چوارچێوەی چالاکی ڕۆشنبیری و زانستی دا خۆی نواند،وەکو شێوازێکی خەباتی رزگاریخوازی نەتەوەیی و بەمەش خزمەتێکی زۆری بە بواری فێرکردن و ڕۆشنبیری و کۆمەڵگەی کوردی کرد.

٤- لە بوارێکی تر چالاکیەکانی بوونە مایەی کارئاسانی زۆرو ڕەخساندنی هەلی خوێندن بۆ ڕێژەیەکی بەرچاو لە منداڵانی کورد، بەکردنەوەی فێرگەو هەوڵدان بۆ دابین کردنی پێداویستیەکان.

٥- کۆمەڵە وەکو ئەرکێکی نەتەوەیی و ڕۆشنبیری سەرشانی خۆی و لە دیدگای ئەوەی کە ((ئافرەتیش نیوەی کۆمەڵە و مافی خوێندنی هەیە)) کەوتنە چالاکی بۆ لابردنی کۆسپەکانی بەردەمیان تا بیّ بەش نەبن لەم مافە سەرەتاییە، بەتایبەت کۆسپە کۆمەڵایەتیەکان.

٦- سەرەڕای کەم وکورپیەکانی و سنورداری چالاکیەکانی، بەڵام کۆمەڵەی زانستی خزمەتێکی دیاری پێشکەش بە کۆمەڵگەی کوردی کرد، کە شیاوی ڕێزو باسکردن و توێژینەوەی زۆر لەوە باشتر و تێر و تەسەل ترە.

٧- بەگشتی لەم قۆناغەدا ڕۆشنبیر و خوێندەوارانی کورد خوێندنیان بە ڕێگایەکی ڕاست و فاکتەرێکی ڕزگاری لە تاریکی و دواکەوتوویی دەزانی، بۆیە بوونە هاندەری خەڵك و سەرهەڵدان و گەشەکردنی بیری زانستخوازی و نوێگەری، بێگومان کۆمەڵەی زانستیش وەك بەشێك لەو کۆمەڵگەیە کە هەڵقوڵاوی ناخی جەماوەر بووە بۆ ئەم قۆناغە بوو بە ژیلەمۆ بۆ ڕووناك کردنەوەی تاریکی ڕۆژگار، کە ڕێگەی ڕاستەقینەی لە دەربازبوونی کورد گرتبوو لە شەوی تاریکی یەڵدا و گەیشتن بە ئاسۆ و گزنگی ئازادی بەیان و گەیشتن بە کاروانی پێشکەوتن وەك گەلانی تر.

٨- دوای هەوڵدا نێکی زۆری کۆمەڵە و بەردەوام بوونیان لە کار و چالاکیەکانیاندا، بەڵام بە هۆی ڕووبەڕووبوونەوەیەکی زۆر لە گیر و گرفت کە حکومەتیش بە دوور نەبوو لەدەست تێوەردانی کاروبار و پشتگوێ خستنی کۆمەڵە، ئەمانە و چەند هۆکارێکی تریش کاریگەریان هەبوو لە هەڵوەشانەوەی کۆمەڵەی زانستی کە لە ساڵی ١٩٣٨ لە لایەن (مجید یعقوبی) موتەسەریفی سلێمانیەوە بۆ دواجار داخرا.

پەراوێزەکان :

---

(1) ڕۆبرت ئۆڵسن، ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیران ، و/ابوبکر خۆشناو ، سلێمانی ، ۱۹۹۹ ، ل ۱۹۹ .

(2) غەفوور میرزا کەریم ، تەقەڵلایەکی دڵسۆزانە بۆ لە ناو بردنی نەخوێندەواری لە کوردستاندا، کۆمەڵەی زانستی لەسلێمانی، مطبعة دار الجاحظ ،بغداد ، ۱۹۵۸ ، ل ٥ .

(3) د.سەعدی عوسمان هەروتی، بزافی ڕزگاریخوازی کوردی ،چ ۱ ، هەولێر ، ۲۰۰٦ ، ل ۹۲ .

(4) غەفوور میرزا کەریم، س. پ ، ل ٥ .

(5) ژیانەوە ( ڕۆژنامە ) : ژمارە ( ۱٥ ) ، ۱٦ / ۲ / ۱۹۲٥ .

(6) د.فاضل حسین، کێشەی ویلایەتی موسڵ ، و / محمد شاکەلی، سلێمانی ، ۱۹۹۹، ل ۷۷ ، ۳۰۰ .

(7) هیوا حمید شریف، توفیق وهبی حیاته و دوروه السیاسی و الثقافی ، سلیمانیة ، ۲۰۰٦ ، ص ۸۱ .

(8) عبدالرزاق الحسنی ، تاریخ الوزارات العراقیة، ج ۲، ط ۷ ،بغداد ، ص ٥۰ ، لطفی جعفر فرج عبدالله ، عبدالمحسن السعدون دوره فی التاریخ العراق المعاصر ، ط۲ ، بغداد ، ۱۹۸۰ ، ص ۱۰۳ .

(9) لطفی جعفر ، م . س ، ص ۱۰۳ .

(10) محمد امین زکی ، محاسبەی نیابەت، بغداد ، ۱۹۲۸ ، ل ۱٦ .

(11) لطفی جعفر ، م . س ، ص ۱۰۷ .

(12) د.عبدالفتاح علی یحی البوتانی، وثا ئق عن الحرکة القومیة التحرریة الکوردیة ، ط۱ ، اربیل ، ۲۰۰۱ ، ص۳٤-۳٥ .

(13) ژیا نەوە (ڕۆژنامە ) : ژمارە (٥۰ ) ۲٦ / ۱۱ /۱۹۲٦ .

(14) هـ . س ، ژمارە (۱۹ ) ۳ /۳ /۱۹۲٥ ، (۳۰ ) ، ۱۰ / ۷ / ۱۹۲٥ .

(15) ژیان ( ڕۆژنامە ) : ژمارە (۸ ) ، ۱۱ / ۳ / ۱۹۲٦ .

غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل ١٠ . (١٦)

رەفیق حیلمی ، یادداشت ، ب ٢ چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان ،هەولێر ، ١٩٨٨ ، ل ٥٣٤ . (١٧)

(١٨) ئەحمەد بەگی توفیق بەگ: یەکێك بوو لە پیاوە ناسراوەکانی سلێمانی لە ساڵی ١٨٩٨ لە دایك بووە ، خزمایەتی لە گەڵ پشدەریەکاندا هەبووە ، ئاستێکی خوێندەوا ری باشی هەبووە ، لە رۆژگاری داگیر کردنی ئینگلیزەوە چەند پۆست و پلەو پایە یەکی گرنگی وەرگرتووە ، ساڵی ١٩٢٤ دوای داگیرکردنەوەی سلێمانی کراوەتە ( متصرف ) ی شارەکە . ( نجدة فتحي صفوة : العراق في الوثائق البريطانية ، سنة ١٩٣٦ ، ترجمة و تحرير مركز دراسات الخليج العربي ، جامعة البصرة ، ١٩٨٣ ، ص٥٧ ) .

غەفوور میرزا کەریم ،س . پ ، ل١٠-١١ . (١٩)

شاکۆ عبدالكريم شوانی ، شاری سلێمانی ١٩١٨- ١٩٣٢ ، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی – سیاسیە ، چ ١ ، سلێمانی ، ٢٠٠٢ ، ل ٢٢٠ . (٢٠)

هـ . س ، ل ٢٢١ ، غەفوور میرزا کەریم ، س .پ ، ل ١٣ ، دیڤید مەکداول ، مێژووی هاوچەرخی کورد ، و/ابوبکر خۆشناو ،چ٢ ،هەولێر ، ٢٠٠٥ ،ل ٢٩١ ، ئەحمەد خواجە ، چیم دی ، ب٣ ، سلێمانی ، ١٩٧٠ ، ل٢٨ . (٢١)

عبدالفتاح البوتانی ، م . س ، ص٣٤ ، کریس کۆچێرا ،کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا ، و/ حەمە کەریم عارف ، چ٤ ،هەولێر ، ٢٠٠٧ ،ل ١٣٦ . (٢٢)

ژیانەوە ( رۆژنامە ) : ژمارە ( ٥٤ ) ، ٢٤ / ١ / ١٩٢٥، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : فاضل حسين ،س . ث ، ل١٧١- ١٧٥ . (٢٣)

جەعفە ر علی ، ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی ، سلێمانی ، ٢٠٠٤ ، ل ٢٣٨ – ٢٣٩ .

(٢٤)

د. ولید حمدی ، کورد و کوردستان لە بەڵگە نامەکانی بریتانیادا ، و / محمد نوری تۆفیق ، چ٢ ، سلێمانی ، ١٩٩٩ ، ل ١٧٢ . (٢٥)

نەوشیروان مستەفا ئەمین ، ژیان بە تەمەنترین ڕۆژنامەی کوردی ١٩٢٦ – ١٩٣٨ ، چ١ ، سلێمانی ، ٢٠٠٢ ، ل ٢٣٦ . [٢٦]

د.سروة اسعد صابر ، كوردستان الجنوبية ١٩٢٦ – ١٩٣٩ ، دراسة تاريخية – سياسية ، سليمانية ، ٢٠٠٦ ، ص ٣٣٣ – ٣٣٧ ، ئەحمەد خواجە ، س . پ ، ل ٣٨ –٤٠، [٢٧] غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل ١٢ و دواتر ، عبدالستار طاهر شريف ، الجمعيات والمنظمات ولاحزاب الكوردية في نصف قرن ١٩٠٨ –١٩٥٨ ، بغداد –١٩٨٩ ، ص ٩١.

[٢٨] ژیان ( ڕۆژنامە ) : ژمارە (١١ ) ،١ / ٤ / ١٩٢٦ ، هەروەها بڕوانە : ئەحمەد خواجە ، س . پ ، ل ٤٥ – ٤٦ .

ژیان ( ڕۆژنامە ) :ژمارە (١١) ، ١ ی نیسانی ١٩٢٦ . [٢٩]

ئاکۆ شوانی ، شاری سلێمانی ١٩١٨ – ١٩٣٢ ، ل ٢٢٠ ، ولید حمدی ، س . پ ، ل ١٧١ – ١٧٢. [٣٠]

غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل ٢١ – ٢٢ . [٣١]

ژیان ( ڕۆژنامە ) :ژمارە (١١ )، ١/ ٤ / ١٩٢٦ ، کریس کۆچێرا ، س . پ ، ل ١٣٦ ، ئاکۆ شوانی ، شاری سلێمانی ١٩١٨ – ١٩٣٢ ، ل ٢٢٠ . [٣٢]

ژیان ( ڕۆژنامە ) : ژمارەکانی (١٢ ) ، ١٢ / ٤ / ١٩٢٦ ، (١٣ ) ٢٢ / ٤ / ١٩٢٦ ، غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل ٢١ ، ولید حمدی ، س . پ ، ل ١٧١ – ١٧٢ . [٣٣]

ئاکۆ شوانی ، شاری سلێمانی ١٩١٨ – ١٩٣٢ ، ل ٢٢١ . [٣٤]

ژیان ( ڕۆژنامە ) : ژمارە ( ١١ ) ، ١ / ٤ / ١٩٢٦ ، ئەحمەد خواجە ، س . پ ، ل ٤٠ ، غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل١٥ . [٣٥]

ژیان ( ڕۆژنامە ) : ژمارە ( ١١ ) ، ١ ی نیسا نی / ١٩٢٦ ، ئەحمەد خواجە ، س . پ ، ل٤١ – ٤٢ ، غەفوورمیرزا کەریم ، س. پ ، ل ١٦ – ١٧ . [٣٦]

ژیان ( ڕۆژنامە ) : ژمارە ( ١١) ، ١ / ٤ / ١٩٢٦ ، ئەحمەد خواجە ، س . پ ، ل ٤٢ ، ٤٣ ، غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل ١٧–١٨ . [٣٧]

(٣٨) ولید حمدی ، س . پ ، ل ٢٠٣ – ٢٠٤ ،ماجد حسن علی ،الحركة الطلابیة الكوردیة فی العراق (١٩٢٦– ١٩٧٠ ) ، رسالة ماجستیر مقدمة الی كلیة الاداب ، جامعة صلاح الدین، اربیل ، ٢٠٠٨ ، ص ٣٢.

(٣٩) ئەحمەدخواجە، س . پ ، ل٣٨.

(٤٠) غەفوور ولیدحمدی ، ،س . پ ، ل٢٠٤.

(٤١) غەفوور میرزاکەریم ، س . پ ، ل٥٦.

(٤٢) میرزا کەریم، س. پ، ل٤١، ٥١.

(٤٣) نەوشیروان مستەفا، س . پ ، ل٢٥١.

(٤٤) غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل ١٦ ، ٢٤ ، ٤١ ، ٤٣ ، ئەحمەد خواجە ، س . پ ، ل ٤٠ .

(٤٥) غەفوورمیرزاکەریم ، س. پ ، ل١١١، مستەفاصالح کەریم ، باخێك لەووشە ، سلێمانی ،٢٠٠٦، ل ١٦٩، ئاکۆ شوانی ، شاری سلێمانی ١٩١٨ – ١٩٣٢.

(٤٦) ژیان ( ڕۆژنامە ) : ژمارە (٥٠٧ ) ، ٢١ / کانونی یەکەمی ١٩٣٦ .

(٤٧) هـ . س ، ژمارە ( ٢٢٤ ) ، ٢١ / ١ / ١٩٢٦ .

(٤٨) عبدالستار طاهر ، م . س ، ص ٩١ .، عبدالفتاح البوتانی ، م . س ، ص ٧٣ ، ولید حمدی ، س . ث ، ل ٢٠٥ ، ١٧٥ .

(٤٩) ولید حمدی ، س . پ، ل ١٧٥ .

(٥٠) د . عثمان علی ، دراسات فی الحركة الكوردیة المعاصرة ( ١٨٣٣ – ١٩٤٦ ) ، ط ١ ، مطبعة الثقافة ، اربیل ، ٢٠٠٣ ، ص ٥٢٥ ، عبدالفتاح البوتانی ، م . س، ص٣.

(٥١) عثمان علی ، م . ن ، ص ٥٢٥ .

(٥٢) د . ئاکۆ عبدالکریم شوانی ، شاری سلێمانی ( ١٩٣٢ – ١٩٤٥ ) ، لێکۆلینەوەیەکی مێژوویيە ، چ ١ ، چاپخانەی تیشك ، سلێمانی ، ٢٠٠٨ ، ل ٢٨ .

(٥٣) هـ . س ، ل ٢٨ ، غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل ٦٥ .

(٥٤) ژیان ( ڕۆژنامە ) : ژمارە ( ٥٠٨ ) ، ٥ / ١ ، ١٩٣٧ .

(٥٥) ئاکۆ شوانی ، شاری سلێمانی ( ١٩٣٢ — ١٩٤٥ ) ، ل ٢٨ .

(٥٦) غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل٦٣ — ٦٤ — ٦٥ .

(٥٧) هـ . س ، ل ٦٦ — ٦٧ .

(٥٨) هـ . س ، ل ٦٨ —٦٩ .

(٥٩) غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل ١١١ ، کریس کۆچێرا ، س . پ، ل١٣٦ ،عیمان علی ، م . س .

(٦٠) عبدالفتاح البوتانی ، م . س ، ص ٧٣ ، عبدالستار طاهر ، م . س ، ص٩١ .

(٦١) ولید حمدی ،س . پ ، ل ٢٠٧ .

(٦٢) ئاکۆ شوانی ، شاری سلێمانی ( ١٩١٨ —١٩٣٢ ) ، ل٢٢١ ، غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل١١٢ .

(٦٣) ژیان ( ڕۆژنامە ) : ژمارە ( ١١ ) ١ / ٤ / ١٩٢٦ ، ( ١٢ ) ١٢ / ٤ / ١٩٢٦ ، ( ١٣ ) ٢٢ / ٤ / ١٩٢٦ .

(٦٤) غەفوور میرزا کەریم ، س . پ ، ل١١١ .

(٦٥) ولید حمدی ، س . پ ، ل١٧٤ ، ١٧٦.

(٦٦) هـ . س ، ل ١٧٥ ، نەوشیروان مستەفا ، س . پ ، ل ٢٥٣ .

(٦٧) عبدالفتاح البوتانی ، م . س ، ص ٧٣ .

(٦٨) هـ . س ، ل ٢٤ ، ئاکۆ شوانی ، شاری سلێمانی ( ١٩١٨ — ١٩٣٢ ) ، ل٢٢٢ .

(٦٩) ولید حمدی ، س . پ ، ل ١٧٢ .

(٧٠) هـ . س ، ل١٧٣ ، نەوشیروان مستەفا ، س . پ ، ل ٢٥١ — ٢٥.

(٧١) عیمان علی ، م . س ، ص٥٢٦ ،.

(٧٢) عبدالفتاح البوتانی ، م . س ، ص ٣٠٢ .

(٧٣) غەفوور میرزا کەریم، س . پ ، ل ١٣٦ — ١٣٧ .

(٧٤) پیرەمێرد : شاعیرێکی ناسراوی کوردە کە ناوی خۆی ( حاجی تۆفیق بەگ ) ە لە سلێمانی لە دایك بووە لە ساڵی ١٩٠٧ ز خزمەتی پێگەیاندنی نەخوێندەوارەکانی کردووە بە ناوی ( زانستی کوردان ) ەوە ، هەر لە سلێمانی لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٠ کۆچی دوایی کردووە .(رەفیق حیلمی ، شعرو ئەدەبیاتی کوردی ، ب١ ، مطبعة التعليم العالي ، اربيل ، ١٩٨٨ ، ل٨١ ) .

(٧٥) مستەفا صالح ، س . پ ، ل ١٦٩ .

(٧٦) ئاکۆ شوانی ، شاری سلێمانی ( ١٩٣٢ – ١٩٤٥ ) ، ل٢٩ .

# لیستی سەرچاوەکان

یەکەم:نامەی زانکۆیی بلاونەکراوە

١–ماجد حسن علي ،الحركه الكلابيه الكورديه في العراق ١٩٢٦–١٩٧٠ ،رساله ماجستير مقدمه الى كليه الآداب ، جامعه صلاح الدين ، أربيل ، ٢٠٠٨ .

دووەم : کتێبەکان

أ– بەزمانی کوردی

١– ئاکۆ عبدالکريم شوانی ، شاری سلێمانی ١٩١٨–١٩٣٢ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسیە ،چ١،سلێمانی ،٢٠٠٢ .

٢–____________ ، شاری سلێمانی ١٩٣٢– ١٩٤٥ ،لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە ، چ١ ، چاپخانەی تیشك ، سلێمانی ، ٢٠٠٨.

٣– ئەحمەد خواجە ، چیم دی ، ب٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٠ .

٤– جعفر علي، ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی ، سلێمانی ، ٢٠٠٤.

٥- دیڤید مەکداول مێژووی هاوچەرخی کورد، و / أبوبکر خۆشناو ،چ١، هەولێر ، ٢٠٠٥.

٦- رۆبرت ئۆلسن ، راپەرینی شێخ سەعیدی پیران ، و / أبوبکر خۆشناو ، سلێمانی ، ١٩٩٩.

٧- رەفیق حیلمی ، یاداشت ، ب٢ ، چاپخانەی رۆشنبیری و لاوان ، هەولێر ،١٩٨٨.

٨- د. سەعدی عوسمان هەروتی، بزافی رزگاریخوازی کوردی ، چ١ ، هەولێر، ٢٠٠٦.

٩-غەفوور میرزا کەریم، تەقەڵلایەکی دڵسۆزانە بۆ لە ناوبردنی نەخوێندەواری لە کوردستاندا ، کۆمەڵەی زانستی لە سلێمانی ، مطبعة دار الجاحظ ، بغداد ، ١٩٥٨ .

١٠- د. فاضل حسین، کێشەی ویلایەتی موسڵ، و/ محمد شاکەلی ، سلێمانی ، ١٩٩٩ .

١١- کریس کۆچێرا ، کورد لە سەدەی نۆزدەو بیستدا و/ حمە کەریم عارف،چ٤ ، هەولێر ، ٢٠٠٧ .

١٢- محمد أمین زکی، محاسەبەی نیابەت ،بغداد ، ١٩٢٨ .

١٣- مستەفا ساڵح کەریم، باخێك لە ووشە، سلێمانی ، ٢٠٠٦ .

١٤- نەوشیروان مستەفا ئەمین، ژیان بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی ١٩٢٦-١٩٣٨ ، چ١ ، سلێمانی ، ٢٠٠٢ .

١٥- ولید حمدی، کوردو کوردستان لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیادا، و/ محمد نوری تۆفیق، چ٢، سلێمانی ، ١٩٩٩.

ب- بە زمانی عەرەبی

١-سروة أسعد صابر، كوردستان الجنوبية ١٩٢٦-١٩٣٩ ، دراسة تأريخية - سياسية ،سليمانية ، ٢٠٠٦ .

٢- عبدالرزاق الحسنی ، تأریخ الوزارات العراقية ، ج٢ ، ط٧ ، بغداد ، ١٩٨٠ .

٣-د. عبدالفتاح علی یحیی بوتانی ،وثائق عن الحركة القومية التحررية الكوردية ، ط١ ، أربيل ، ٢٠٠١ .

٤-عبدالستار طاهر شريف ، الجمعيات والمنظمات والاحزاب الكردية في نصف قرن ١٩٠٨ -١٩٥٨ ، بغداد ، ١٩٨٩ .

٥-د. عوثمان علی ، دراسات في الحركة الكوردية المعاصرة ١٨٣٣- ١٩٤٦ ، ط١ ،مطبعة الثقافة ، أربيل ، ٢٠٠٣ .

٦- لطفی جعفر فرج عبدلله ، عبدالمحسن السعدون دوره في التأريخ العراق المعاصر، ط٢ ، بغداد ، ١٩٨٠ .

٧- نجدة فتحي صفوة ، العراق في الوثائق البريطانية ، ترجمة و تحرير مركز دراسات الخليج العربی ، جامعة البصرة ،١٩٨٣ .

٨- هيوا حميد شريف ، توفيق وه هبی حياته و دوره السياسی والثقافی ، سليمانی ،٢٠٠٦ .

سێ یەم : ڕۆژنامەکان

١- ژیان : ڕۆژنامەیەکی سیاسی ئەدەبیی هەفتانە بوو لە سلێمانی دەردەچوو، ژ.(٨٠)، ١١/٣ / ١٩٢٦ ، (١١) ، ١/٤ / ١٩٢٦ ، (١٢) ، ١٢ / ٤ / ١٩٢٦ ، (١٣ ) ، ٢٢ / ٤ /١٩٢٦ ، (٥٠٧ ) ، ٢١ / کـانونی یەکـەمی ١٩٣٦ ، ( ٢٢٤ ) ، ٢١ / ١ / ١٩٢٦ ، ( ٥٠٨ ) ، ٥ / ١ / ١٩٣٧ .

٢- ژیانەوە : ڕۆژنامەیەکی سیاسی ئەدەبیی و کۆمەڵایەتی بوو ، کە هەفتانە دەردەچوو لە سلێمانی ،ژ. (١٥) ، ١٦/٢/ ١٩٢٥،(٥٠ ) ، ٢٦/ ١١/ ١٩٢٥ ، ( ١٩ ) ، ٣/ ٣ / ١٩٢٥ ، ( ٥٤ ) ، ٢٤/ ١ / ١٩٢٥ ،(٣٠)، ١٠/ ٧ / ١٩٢٥.

# چەند وێستگەیەك لە
# یەكەمین قۆناغی شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١- ١٩٧٠)

مەغدید حاجی

پێشەكی :

شۆڕشی ئەیلولی ڕزگاریخوازی كورد كە لە ١١/٩/ ١٩٦١دا دەستی پێكردووە و یەكەمین قۆناغی تاكو ساڵی ١٩٧٠ بەردەوام بووە، لە ئەنجامی هەڵوێستە نادیموكراسییەكانی حكومەتی بەغدا بەرامبەر بە مافە ڕەواكانی كورد و پەشیمانبوونەوەی عەبدولكەریم قاسم سەرۆكی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لەبەرامبەر جێبەجێكردنی بڕگەی سێیەمی دەستووری كاتی كۆماری عێراق كە تیایدا هاتووە: عەرەب و كورد هاوبەشن لەم نیشتمانەدا..

لێكۆڵینەوە لەم شۆڕشە لە هەموو ڕوویەكەوە بە چەندین باس و نامەی ئەكادیمی كۆتایی نایەت، بەهۆی درێژی ماوەی شۆڕش و ڕووداوە دەوڵەمەندەكانی و سەركردایەتییە شۆڕشگێڕەكەی.

ئێمە لەمیانی ئەم باسەدا كە بۆ سێ بەش دابەشمان كردووە، هەوڵمان داوە چەند تیشكێك بخەینە سەر شۆڕشی ئەیلول بۆ زیاتر ناساندنی نەوەی نوێ بە بەشێكی مێژووی گەلەكەمان. باسەكەی ئێمە بەم شێوەیەی خوارەوە دابەشكراوە:

بەشی یەكەم: هۆیەكانی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول، كە دابەشكراوە بۆ سەر دوو تەوەر.

بەشی دووەم: چەند وێستگەیەكی شۆڕشگێڕانە لە یەكەمین قۆناغی شۆڕشی ئەیلولدا، ئەمیشیان بۆ دوو تەوەر دابەشكراوە.

بەشی سێیەم دانوستانەکانی نێوان سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول وحکومەتەکانی بەغدا، لەم بەشەدا باسمان لە بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦ و ڕێکەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ کردووە، کە خاڵی سەرەکی و گرنگی بریتی یە لە داننان بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان.

بۆ نووسینی ئەم باسە پشتم بە پانزە سەرچاوەی کوردی و عەرەبی بەستووە کە گرنگەکەیان کتێبەکەی کاك مەسعود بارزانییە (بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد)، لە هەردووو کتێبی دیڤید ماکداول (مێژووی هاوچەرخی کورد) و کریس کۆچێرا (کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا).

بەشی یەکەم

تەوەری یەکەم

شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ و کورد (١٩٥٨- ١٩٦١)

دوای تێپەڕبوونی نزیکەی (٣٨) ساڵ بەسەر حوکمی پاشایەتی لە عێراقدا بەرەبەیانی ڕۆژی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ بەشێك لە هێزی سەربازی عێراق، بە ڕابەرایەتی ژمارەیەك لە ئەفسەرانی ئازادیخواز و بە پشتیوانی (بەرەی یەکێتی نیشتمانی) شۆڕش بەرپا بوو، کۆتایی بە فەرمانڕەوایەتی پاشایەتی لە عێراق هێنرا و سیستمی کۆماری ڕاگەیەنرا و زەعیم عەبدولکەریم قاسم وەکو سەرکردەی یەکەمی شۆڕشەکە دەرکەوت.

هەر لە سەرەتادا هێزە دیموکراتخوازەکانی عێراق کە لەبەرەی یەکێتی نیشتمانی لە ساڵی ١٩٥٧دا یەکیان گرتبوو، پاڵپشتی جەماوەریان بۆ شۆڕش خولقاند، پشتگیرییان بۆ داواکارییەکانی گەلی کورد و وەدیهێنانی مافەکانیان لە چوارچێوەی کۆماری عێراق دەربڕی[١].

یەکسەر لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەموز هاوڵاتییەکی کورد بەناوی (خالید نەقشبەندی) کرا بە ئەندامی ئەنجومەنی سەروەری، وەکو دانپێدانانێك بە مافی گەلی کورد لە بەشداریکردن لە دەوڵەتی عێراق.

سەرکردایەتی شۆڕشی ١٤ی تەموز بڕیاری گەڕانەوەی سەرکردەی گەورەی گەلی کورد مەلا مستەفا بارزانی لە یەکێتی سۆڤیەت ڕاگەیاند، و بارزانی لە ٢١/٨/ ١٩٥٨ لە مۆسکۆ بەڕێکەوت و لەڕێگەی گەڕانەوەیدا (لە پراگ) ی پایتەختی (چیك) بروسکەیەکی ئاراستەی عەبدولکەریم قاسم کرد بە بۆنەی سەرکەوتنی شۆڕشی تەموز لەپێناو چارەسەری کێشەی کورد و لە ٢/٩/ ١٩٥٨ سەرکردەی شۆڕش عەبدولکەریم قاسم وەڵامی بروسکەکەی مستەفا بارزانی دایەوە وهیوای خواست کە بە دڵخۆشی بگەڕێتەوە بۆ نیشتمانەکەی، لەپێناو بەشداریکردنی لە بنیاتنانەوەی عێراقی نوێ و هاوخەباتی کورد و عەرەب لە وڵاتەکە[٢].

هەروەها لە دەستووری کاتی عێراقدا، کە لەدوای شۆڕش دەرچوو، دان نرا بە مافی یەکسانی کورد لەگەڵ عەرەبدا لە عێراقدا. ئەوەبوو لە بڕگەی سێی دەستووردا باس لە هاوبەشی کورد و عەرەب کراوە. هەروەها لە بڕگەی (٩)دا هاتووە کە قەوارەی عێراق لەنێوان هەموو هاونیشتمانیان پێکدێت و بە جیاوازی تۆخم و بنەچە و زمان و ئاین و عەقیدە هەموو لەبەرامبەر یاسادا یەکسانن[٣].

پارتی دیموکراتی کوردستان لە کۆبوونەوەی فراوانی کۆمیتەی ناوەندیدا کە لە تشرینی ١٩٥٨دا بەستراوە، بۆ بیروڕا دەربڕین لەسەر کۆماری عێراق، بەیاننامەیەکی دەرکردووە کە تیایدا هاتووە: "گەلی کورد ئامادەیە تا دوا دڵۆپی خوێن بەرگری لە کۆماری دیموکراتی بکات"[٤].

لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٠ پارتی دیموکراتی کوردستان مۆڵەتی یاسایی کارکردنی وەرگرت و لە شەقامی سەعدون لە بەغدا بارەگای کردۆتەوە وهەر لەو بارەگایەدا لە ئایاری ئەو ساڵەدا ١٩٦٠ کۆنگرەی پێنجەمی گرێداوە، کە مەلا مستەفا بارزانی لە بەشێکی کۆنگرە بەشدار بووە. یەکێك لە بڕیارەکانی ئەم کۆنگرەیە بریتیبووە لە: "وەستان لە تەك حکومەتی شۆڕش (حکومەتی عەبدولکەریم قاسم) و بەرگریکردن لە

دەستکەوتە نیشتمانی و دیموکراتییەکانی و بەرپەرچدانەوەی پیلانەکانی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی کە دژی شۆرش دەیانچنی"°.

دوای ماوەیەکی کەم بارگرژی و ناکۆکی لەنێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و مەلا مستەفا بارزانی لەلایەك و لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم و حکومەتی بەغدا پەرەی دەسەند، هەر کە دەستوری کاتی بڵاوکرایەوە ولە برگەی دووەمی دەستووردا هاتووە کە "عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب". پارتی رەخنەی لەم بەندە گرتووە و رۆژنامەی خەبات سەروتارێکی بڵاوکردۆتەوە و تیایدا رەخنەی لەم مادەیە گرتووە و وتوویەتی: "پێویستە بووترێ عێراقی عەرەبی بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب و گەلی کوردیش لە عێراق بەشێکە لەنەتەوەی کورد و کوردستانی عێراقیش بەشێکە لە کوردستانی دایك". ئەم وتارە حکومەتی عێراقی تورە کردووە، هەروەها توخمە شۆڤێنییە عەرەبییەکانی ناو دەسەلات.

رووداوێکی تریش پەیوەندییەکانی نێوان بارزانی و قاسمی زیاتر بەرەو ساردبوونەوە و ئاڵۆزی بردووە، ئەویش بریتی یە لەوەی کە چوار بارزانی لە موسڵ ئەحمەد ئاغای زێبارییان کوشتووە وەکو تۆڵەسەندنەوە، چونکە لەو کاتەی کە بارزانییەکان لە سۆڤیەت بوون ئاغای زێباری باوکی ئەمانی کوشتووە. حکومەت چوار بارزانییەکە دەگرێت و حوکمی توندیان بەسەردا دەردەکات، بەڵام لەکاتی گواستنەوەی چوار بکوژە گیراوەکە لە گرتووخانەی کەرکوك بۆ گرتووخانەی سلێمانی لەرێگادا ئازاد دەکرێن.

دوابەدوای ئەم رووداوە و چەند رووداوێکی تر، حکومەت چەند کارێك ئەنجام دەدات بۆ لاوازکردنی رۆڵ و کاریگەری بارزانی لە کوردستان، ئەویش بەچەکدارکردنی سەرۆك عەشیرەتەکانی دۆستی حکومەت لە هەردوو پارێزگاری هەولێر و موسڵ و هاندانیان بۆ ئەنجامدانی کاری دەستدرێژی بۆسەر بارزانییەکان. ئەمە وای لە پارتی دیموکراتی کوردستان و بارزانی کرد کە وریابن و چەند هەنگاوێك بنێن بۆ خۆپاراستن و کشانەوە لە بەغدا.

هەر لەو بارودۆخە ئاڵۆزەدا (سەدیق میران) دۆستی حکومەت تیرۆرکرا، وا بڵاوکرایەوە لەو کات کە لایەنگرانی بارزانی ئەم کارەیان ئەنجامداوە، بۆیە حکومەت لە بەغدا ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری پارتی و شەمسەدین موفتی پارێزەر و ژمارەیەك لە ئەندامانی لقی پارتی و شەمسەدین موفتی پارێزەر و ژمارەیەك لە ئەندامانی لقی پارتی لە هەولێر دەستگیر کرد و بە تیرۆرکردنی سەدیق میران تۆمەتباری کردن[٦].

بێگومان گرتنی سکرتێری (پ. د. ك) کارێکی چەوت بوو، هەموو ئەندام و لایەنگرانی دژی حکومەت و عەبدولکەریم قاسم وروژاند و زیاتر ساردی خستە نێوان سەرکردایەتی کورد و حکومەتی بەغدا.

سەرەڕای هەوڵەکانی سەرۆك مستەفا بارزانی و پەیوەندیکردنی بە عەبدولکەریم قاسم بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە بەڵام بێ ئەنجامبوو.

لە پاییزی ١٩٦٠دا بارزانی لەگەڵ شاندێك سەفەری مۆسکۆی کرد بۆ پێشکەشکردنی پیرۆزبایی بەبۆنەی یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەر و ماوەی دوو مانگ لە یەکێتی سۆڤیەت ماوەتەوە، کە گەڕاوەتەوە عێراق بینی بارودۆخی ناوخۆ و پەیوەندی نێوان حکومەت و کورد خراپتر بووە، بۆیە ناچاربووە لە بەهاری ١٩٦١ دا بەغدا جێ بهێڵێت و بگەڕێتەوە کوردستان[٧].

هەروەها پارتی وەکو خۆئامادەکردن بۆ ئەگەرەکانی دوا ڕۆژ لەبەر ڕۆشنایی تێکچوونی پەیوەندییەکانی لەگەڵ حکومەت و عەبدولکەریم قاسم لە کۆتایی ساڵی ١٩٦٠ و سەرەتای ١٩٦١دا دەستی کردووە بە پەیداکردنی چەك و تەقەمەنی بەتایبەتی لە ڕێگای کڕین. ڕێکخستنەکانی پارتی لەناوچەکانی شنگال و تەلەعفەر وزمار ڕۆڵی چاکیان بینیووە بۆ کڕینی چەك لە ناوچەکانی سوریا و پەڕاندنەوەیان بە نهێنی بۆ کوردستان. بەڵگەنامەیەکی حکومەت ئاماژەی بۆ (قاسم حسون) ناوێك کردووە کە چەك و سیلاح لە سوریاوە بە نهێنی بۆ ناو عێراق دەگوازێتەوە و پەیوەندی گومانلێکراوانەی هەیە[٨].

کاك مەسعود بارزانی لە کتێبی (بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد)دا لەبارەی بارودۆخی ئەوکاتە نووسیویەتی و دەڵێ: "... بەڵام پەیوەندی نێوان عەبدولکەریم قاسم و پارتی دیموکراتی کوردستان هەر لە ساڵی ١٩٦١ەوە بەجۆرێکی ئێکجار تایبەتی لەپاش گەڕانەوەی بارزانییەوە لە کانونی دووەمی ١٩٦١دا لە سەفەری مۆسکۆ، بەردەوام ڕوو لە خراپی بوو، گومان و دوودڵی عەبدولکەریم لە بارزانی زیادی کردبوو. ساردییەك لەنێوانیان هەبوو. بارزانی هەر کە هاتەوە کەوتە هەوڵدان بۆ دیدار و چاوپێکەوتنی قاسم، بەڵام قاسم بە ئەنقەست گوێی خۆی لێ کەڕ کرد و دەستی دایە خاوە خاوکردن و دەستبەجێ بە دەنگ داواکەی بارزانییەو نەچوو. ماوەیەکی دوورودرێژ بەسەرچوو تا لە شوباتدا چاوی پێی کەوت. بارزانی لەم دیدارەدا هەوڵیدا دڵی قاسم بهێنێتەوە جێ، گومانەکانی برەوێنێتەوە و گەرد بە دڵیەوە نەهێڵێ و دڵنیای بکات کەوا هەرچی گومان لە دڵیدایە هیچی لە جێدا نیە و ئەو و پارتی هیچ نیازێکی خراپیان لەبەرامبەر ئەو نیە، هەرچی بەڵگە و هۆیەکی متمانە پەیداکردنی قاسمی شك برد هەمووی لەگەڵدا بەکارهێنا، بەڵام هیچ دادێکی نەدا و ئەنجامێکی نەبوو. کە مەسەلەکە گەیشتە ئەم ڕادەیە بارزانی ئەوەی بەباش زانی بەغدا بۆماوەیەك جێ بهێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ بارزان. ئەمە لە مانگی ئاداردا بوو"[٩].

ئیتر پەیوەندییەکانی نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و بارزانی لەگەڵ حکومەتەکەی عەبدولکەریم قاسم گەیشتنە قۆناغێکی مەترسیدار. لەلایەك کادیر و ئەندامانی پارتی لە بەندیخانەکان قایم دەکران و ڕۆژنامەی (الثورة) لە دژی پارتی و بارزانی وتار لەدوای وتاری بڵاودەکردەوە، لەملاش سەرکردایەتی کەوتە خۆئامادەکردن و چەککڕین و پەیوەندیکردن لە چاوەڕوانی ئەگەرەکانی ئایندەدا.

لە (٣٠/٧/ ١٩٦١)دا مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان یاداشتنامەیەکی پێشکەش بە سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران لیوا ڕوکن عەبدولکەریم قاسم کرد کە

چەندین خاڵی لەخۆ گرتبوو، بۆ چارەسەری کێشەی کورد و بارگرژی نێوان کورد و بەغدا، بێ ئەنجام بوو. عەبدولکەریم قاسم لەجیاتی چارەسەرکردنی کێشەکان یاداشتەکە نیگەرانی کردووە و هەڵوێستی ئیجابی نەنواندووە. بۆیە ڕۆژی شەشی ئەیلولی ١٩٦١ لە یادی ڕۆژی شەشی ئەیلولی سلێمانی ١٩٣٠ پارتی مانگرتنی گشتی لە کوردستان ڕاگەیاند، و ئەمە ئامادەباشی سیاسی جەماوەری بوو بۆ شۆڕشی ئەیلول کە لە ١١/٩/ ١٩٦١ هەڵگیرسا[١٠].

تەوەری دووەم

لە هۆیەکانی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول :

لە یەکەمین تەوەری باسەکەماندا ئاماژە بۆ پەرەسەندنی بارگرژی نێوان حکومەتەکەی بەغدا و پارتی و بارزانی کرا، بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٦١ کە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامان و کادیرانی پارتی خرانە زیندانەوە. حکومەت لە برگەی (٣)ی دەستوور پەشیمان بووەوە و لەجیاتی جێبەجێ کردنی هاوبەشی کورد و عەرەب لە عێراقدا دەستکرا بە پێشێلکردنی ئازادییەکان و سەرۆك خێڵەکان لەدژی بارزانی و گوێ نەگرت لە داواکارییە ڕەواکانی گەلی کورد کە لە یاداشتنامەکەی تەموزی ١٩٦١ پێشکەش بە عەبدولکەریم قاسم کرا.

هەروەها عەبدولکەریم قاسم "هیچ گوێی نەدایە ئەو ئاگادارییانە و هۆشیارکردنەوەی پارتی کۆمۆنیستی عێراق یەکێتی گەل (اتحاد الشعب) ... بەڵام حکومەتەکەی قاسم ویستی خۆی بسەپێنێت بەهۆی چەك و جگە لەوە خۆپیشاندانێکی سازکرد لەبەردەمی بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان لە بەغدا وخۆپیشاندەرەکان ویستیان بارەگای حیزب داگیر بکەن بەڵام نەیانتوانی لەبەر بەرهەڵستی چەکدارانەی قارەمانانەی پاسەوانەکان و خەڵکانی ناو بارەگا"[١١].

دەبێ لێرەدا هەموو تۆمەتێك نەدرێتە پاڵ عەبدولکەریم قاسم، چونکە کەسانی عەرەبی شۆڤێنی و هەندێ دەوڵەتی شۆڤێنی عەرەب ئەوکات بەتایبەتی سوریا و میسر لەگەڵ ئەوە نەبوون کە خودموختاری بدرێتە کورد و داواکارییەکانی گەلی کورد جێبەجێ بکرێن و وایان لە بن گوێی قاسم دەخوێند کە کورد دەیەوێ لە عێراق جیابێتەوە و بە هاندانی دەرەوە لەدژی شۆڕشی ١٤ی تەموز دەوەستێ. ئەگینا لەدوای شۆڕشی ١٤ی تەموز چەندین هەنگاوی دیموکراسی و ڕۆشنبیری لە بەرژەوەندی گەلانی عێراق و گەلی کورد هەڵنران، هەر لە مادەی ٣ی دەستور ئازادی سیاسی و ڕۆژنامەوانی و ئازادی ڕێکخراوە دیموکراتییەکان و بایەخدان بە خوێندن و ڕۆشنبیری کوردی و بڕیاردان لەسەر چەندین پرۆژەی ئابووری و ستراتیژی.

کاك مەسعود بارزانی ئەوەی خستۆتە ڕوو کە نیگەرانە شۆڕشی کورد لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسم بەرپا بووە و چاکەی عەبدولکەریمی لەبەرچاوە و نووسیوویەتی و دەڵێ: "... لەناخی دڵمەوە ئاواتی ئەوەم دەخواست شۆڕشی ئەیلول لەسەردەمی عەبدولکەریمی قاسمدا هەڵنەگیرسایە، و ئەگەر هەر دەبوو هەڵگیرسێ با یان بەر لە سەردەمی ئەو یان پاش سەردەمی ئەو هەڵگیرسایە. لەوانەیە بخوێنن لێم ببورێ کاتێك دەزانێ ئەم خەیاڵەم لەو هەستەوە هەڵقوڵاوە کە ئێمە چەند قەرزاربارێ پیاوەتی گەورەی ئەم کەسایەتییە مێژوویییەین، مەبەستیشم لە ئێمە تێکڕای گەلی کوردە بەتایبەتیش خێڵی بارزان. ئەو شۆڕشەی ئەم پیاوە لە ١٤ی تەموزی ١٩٥٨دا کردی، بوو بەمایەی لە زیندان ئازادبوونی گەورەمان شێخ ئەحمەد کە یازدە ساڵی تێدا بردە سەر، دادگەی سوپایی عورفی لەپاش شۆڕشی ١٩٤٥ی بارزان حوکمی لەناوبردنی شێخ ئەحمەدی دابوو، لەگەڵ ئەوەش کە بەپێی یاسا ڕاپسپاردبوو حوکمەکەی بۆ بگۆڕدرێ بە زیندانی هەتا هەتایی، ئەم پرسە هەروا مابووەوە. شێخ ئەحمەد پاش ئەوەی وەك هەمووان دەزانن لە ئێرانەوە گەڕابووەوە بۆ عێراق، گیرابوو خرابووە زیندانەوە.

هەروەها حوكمی لەناوبردنی مەلا مستەفا و هەندێ لە هەڤاڵانیشی درابوو بێ ئەوەی خۆیان لە دادگە ئامادە بووبن، بگرە ئەوكاتە ئەوان لە تاراوگە بوون لە یەكێتی سۆڤیەت. پاش شۆڕشی ١٤ی تەموز حوكمەكەی ئەمانیش هەڵوەشێنرایەوە وپوچەڵكرایەوە مەلا مستەفا و هەڤاڵەكانیشی لە تاراوگەوە گەڕانەوە و وەك قارەكان پێشوازییان لێ كرا وهەموو قەدر و حورمەتێكیان لەلایەن ڕژێمی نوێوە لێ گیرا. هەر بە پێ داگرتنی عەبدولكەریم قاسمیش بوو مادەی بەندی سێیەمی دەستووری كاتی دانرا كە لە ٢٨ی تەموزی ئەو ساڵەدا دەرچوو بۆ یەكەمین جار لە مێژووی عێراق و بگرە لەمێژووی كوردستاندا دانی بە هاوبەشی عەرەب و كورد لە یەك نیشتماندا، نا"[١٢].

دیارە سەركردایەتی پارتی دیموكراتی كوردستانیش هەموو لەگەڵ هەڵگیرسانی شەڕ و شۆڕ نەبوون، كریس كۆچێرا نووسیوویەتی و دەڵێ: "جەلال تاڵەبانی لایەنگیری دەستبەجێ شەڕ بوو بەڵام ڕای كەمینەی لەگەڵ بوو"[١٣]. ئیبراهیم ئەحمەدیش (كە زوو لە زیندان ئازادكرا) لەگەڵ جەلال تاڵەبانی دوژمنایەتی قاسمیان دەكرد. ئەم دووانە لەبەرئەوەی قاسم بە كردەوە هەنگاوێكی بۆ وەدیهێنانی ئۆتۆنۆمی و مافە كەلتوورییەكان یان پەرەپێدانی ئابووری كوردستان نەنابوو، هەستیان بە نائومێدی كرد. لەمانگی ئادار (خەبات) ئەو قسانەی تاڵەبانی بڵاوكردەوە كە ناوەڕۆكێكی ناسیۆنالیستی توندییان هەبوو، بۆیە دەستبەجێ داخرا. لە كۆتایی ئادار هیچ گۆڤارێكی كوردی بڵاو نەدەبۆوە. هەندێ لە لقەكانی پارتیش داخرابوون و هێزەكانی سوپا لە كوردستان زۆرتر ببوون.

لە هاوینیش پارتی دیموكراتی كوردستان لەسەر داواكارییەكانی خۆی سوور بوو: بەكارهێنانی زمانی كوردی وەك زمانێكی ڕەسمی، گێڕانەوەی كارمەندانی كورد لە ناوچەكانی عەرەبنشین، درێژەدان بە چاكسازی كشتوكاڵ و پەرەپێدانی پیشەسازی، لەوانە خۆماڵیكردنی نەوت. زۆربەی ئەم داخوازییانە ئەوەندە گوترابوونەوە كە لەلای هەموو ئەو كەسانەی ئاشنای ئەو كاتە بوون ناخۆش بوون. سەرباری پارتی داوای دەكرد

ئەو هێزانەی بۆ بەهێزکردنی هێزە چەکدارەکانی حکومەت بۆ کوردستان نێردرابوون بانگ بکرێنەوە ونەحکامی عورفی کۆتایی پێ بهێنرێ و ئازادییە دیموکراتییەکان بەرقەرار بکرێنەوە وکۆتایی بە خولی گوێزەرەوە بهێنرێ ومادەی ٣ی دەستوور جێبەجێ بکرێ. قاسم گوێی بەم داواکارییانە نەداوە[١٤]. گوێی بە یاداشتنامە ومانگرتنی گشتی ٦ی ئەیلول نەداوە لە هەردوولا هێزی شەڕخواز فتیلی شەڕیان داگیرساند و لەدواییدا بۆ کورد بووبە شۆڕش چونکە وەکو میللەتێکی ماف خوراو داوای مافی ڕەوای خۆی دەکرد و لەپێناو مافی نەتەوایەتی شەڕی دەکرد، بەڵام بۆ حکومەت بوو بە هەڵگیرساندنی شەڕ بۆ سەرکوتکردنی ڕابوونی چەکدارانەی کورد.

بەشی دووەم

تەوەری یەکەم

بلێسەکانی سەرەتای شۆڕش لە یەکەمینساڵیدا

یاداشتنامەکەی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان زیاتر عەدولکەریم قاسمی قەلس کردبوو، چونکە لە یاداشتنامەکەدا ئاماژە بۆ پێشێلکارییەکانی لایەنی حکومەت کرابوو سەبارەت بە مافە ڕەواکانی گەلی کورد، جگەلەوەی چەندین داخوازی ڕەوای تێدا خرابووە ڕوو، لەو کاتەش کە عەبدولکەریم قاسم بەرەو دیکتاتۆرییەت هەنگاوی دەنا و دەستی بە بەربەرەکانێی دۆستەکانی دوێنێی کرد و لەجیاتی بەقسەی دۆستە دڵسۆزەکانی بکات وەکو شیوعییەکان و پارتییەکان و دیموکراتخوازەکان، کەوتبووە ژێر کاریگەری عەرەبی شۆڤێنی و سەرکردە ڕاستڕەوەکانی سوپا و هەندێ لایەنی دەرەکی دژ بە عێراقی دیموکراتی کە بەرژەوەندییان لە بەرپابوونی شەڕدا بوو لەگەڵ دابینکردنی مافەکانی گەلی کورد نەبوون و بێگومان هەوڵی زۆریان داوە تاکو دڵی قاسم لە بارزانی و کورد کرمێ بکەن و تووڕەبوونی قاسم لە بارزانی بگاتە ئەو ڕادەیەی

کە بڕیار بۆ هێزەکانی سوپا دەربکات هێرشی سەربازی و ئاسمانی بکەنە سەر ناوچەی بارزان و دەست لە هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بوەشێنن.

جەلال تاڵەبانی لەبارەی ئەو بارودۆخەوە نووسیوویەتی و دەڵێ: "بزوتنەوەی دیموکراتی گەلی کورد پشتیوانی لە شۆڕشی چواردەی تەموزی عەبدولکەریم قاسم دەکرد تا ئەوکاتەی حکومەتی قاسم ڕێبازی دیموکراتی پەیڕەو دەکرد، بەلام کە قاسم بەرەو دیکتاتۆرییەت چوو ڕووبەڕووی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد بووەوە ولە ئەنجامدا شۆڕشی ئەیلول لە ١١ی ئاداری ١٩٦١ هەلگیرسا"[١٥].

کریس کۆچێرا لەبارەی سەرەتای دەستپێکردنی شەڕی ئەیلولی ١٩٦١دا نووسیوویەتی و دەڵێ: "لە ڕاستیدا حیزبی دیموکراتی کوردستان لە ڕەوتی ڕووداوەکان دوا دەکەوێ، لە مانگی ئەیلولی ١٩٦١ەوە کوردستان لە جموجوڵدا بووە، ژمارەیەك لە سەرانی عەشیرەتەکان بە بێ پرسی حیزبی دیموکرات خۆ سازدەکەن و دەکەونە شەڕ فرۆشتن بە (یەکەکانی سوپای عێراق) ئەگەرچی هەڵوێستی حیزبی دیموکرات سەبارەت بەم بوارە ڕوونە، لێ هیچ ئاشکرا نیە کە هەڵوێستی بارزانی لەم سەرەوبەندەدا چی بووە، ئایا ئەو بۆتە مایەی ئەم هەرا و هەنگمەیە، ئایا لێبڕاوە جڵەوی وەزع حاڵەکە بگرێتە دەستی خۆی و زۆر پرسیاران لەم بارەیەوە هەن کە تاکو ئەمڕۆ بێ وەلام ماونەتەوە". کریس کۆچێرا درێژەی بە نووسینەکەی داوە و دەڵێت: "لەڕاستیدا حیزبی دیموکراتی کوردستان تا هەیڤی ئازاری ١٩٦٢ بەشێوەیەکی جیدی بەشداری شەڕەکان ناکات ڕێبەرانی حیزبی دیموکراتی عێراق، هەرگیز دەربارەی ئەم سیاسەتی سەبر و چاوەڕوانییە کە هەرچییەك بێ سەیرە، ڕوونکردنەوەیەکیان بڵاونەکردۆتەوە"[١٦].

سەرچاوەیەکی دیکەش ئاماژە بۆئەوە دەکات کە "پارتی دیموکراتی کوردستان لە کانوانی یەکەمی ساڵی ١٩٦١ شەڕی لە دژی حکومەت دەست پێکرد.. بەم شێوەیە پارتی دیموکراتی کوردستان چووە پاڵ مەلا مستەفا و ئەو هۆزانەی لەژێر حوکمی ئەودابوون"[١٧].

بەگوێرەی ئەم بۆچوونانەی سەرەوە دەردەکەوێت کە پارتی دیموکراتی کوردستان لە ٩/١١/ ١٩٦١ لەگەڵ دەستپێکردنی شەڕ یان شۆڕش نەبووە، بەڵکو ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێری پارتی لە بەغدا لە وتوێژ بەردەوام بووە، سەرۆك هۆزەکان کە لە دەرچوون و جێبەجێکردنی یاسای چارەسەرکردنی کشتوکاڵ زەرەرمەندبوون و ئێرانیش کاریگەری لەسەر بەشێکیان هەبوو، پێیان باش بووە شەڕ لە دژی حکومەتی عەبدولکەریم قاسم هەڵبگیرسێنن بەڵکو لە ئەنجام حکومەتی بەغدا لاواز دەبێت یان دەڕوخێت و یاسای چارەسەری کشتوکاڵ نامێنێت و ئاغاکان دەگەڕێنەوە سەر ئاغایەتی خۆیان. دیارە بارزانیش لە بەغدا لە عەبدولکەریم قاسم نیگەران بووە و عەبدولکەریم قاسمیش فەرمانی داوە ناوچەی بارزان بۆردومان بکرێت. سەرۆك هۆزەکانیش وایان لە بارزانی گەیاندووە کە پاڵپشتی لە بارزانی دەکەن و بە شەڕ سەر بە عەبدولکەریم شۆڕ دەکەن، بەڵام ئاغاکان تا سەر لەپاڵ بارزانی و شۆڕشی کورد نەمان و کە زانیان ناتوانن بەرگەی هێرشەکانی ڕژێم بگرن باياندايەوە بۆلای ڕژێم و بوون بە جاش. تەنیا لە کۆتایی پارتی دیموکراتی کوردستان لەگەڵ بارزانی دەنگ و بڕیاریان دەکەن بە یەك و درێژە بە مقاوەمەت دەدەن و بزوتنەوە یاخیبوونەکان دەبن بە شۆڕش.

بەرپابوونی شۆڕشی (١١ی ئەیلولی ١٩٦١) هەروەکو کاك مەسعود بارزانی دەیگێڕێتەوە: "هەموو بیروڕاکان لەوەدا هاودەنگ بوون کە ١١ی ئەیلولی ١٩٦١ سەرەتای شۆڕشی مەزن بوو. لەم ڕۆژەدابوو دەسەڵاتی عێراقی دەستی دایە بۆمبارانکردنی لە ئاسمانەوەی خڕبوونەوەکانی شۆڕشگێڕان لە دەربەندی بازیان و دۆڵی خەلەکان و دەورووشتی دەوك. ئەوجا هێزی پیادەش کە قاسم ناردبووی، هێرشێکی ڕاماڵکەری بەمەستی کردنەوەی ڕێگەی نێوان هەردوو شاری کەرکوك و سلێمانی هێنا. بەڵام هێزی شۆڕشگێڕان نە هیچ بەربەرەکانێی کرد و نە هیچ پەلامارێکی ئەوتۆی بزوتنەوەکەی لەشکری حکومەتی دا کە شایانی باس بێت. خێڵە چەکدارە خڕبووەکان هەموو بڵاوەیان لێکرد و بێ ڕەنجکێشانێکی ئەوتۆ ڕێگەی نێوان کەرکوك – سلێمانی کرایەوە. لەناوچەی هەولێریش جەنگاوەرە پارتییەکان (پێشمەرگە) کە هەواڵی ئەوەیان

گەیشتنێ کە لە ناوچەی سلێمانی ڕوویدابوو، وایان بەباشزانی بگوێزنەوە بۆ چیای سەفین، ئەمانە هەمووی بەسەرکردایەتی مەحمود کاوانی و حەمید کاوانی و خورشید کاوانی و ڕەسوول فەقێ گەڕۆتەیی ومیرکەی خەیلانی بوون (کە ئەمەی دواییان سەرۆك خێڵ بوو)، لەڕووی حیزبایەتیشەوە بەرپرسی ئەمانە بە پارێزەر شەمسەدین موفتی سپێردرابوو، دوای ئەوەش کە شەمەدین لە سەفین گوێزرایەوە، مەحمود کاوانی سەرکردایەتی گشتی بە یارمەتیدەری خورشید شێرە گرتە ئەستۆ.

لە دهۆکیش هێزی حیزبی و گەلێرییەکان هێرشیان بردە سەر زاخۆ و ئازادیان کرد، بەڵام زۆر بەدەستی شۆڕشگێڕەکانەوە نەمایەوە لێی کشانەوە و هێزەکانی حکومەت خستیانەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. لە دهۆکیش هەروەك چۆن لە سلێمانی ڕوویدا تەنیا کەمێك لە هێزە ڕێك و پێکە حیزبییەکان نەبێت هێزی خێڵەکان هەموو بڵاوەیان لێکرد و هێزە حیزبییەکەش پەنایان بردەبەر دۆڵ و دەرەی ناو چیاکانی دەوروبەر"[١٨١].

دواتر شەڕی گەورەی بارزان ڕوویدا و حکومەت ناوچەی بارزان و چەندین ناوچەی تری بە فڕۆکە بۆردومان کرد. هەر لە سەرەتادا بەتایبەتی دوای ئەوەی کۆمیتەی ناوەندیی پارتی و کادیرەکانی پارتی بە فراوانی چوونە شاخ و پاڵ شۆڕش پەیتا پەیتا ئەندام و لایەنگرانی پارتی لە لاوانی قوتابی، سەرباز، کرێکار، پۆلیس، مامۆستا، بێکار و جووتیار دەچوونە پاڵ شۆڕش و بە تفەنگی برنۆ و نانەڕەقە چەندین داستانی گەورەیان تۆمارکرد و درێژەیان بە شۆڕش دا. ڕۆڵی پۆلیسانی کورد لە چوونە ناو شۆڕشەوە بە چەکەوە زیاتر مایەی ئاماژە بۆکردنە.

تەوەری دووەم

سێ نموونە لە داستانەکانی پێشمەرگە (١٩٦١- ١٩٧٠)

چەند وتەیەکی پێویست :

جیاوازی لەنێوان هێزی چەکداری میللەتێك کەلەسەر خاکی خۆی بەرگری دەکات و داوای مافی ڕەوای خۆی دەکات لەگەڵ هێزی پەلاماردەر و دەستدرێژکاری داگیرکەر،

هێزی دەوڵەت بە هەموو ئیمکانیاتییەوە دەبێت چەند فراوان بێت؟ بێگومان بیروباوەڕ خاڵی سەرەکییە و داینەمۆی جوڵانەوە و شۆڕشە. ئەو گەنجە کوردە کە دەبینێ خاکی داگیرکراوە، داگیرکەر لە نەتەوەیەکی جیایە و هاتووە بە زەبری سەرکوتکەرانەی دەسەلات زوڵمی لێدەکات کە دەبینێ هەموویان زۆربەی نەتەوەکانی دونیا خاوەن دەسەلاتی خۆیانن و کوردیش بندەست و داگیرکراوە، بێگومان ئەم گەنجە کە هەستی نەتەوەیی و بیروباوەڕ پاڵی پێوەدەنێت ژیانی شار و خۆشییەکانی ناومال جێ بهێڵێ و چەکی بەرگری بکاتە شان بۆ پارێزگاری لە خاك و وەدەستهێنانی مافەکانی گەلەکەی ئەم گەنجە دەبێتە پێشمەرگەیەکی ئازا و تا دوا هەناسەی مقاوەمەت دەکات، لەبەرامبەریشدا گەنجێکی عەرەب یان هەر نەتەوەیەکی تر بە خورتی کراوە بە سەرباز و لە دوور هاتۆتە سەر هەرێمێکی جیاواز و بەفەرمانی سەرکردەکانی دەبێت شەڕ بکات. بێگومان تەنیا وەکو ئامێرێك و لەترسان بێ بیروباوەڕ شەڕ دەکات تاکو دەبێە قوربانی. ئەم جیاوازییە بوو وایدەکرد کە ژمارەیەکی کەم پەلێکی پێشمەرگە بە چیا و دۆڵەکانی کوردستان بتوانێت هێزێکی گەورەی حکومەت ببەزێنێت و زیانی ماڵی و گیانی پێ بگەیەنێت. نموونەی ئەو شەڕ و مقاوەمەتە سەرفرازانەی هێزی پێشمەگەی کودستان زۆرن کە دەبوونە جێگەی خۆشحاڵی میللەت و سەرسوڕمانی دوژمن و زۆرکەس لەوانەی موتابەعەی باروٚدخی کوردستانیان دەکرد لە ساڵانی شۆڕشی ئەیلولدا.

چەکی پێشمەرگە بەزۆری بڕنەو و تفەنگی ئینگلیزی و دواتر کلاشینکۆف و ڕەشاش بڕێن و سەمینۆف. ئینجا بە پشت بەستن بەخۆیان فێربوون تۆپی بچووك و نارنجۆك دروست بکەن. هەروەها دواتر لەئەنجامی سەرکەوتنەکانیاندا بەسەر هێزەکانی دوژمن توانیان دەست بەسەر زۆر چەکی نوێی دوژمندا بگرن وەکو سیمینۆف، کلاشینکۆف و جۆرەها چەکی ڕیزی نوێ و هەروەها کەرەستەی وەکو بێتەل و ..هتد.

موچە یان یارمەتی پێشمەرگە مانگانە سەرەتا لە چەند دینارێکی کەمی سویسری زیاتر نەبووە، بەرەبەری ساڵی ١٩٧٠ کە بارودۆخی پێشمەرگە باش بووە یارمەتی پێشمەرگە گەیشتۆتە پێنج دینار. خواردنی پێشمەرگە بەزۆری نانە ڕەقە و چێشتییان بەزۆری ساوار، جل و بەرگی خاکییان سادە و بەلام بیروباوەڕییان پۆلایین و دلێر و چاوتێر و ورە بەرز و هەموو گەل بەتایبەتی کەس و کاریان شانازییان پێوەدەکردن.

شەڕەکانی پێشمەرگە زۆرن بەلام وەکو نموونە ئاماژە بە چەند شەڕێك یان داستانێك دەکەین:

### شەڕی زاوێتە ١٩٦١

لە ١٠ی کانونی یەکەمی ١٩٦١دا ناحیەی سەرسەنگ لە چنگی هێزەکانی حکومەت ئازادکا و دەستییان بەسەر دۆلی زاوێتەدا گرت، کە دەڕوانێ بەسەر دهۆکدا. کە ئەوە ڕوویدا حکومەتیش هێزەکانی خۆی بەمەبەستی هێرشێکی بەربلاو بۆ کردنەوەی ڕێگەی سەرسەنگ و گرتنەوەی خڕ کردەوە. لە ١٢ی کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٦١دا دوو فەوجی سەر بە لیوای یەکەمی پۆلیس و فەوجی سێیەمی لیوای یازدەهەمی سوپا بەسەرکردایەتی عەقید بەشیر ئیبراهیم بەرەوپێش ملیان نا، تا هێزە وەڕێکەوتووەکە گەیشتە ناوەڕاستی دۆڵەکە، پێشمەرگە خۆیان گرت و هیچ تەقەیان لێوە نەهات. لەو کاتەدا کە ئەوان گەیشتنە جێ پێشمەرگە لەمبەر و لەوبەری ڕێگەوە دەستیان کرد بە تەقە. ڕێکردنی سوپا بەو شێوەیە بوو کۆمەڵێك بۆ خۆیان کەوتبنەڕێ، نە پەرژینێکیان بۆخۆیان دانابوو نە پارێزگارییەك کە بەپێی داب و نەریتی سوپایی لە ئاگری بەرامبەریان بپارێزێ. هیچ بەخەیاڵیاندا نەهاتبوو کەوا گەلی زاوێتە کەوتۆتە دەستی شۆڕشگێڕان. شەڕەکە شەڕی نەبوو بە واتای ناسراوی سەربازی، بگرە قەسابخانەیەك بوو. ئەم سێ فەوجە هەموو کەوتنە ناو بۆسەیەکی پتەوەوە و کەمێکیان نەبێ کەسیان لێ دەرباز نەبوو. و لە بنەوەش ئەنجامی ئەو شەڕە پیشان دەدەین:

- ٦٠٠ کوژراو (بەشی زۆری کوژراوەکان لە پیاوانی سوپا بوون).
- ٥٠٠ بەدیلگیراو (بەشی زۆری دیلەکان پۆلیس بوون).
- ٧٦ ئۆتۆمبێل کە هەموو سوتێنران.
- ١٥٠٠ پارچە چەك کە لە مەیدانی شەڕدا کۆکرانەوە وهەموو تفەنگی سیمینۆف و کلاشینکۆف و تفەنگی ئینگلیزی بوون.
- ئەندازەیەکی گەلێ زۆر فیشەك و تەقەمەنی گیرا.
- لە شۆڕشگێڕانیش ٦ پێشمەرگە شەهید کران و ١٩ کەسیش بریندار بوون[١٩].

داستانی هەندرێن ١٩٦٦

ئەگەر شەڕی زاوێتە کە لە ساڵی یەکەمی شۆڕشی ئەیلولدا ڕوویداوە نموونەی ئازایەتی و قارەمانێتی شۆڕشگێڕەکانی بادینان بێت، ئەوا داستانی هەندرێن کە لە ساڵی ١٩٦٦ ڕوویداوە و کەوتۆتە ناو لاپەڕە گەشەکانی مێژووی مقاوەمەتی کورد، مێژووی هاوپەیمانێتی شۆڕشگێڕانەی نێوان حیزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی کوردستان بەسەرکردایەتی مستەفا بارزانی یەکەمین سەرکردەی شۆڕشی ئەیلول هەر لە زاخۆوە تاکو خانەقین، دەنوێنێ.

چیای هەندرێن شوێنێکی ستراتیژییە لەنێوان ڕەواندز و گەلاڵە، لە جندییان بەسەرەوە ناوچەی ئازادکراو بوون، سوپای عێراق زۆر هەوڵی دەدا لە یەك کاتدا دەست بەسەر هەردوو چیای زۆزك و هەندرێندا بگرێت کە بەرامبەر بە یەکن و دۆڵێکی گەورە لە یەکتریان جیا دەکاتەوە وڕێگای هاملتۆنیش بەناو ئەم دۆڵەدا دەڕوات تاکو حاجی ئۆمەران و سنووری ئێران.

لەچیای زۆزك هێزی پێشمەرگە بەرگری پاڵەوانانەی کرد و لەیەك کاتدا ڕووبەڕووی هێزی ئاسمانی و تۆپباران و هێرشی سەربازی دەبوونەوە وتوانیان بەرگری لەم چیا

سەرکەشە بکەن و چەند هێزێکی پێشمەرگە لە دەشتی هەولێر وخۆشناوەتی لەتەك هێزی بارزان و پێشمەرگەی ناوچەکە بەخوێن زۆزکیان پاراست. ئا لەم کاتەدا کە هەڤالآن لە زۆزك مقاوەمەتیان دەکرد هاوڕێیان لە هەندرێن دەرسێکیان دایە دوژمن کە هەرگیز لەبیری نەکات و بوو بە وەرچەرخان لە مێژووی شۆڕش.

لێرەدا بە پشت بەستن بە کتێبەکەی کاك مەسعود بارزانی و زراری سلێمان بەگ کە پێشمەرگەیەکی هەندرێن بووە بەکورتی تیشك دەخەمە سەر ئەو داستانە:

نەخشەی داگیرکردنی هەندرێن و زۆزك لەلایەن هێزەکانی سوپای عێراق "لەچەندین کردەوەگەلی سەربازی بەربڵاو و بەڕاستی پڕ مەترسی گەورە گەورە بۆسەر پاشەڕۆژی شۆڕش، پێکهاتبوو ئامانجی ئەم نەخشەیە داگیرکردنی بارەگاکانی سەرکردایەتی شۆڕش بوو لەناوچەی سەختی باڵەك و پاشان کەرتکردنی کوردستانی ئازادکراو بوو بۆ دوو کەرت و بڕینی پەیوەندی هەردوو کەرتەکە بەیەکەوە. جا لەبەرئەوەش کە هەردوو چیای هەندرێن و زۆزك بەسەر دەروازەی ڕێگەی هاملتۆندا دەڕوانن کە ناوچەی باڵەك دەبڕێ، هێزەکانی حکومەت قورسایی هێرشەکانی خۆیانیان خستە سەر ئەم چیایە.

شەوی ٣/٢ی ئاياری ١٩٦٦ هێرشی ڕژێم بەم جۆرەی خوارەوە دەستی پێکرد :

١- لیوای چوار پێشکەوت بۆ دەستگرتن بەسەر چیای هەندرێن، لیوای یەك بە کشان بۆسەر نبەکاول و دۆڵی ئاکۆیان یارمەتی دەدا.

٢- لیوای سێ بەیارمەتی لیوای چواردە بەرەو زۆزك پێشکەوت.

٣- بەشی زۆری جاشەکان لە هەڵمەتدا بۆسەر زۆزك بەشداربوون، تۆپخانە و باڵەفڕە و کورەی ئاگریان بەسەر پێشمەرگەدا دادەڕشت، لەچیای هەندرێن دوژمن هیچ بەرگرییەکی ئەوتۆی لەکاتی بەسەرکەوتنندا لەڕێی خۆیدا نەدی و چەند شوێنێکی گرنگی لە نزیکی لوتکەی چیاکەوە داگیرکرد. ئەرکی هەرە گەورەش لە داکۆکی کردن لە هەندرێن لە ئەستۆی یەکە لەشکرییەکانی حیزبی شیوعیدا بوو[٢٠].

رۆژی ١/٥/ ١٩٦٦ ژمارەیەك لە فەرماندەكانی پێشمەرگەی حیزبی شیوعی و پێشمەرگەكانی هەندرێن لە دەربەندی ڕایات داوەت بوون بۆ بەشداربوون لە ژنگواستنەوە بۆ ملازم ڕیاز كە پێشمەرگەیەكی ئازای عەرەب بوو، لە شەڕی كۆرەكیش ١٩٦٣ چاوێكی لەدەستدا بوو، هەروەها لە دەربەند یادی یەكی ئایاریشیان كردۆتەوە. دوژمن كە زانیوویەتی زۆر لە پێشمەرگە و سەركردەكانی هەندرێن دابەزیوون بە دەرفەتی زانیووە و ئەم هێرشەی ئەنجامداوە و سەری هەندرێنی داگیركرد، لەهەمان كاتدا هێرشیان بۆسەر چیای زۆزكیش بردووە بە مەبەستی ستراتیژییان هەروەك لە پێشەو ئاماژەمان بۆ كردووە.

سەركردە و پیشمەرگەكانی حیزبی شیوعی لەگەڵ عیزەتی سلێمان بەگ كە بەرپرسی هێزی پێشمەرگەی دەرگەڵە بووە لەگەڵ شیوعییەكان بەیەكەوە هەندرێن و ناوچەكەیان دەپاراست، كە بە داگیركردنی هەندرێنیان زانیووە بەخێرایی بروسكە گەڕاونەتەوە و بڕیاری شەڕی مان و نەمانیان داوە بۆ ڕزگاركردنی هەندرێن و شكستپێهێنانی هێزی دوژمن. پێشمەرگەكانی حیزبی شیوعی و هێزی سلێمان بەگی دەرگەڵە كە سەر بە بارەگای بارزانی بوون زوو سەركەوتن و چوونە پاڵ ئەو پێشمەرگانەی لەسەر چیا ڕووبەڕووی سوپای دوژمن لە بەرگریدا بوون. بەرگری بەهێزتر بوو، كاك ئیدریس بارزانیش لەناوچەكە ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی ئامادەباشی كردووە بۆ ڕزگاركردنی هەندرێن و زۆزك.

زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی لە كتێبی بیرەوەرییەكانیدا بەناوی (بیرەوەریەكانم) نووسیوویەتی و دەڵێ: "ڕۆژی ٩/٥/ ١٩٦٦ دوای نیوەڕۆ لەسەر (بیرۆكا) یەكەم كۆبوونەوەی هاوبەشی لێپرسراوانی ئەو هێزانەی ڕووبەڕووی دوژمنن لە هەندرێن بەسترا، ئەوانەی بەشداربوون لەو كۆبوونەوەیەدا لەلایەنی حیزبی شیوعی بریتی بوون لە (فاخیر حمد ئاغا، ڕەئیس كمال نعمان، صدیق عولاغا، حاجی مەلا سەعید، عەریف یونس، مام

ئەلیاس)، دەبوایە ملازم عەبدولڕەحمانیش ئامادەبێت.. ئێمەیش: (عیزەت سلێمان بەگ، حمد ئەمین فەقێ حسن، خدر عەبدوڵا بەگ، سید مستەفا، زرار سلێمان بەگ).
مەبەست لە گرێدانی ئەو کۆبوونەوەیە ئەوەبوو کە نەخشەیەك دابنرێت بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی سوپا و دەرکردنیان لە (هەندرێن). هێرشکردنیکی ئاوها پێویستی بە زۆر شت هەبوو، بەڵام کە نەبوو چار نەما تەنها خۆبەختکردن تاکە چارەبوو. ئەو خاڵانەی کە لە کۆبونەوەکە خرانە بەرباس و لێکۆڵینەوە، ئەمانە بوون:

١- شێوەی هێرشبردن بۆ سەر سەنگەرەکانی دوژمن.
٢- دەستنیشانکردنی خۆبەختکەران و ژمارەیان.
٣- ئەرکی هێرشبەرەکان.
٤- دیاریکردنی هێرش بە شەو بێت یان بە ڕۆژ.
٥- بەدەستهێنانی دەستکەوت.

لەدوای گفتوگۆیەکی تێر و تەسەل بڕیارەکان بەم شێوەیە دران:

١- دیاریکردنی شوێنی ئەو دوو هاوەنەی هەمان بوون و ئامادەکردنیان بۆ کاتی هێرشبردن.
٢- بڕیاردرا هێرشەکە بەڕۆژ بێت لەکاتی نیوەڕۆ، چونکە ئەوکاتە دوژمن بیر لە هێرش ناکاتەوە.
٣- دەستەی خۆبەختکەران پەنجا کەس دەبن (٢٥) لەئێمە و (٢٥)یش لە هاوڕێیانی حیزبی شیوعی، سەد پێشمەرگەی تریش پاڵپشت دەبن بۆ ئەو شوێنانەی کە دەگیرێن یەکسەر ئەوان بچنە ئەو شوێنە و بریندار و شەهیدیش ئەوان دەیان گوازنەوە شوێنی دیاریکراو.
٤- ئەرکی هێرشبەران ئەوە دەبێت لەو شوێنانە بدەن کە دەزانن هەڵناستن و شەڕدەکەن، لێدراوانی خۆشمان بەجێ بهێڵن بۆ ئەو هێزی پشتیوانەی کە لەدوایان دەڕۆن.

٥- دەستکەوت بەپێی بڕیاری شۆڕش چەکی گرتن بۆ شۆڕشە و چەکی سوکیش بۆ ئەوانەیە کە دەیگرن لەگەڵ کەل و پەلی وردە.

٦- ئاگاداری ملازم عەبدولڕەحمان و عوسمانی حوجرانی بکرێت لەکاتی هێرش عەدولڕەحمان لەلای گەلی (حاسلاً) ڕێگایان نەدات بگەڕێنەوە، وە لەلای (بنەکاول)یش عوسمان ڕێگایان لێ بگرێت بۆئەوەی دەرباز نەبێ بگەڕێنەوە حامیيە.

تاریك داکەوت کۆبوونەوەکە کۆتایی هات و بڕیاردرا بەیانیش لە هەمان شوێن دابنشین لە کاتژمێر دووی دوا نیوەڕۆ بۆ تەواوکردنی کارەکان لە ڕێکەوتی ١٠/٥ لەکاتی دیاریکراو لەهەمان شوێن بەیەکگەیشتینەوە و دەستکرا بە کاروبارەکان"[٢١].

دوای چەند کۆبوونەوەیەك و دانانی پلانێکی تۆکمەی شۆڕشگێڕانە هێرشی بەرامبەری کەم وێنەی پێشمەرگە ڕۆژی ١٢/٥/ ١٩٦٦ سەعات چواری ئێوارە دەستی پێکردووە. لە وەسفی ئەو ڕۆژە و ئەو شەڕەدا کاك مەسعود بارزانی دەڵێ: "ڕۆژی ١٢ی ئایار هێزی پێشمەرگە داستانێکیان لە نازدارترین داستانەکانی گەلی کورد لە هەموو مێژوویدا تۆمارکرد. ئەو داستانەی ئەو ڕۆژە، نموونەیەکی میسالی کەم وێنەی هاوکاری پتەو و هاوئاوازەیی تەواوی نێوان هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و حیزبی شیوعی عێراق بوو، نموونەی ئەوەبوو کە دەبێ برایەتی ڕاستەقینەی کورد و عەرەب وابێ. ژمارەیەك لەو ئەفسەر و جەنگاوەرانەی لەو شەڕەدا بەشدار بوون عارەب بوون و لەگەڵ برا کوردەکانیاندا داکۆکییان لە کوردستان دەکرد و بەشێکی مایەی سەربەرزییان لە ڕزگارکردنی ناوچەکەدا هەبوو. لەناو ئەوانەدا بەتایبەت ناوی ڕائید کەمال نوعمان و ملازم نوعمان عەلوان دەهێنم کە لە شۆڕشدا بە ملازم خدر ناوی دەرکردبوو.

لەم شەڕەدا چوار پێشمەرگە شەهید کران[٢٢] و ژمارەیەکی تریش برینداركران. داستانی هەندرێن بارودۆخی سیاسی و سوپایی سەروبن کردەوە وکارێکی بەو کۆمەڵە دڵ لە کورد پڕ لەکینەی ناو دەسەڵات بەدەستان کرد کە لە شەرمەزاریدا سەریان شۆڕکەن، ئیتر لەوەوپاش ورتەیان لێ نەدەبیسترا[٢٣].

لێدانی نەوتی کەرکوك (بابەگورگوڕ) ١٩٦٩

ئـەم کـردەوە شۆڕشـگێڕانەیە ئەڵقەیـەکی تـرە لـە زنجـیرە داسـتان و ڕووداوە کاریگـەرەکانی شۆڕشـی ئـەیلول و کـاك مەسـعود بـارزانی لـە کتێبەکەیـدا بـەم جـۆرەی خوارەوە باسی کردووە:

"... ئـەرکی سـەرکردایەتی کردنـی ئـەم کردەوەگەلـە بـە محەمـەد مـەحمود عەبـدولڕەحمان (سـامی) سـپێردرا. فـاخر مێرگـە سـۆری و فـارس بـاوە و حەمەسـوور حوسـێن و عیـزەدین قـەرە محەمـەد و عـەریف دەروێـش و کـادیری حیزبایـەتی قـادری جەباریش یارمەتی بدەن.

پـاش لێکۆڵینەوەیـەکی بـەربڵاو نەخـشەیەکی تـەواو دانـرا و دەرکـەوت کـە دەبـێ نیـشانەی سـەرەکی (کارگـەی تـەرکین) بـێ کـە نـەوت لـە هـەموو چـاڵە نەوتەکانـەوە کردەکرێتـەوە دوای تێپـەڕینی بـە ئێستگەکانی گـازی لێ جوێکردنـەوە. ئـەم کارگەیـە هەمیشە کاردەکات. ئەمـە سـەرای کۆمەڵگـەی بـەربڵاو و هـەراوی کۆگـەکانی نـەوت کـە دراوسێی کارگەی تەرکیزە و لەوێوە نەوتەکە ئامادە دەبێت بۆ پاڵدان.

تۆپی هاوەنی ١٢٠ و تۆپی بێ گەڕانەوەی (عدیمە الارتداد) ١٠٦ دەستنیشانکران بـۆ لێدانی کۆمپانیـا، بـەڵام زیـاتر پـشت بـە تـۆپی ١٠٦ بەسـترا، چـونکە گوللـە تۆپـەکانی سوتێنەکن و دەشسمن.. لەگەڵ تەواکردنی خۆئامادەکردندا بـۆ دەسـتپێکردنی کـردەوە گەلەکە لە ٢٥ی شوباتی ١٩٦٩دا و بـۆ داپۆشـین و شـاردنەوەی دەزگـای ئیـستیخباراتی شۆڕش بەشێوەی تایبەتی خۆی، هەواڵێکی بڵاوکردەوە کە گوایە هێزەکـانی شـۆڕش بـە دەسـتیانەوەیە کردەوەگـەلێکی بـەربڵاو لـە دەشـتی هـەولێردا بکـەن. مەبەسـت لەمـە ئەوەبوو کە سەرنجی حکومـەت ڕاکێـشرێ بـۆ ئـەو بەرەیـە و زۆرتـرین پارچـەی سـوپای حکومـەت لـە ناوچـەی هـەولێردا کۆبکرێتـەوە، بۆنموونـە فـەوجێك لـە ڕێـدار هـەبوو سەرچاوەیەکی سەرەکی دڵەکوتە بوو بۆ پێشمەرگە و دەیتوانی کردەوەگەلەکە بە هیچ

دەرکا. بەم واتە واتە ئەو فەوجە گوێزرایەوە بۆ دەشتی هەولێر و بەم جۆرە ڕێگەی هێرشەکە ترسی لەسەر نەما.

شەوی ١–٢ی ئاداری ١٩٦٩ هێزەکانی پێشمەرگە گەیشتنە ئەو جێیانەی بۆیان دیاری و دەستنیشان کرابوون لە نەخشەکەدا، کارەکان بە وردی و ڕێکوپێکی کران و بەشی زۆریان لە جێی خۆیاندا جێگیر بوون. سەعات نۆی شەو تۆپەکان دەستیانکرد بە لێدانی دامەزراوەکانی کۆمپانیا، و لێدان دوو سەعات درێژەی کێشا و بڵێسەی گەورەی ئاگر لە کارگەی تەرکیزەوە گەیشتە کەشکەلانی فەلەك، داکۆکیکەرانی کۆمپانیا شڵەژانێکی گەورەیان تێکەوت و هەموو سەرسام بوون. لەسەرەتادا لایان وابوو دامەزراوەکانی کۆمپانیا بوون بە نیشانەی بۆمبارانێکی ئاسمانی، پاشان تێگەیشتن کەوا لە زەوییەوە لێیان دەدرێ.

پاش ئەوەی کردەوەگەلەکە تەواوبوو حکومەت هەندێ باڵەفڕی نارد، بەڵام نەیانتوانی هێرشی هاوردووەکان بدۆزنەوە. سەعات ١١ بروسکەیەك لە محەمەد مەحمود (سامی)یەو هات وای دەگەیاند کردەوەگەلەکە بە سەرکەوتوویێکی تەواو تەواوبووە. ئیشارەتی کردەوە گەلەکە'ووشەی (ڕووبار) بوو.

ئەوە یەکەمجاربوو کردەوەگەلێکی وا بوێرانە بکەین. ئامانج لەو کردەوەگەلە ئەوەبوو نامەیەکی ئاشکرامان نارد بۆ ڕژێم زیاتر لەوە کە زیانی مایەکی پێ بگەیەنین. نامەیەکی ئاشکرامان نارد بۆ ڕژێم کەوا شۆڕشی کورد دەتوانێ دەستی خۆی بگەیەنێتە گەورەترین سەرچاوەی ئابووری ژیواری پشت پێ بەستراو.

ئەم کردەوەگەلەی کردمان تا ماوەیەکی درێژ کەرەستەیەك بوو بەدەست ڕاگەیاندنی بیانییەوە- لێی دەدوان و لەسەریان دەنووسی، پاڵی بە هەندێ لایەنی درەوە نا چاو بە هەڵوێستی سیاسی خۆیاندا لە ئاست ڕژێم و لە شۆڕشەکەی ئێمەش بگێڕنەوە"[٢٤١].

بەشی سێیەم

دوو نموونە لە دانوستانەکانی نێوان بەغدا و شۆڕشی کورد

بەیاننامەی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦

دوا بەدوای داستانی هەندرێن بۆ حکومەتی بەغدا دەرکەوت کە زۆر لەوە لاوازترە بە شەڕ و هێرشبردن بتوانێ زەفەر بە هێزی پێشمەرگە ببات بۆیە داوای شەڕ ڕاگرتن و دانوستانیان لە سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول کرد.

حکومەتی عێراق لەگەڵ بارزانیدا دەکەوێتە گفتوگۆ: لە ١٩٦٦/٦/١٣دا شاندێکی کوردی بەسەرۆکایەتی حەبیب محەمەد کەریم سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستان و ئەندامێتی ساڵح یوسفی و موحسین دزەیی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بۆ بەغدا دەچێت و لەلایەن جەنەراڵ عەبدولڕەحمان عارفەوە کە لەدوای عەبدولسەلامی برای بووە بە سەرکۆمار پێشوازی دەکرێ.

(کریس کۆچێرا) نووسیوویەتی و دەڵێ: "گفتوگۆیەکە بەشێوەیەکی غەریب دەستپێدکات، حەبیب کەریم دەڵێ: "لەگەڵ جەنەراڵ عارفدا کە کەسایەتییەکی لاوازبوو، جگە لەهەندێ گفتوگۆی گشتی قسەیەکی دیمان نەکرد. "بۆچی لەگەڵ یەکدا شەڕ دەکەین؟ ئێمە هەردوو لامان موسوڵمانین، موسوڵمان برانە، ئیدی کوردبن یان عەرەب، ئێمە چ ناکۆکییەکمان لەبەیندا نیە".

گفتوگۆی ڕاستەقینە لەگەڵ عەبدولڕەحمان بەزازی سەرۆك وەزیران بوو، کە لە زانستگا مامۆستای حەبیب کەریم بوو، گفتوگۆیەکە لە کەش و هەوایەکی گەرم و دۆستانەدا ئەنجامدارا. پاشان نوێنەرانی بنەماڵەی بارزانی داوا لە دکتۆر بەزاز دەکەن کە بە ڕەسمی ئۆتۆنۆمی کوردان ڕابگەیەنێت، بەڵام دکتۆر بەزاز ڕازی نابێت و دەڵێت سوپا بەمە قایل نابێت و پەنا وەبەر قوەت دەبات. لە ٦/٢٩/ ١٩٦٦دا دوای چەند جارێك هاتوچۆ لەنێوان بارەگای بارزانی و بەغدادا سەرۆك وەزیرانی عێراق لە تەلەفزیۆنی

عێراقەوە ئاشتی و ڕێکەوتن ڕادەگەیەنێت و (مافی نەتـەوەیی کـوردان) لـە چوارچێوەی (لامەرکەزیدا) بەڕەسمی ڕادەگەیەنێت.

ڕێکەوتننامـەی بـەزاز ١٢ خـاڵی گرتبووەخـۆ، لەوانـە هەڵبـژاردنی ئەنجومـەن و دەرکردنـی لێبـوردنی گـشتی و بـەکارهێنانی زمـانی کـوردی بەشـێوەیەکی ڕەسمـی و هێشتنەوەی هێزی پێشمەرگە وەك "هێزێکـی دەوڵـەتی" تـا ئاسـایی بوونـەوەی ژیـان و گوزەران لە وڵاتدا.

هەندێ لە خاڵە نهێنییەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە ئەوەبوو کە سەرۆك وەزیران بەڵێنی دابوو کە حیزبی دیموکراتی کوردستان بکات بـە حیزبێکـی قـانونی و مۆڵـەتی کـارکردنی بـدات. زینـدانیانی سیاسـی ئـازاد بکـات و لـە دەوروبـەری دهـۆك لـە بادینانـدا شـارێك "لیوایەك" دروست بکات[٢٥].

لیژنەیەك لە ئاستی هەرە بەرزدا بۆ جێبەجێکردنی ئەم بەیانە لـە لیـوا ڕوکـن کـەمال مستەفا عەلەمدار و عەمید ڕوکن عەبـدولمونعیم مەسـرەف لـە لایـەنی حکومەتـەوە و لـە نافیز جەلال و موحسین دزەیی لەلایەن شۆڕشەوە پێکهات. کاك مەسعود بارزانی دەڵـێ: "من بۆخۆم گـوێم لێ بـووە بـارزانی وتوویـەتی بـەیانی ٢٩ی حـوزەیران بـەیانێکی لاوازە بەڵام ئێمە بە مەبەستی ڕێزلێگرتنی وەفدەکەی خۆمان پێی قایل بووین و ئەم بەیانە لـە ڕاستیدا شەڕ وەستاندنە و ڕێکەوتن نیە، بارزانی بۆخۆی پێـی ڕازینـەبوو، بـەڵام ئـەو بـە نەریتەکەی خۆی لەگەڵ یارمەتیدەران و لایـەنگرانی نـەرم بـوو، خۆشـی لـەوە نـەدەهات قـسەیەکیان لەگەڵدا بکـات لۆمـە و سـەرکۆنەکردن بگەیـەنێت و وایـان لێبکـات شـوێنی خۆیانیان پێ لەق بێ"[٢٦].

زۆری نەبرد عەبدولڕەحمان بـەزاز ناچـار کـراوە دەسـت لـەکار بکێـشێتەوە وعەمیـد ڕوکن ناجی تالب وەزارەتی نوێی دامەزراند، وەزارەتەکەی نـاجی تالـب تاکـە ئەنـدامێکی کوردی تێدابوو کە ئەویش ئەحمەد کەمال قادر بـوو و ناونیـشانی وەزیـری دەوڵـەت بـوو

بۆکاروباری ئاوەدانکردنەوەی باکوریان داپێی. بە هاتنی ئەم وەزیرە بەیانی ۲۹ سڕکرا[۲۷].

ئاشکرابوو کە هیچ کام لە حکومەتەکانی بەغدا ئامادە نەبوون مافە ڕەواکانی گەلی کورد جێبەجێ بکەن.

بەیاننامەی ۱۱ی ئازاری ۱۹۷۰ یان ڕێکەوتننامەی ۱۹۷۰/۳/۱۱

حزبی بەعس لە ۱۷-۳۰ی تەموزی ۱۹٦۸ لە ئە نجامی کودەتایەکی سەربازی بەلام بێ خوێن ڕشتن!! عەبدولڕەحمان محەمەد عارفی لەسەر تەختی سەرۆك کۆماری لابرد و خۆی واتا حیزبی بەعس بەهاوکاری ژمارەیك لە گەورە ئەفسەرەکان دەسەلاتیان لە عێراقدا گرتە دەست.

حیزبی بەعس بە سەرکردایەتی ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆك کۆمار و صەدام حسینی جێگری دوای ماوەیەك لە گرتنە دەستی دەسەلات هێرشی سەربازییان بۆ سەر کوردستان دەست پێکردەوە ودوای چەندین شەڕێ دۆڕا و حکومەتی بەعس لە پایزی ۱۹٦۹ بەهۆی (عەزیز شەریف) کەسایەتییەکی ناسراو بوو سەرۆکی ئەنجومەنی ئاشتی بوو داوای لە بارزانی کردووە گفتوگۆ دەست پێبکات و بەڕێگەی ئاشتی کێشەکان چارەسەر بکرێن.

دوابەدوای ئەم داوایە وەفدی سەرکردایەتی شۆڕش و وەفدی ڕژێم لەنێوان بەغدا و ناوپردان دەستیان بە وتووێژ کرد و لە ئەنجامدا شەوی ۱۰-۱۱/۱۹۷۰ بەیاننامەیەك لەلایەن ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆك کۆمارەوە ڕاگەیەنرا کە بە بە یاننامەی ۱۱ی ئازار ناسراوە. پاش ئەوەی سەعات ۱۱,۵ ئەو شەوە (بارزانی و سەدام) هەردووکیان ئیمزایان لەسەر ڕێکەوتننامەکە کردووە. لایەن بەغدا وەکو بەیاننامە بلاوی کردەوە، بەلام لایەنی کوردی بە ڕێکەوتننامە پێناسەی دەکات.

لە کتێبەکەی کریس کۆچێراش بە ڕێکەوتننامە باسکراوە و تیایدا هاتووەکە "ماددەی سەرەکی و بنەڕەتی ئەم ڕێکەوتننامەیە پانزە مادەیە، بێگومان ماددەی چواردەمیەتی کە بریتی یە لە داننان بە ئۆتۆنۆمی گەلی کورد لە چوارچێوەی شارە کوردەکان و هەموو ئەو شوێنانەی کە بەپێی سەر ژمێرییەك کە لە ئایندەدا ئەنجام دەدرێ زۆربەی دانیشتوانی کوردن"[٢٨]. باقی خاڵە گرنگەکانی ڕێکەوتننامەکە بریتین لە قایلبوون بەوەی زمانی کوردی وەکو زمانی ڕەسمی و خوێندن لەگەڵ زمانی عەرەبیدا لەو ناوچانەدا بەکاربێت کە زۆربەی دانیشتوانیان کوردن، دامەزراندنی کوردەکان بەبێ ج جیاوازیکردنێك لە دام و دەزگا حکومەتی و لەشکرییەکاندا، تەرخانکردنی بەشێکی (دادوەرانە) لە داهاتی ئاوەدانکردنەوە بۆ ناوچە کوردنشینەکان، دامەزراندنی کەسێکی کورد بە جێگری سەرۆك کۆمار، بەشداری کورد بەگوێرەی ڕێژەی خۆیان لە عێراقدا لە ئەنجومەنی یاسا دانان[٢٩].

لەماوەی نێوان (١٩٧٠- ١٩٧٤) پارتی دیموکراتی کوردستان لە زۆرینەی هەرێمی کوردستان دەسەڵاتی کارگێری بەڕێوە دەبرد بەڵام سوپا و دام و دەزگای ئەمن و ئیستیخبارات و ڕێکخستنەکانی بەعس لە کوردستان کاری ئاسایی خۆیان ئەنجامدەدا. ئەمجارەش ڕژێمی بەغدا نیازی پاك نەبوو. هەر لە پایزی ١٩٧١ نازم گزار کە بەڕێوەبەری ئەمنی عام بوو لە بەغدا بە ڕاسپاردەی سەرانی ڕژێم پیلانێکی ڕێکخستبوو بۆ لەنابردنی بارزانی لەڕێگی ناردنی شاندێك لە پیاوانی ئاینی کە هەموویان مینڕێژ کرابوون و لەکاتی کۆبوونەوەی شاندەکە لەگەڵ بارزانی لەناوپردان مەلایەکان تەقینەوە و بەڕێکەوت بارزانی سەلامەت دەرچوو.

دوای ئەم ڕووداوە نێوانی بەغدا و کوردستان ساردیی تێکەوت، دەبوایە ڕژێم لە ١١ی ئازاری ١٩٧٤ یاسای ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان ڕابگەیەنێت بەڵام وتووێژەکان بە بنبەست گەیشتن و ڕژێم یاسایەکی کارتۆنی حوکمی زاتی ڕاگەیاند کە سەرکردایەتی شۆڕش پێی ڕازینەبوو، خاڵی گەورەی ناکۆکیش لەسەر شاری کەرکوك بوو، ئیتر پەیوەندییەکانی نێوان بەغدا و ناوپردان پچڕان و شەڕ لە کوردستان دەستی پێکردەوە.

ئەنجام

لەمانەی ئەم باسەدا گەیشتمە ئەم دەرئەنجامانەی خورەوە:

١- حکومەتەکانی بەغدا هەر لە حکومەتەکەی عەبدوکەریم قاسمەوە (١٩٥٨- ١٩٦٣) تاکو حکومەتی بەعس لە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو هیچ یەکێکیان نیازیان لەبەرامبەر گەلی کورد پاك نەبووە و نەیانویستووە بە ڕێگەیەکی ئاشتیانە دان بە مافە ڕەواکانی گەلی کورد بنێن و چارەسەری بکەن.

٢- سەرکردایەتی شۆڕشی گەلی کورد کە خۆی لە (پ.د.ك) سەرۆکەکەی مەلا مستەفای بارزان دەنواند لە ساڵی ١٩٦١ کە بێئومێدبوون لە حکومەتی بەغدا، شۆڕشی ئەیلولی هەڵگیرساند و بەشی زۆری خەڵکی کوردستان پشتیوانی بوون و بەهەزاران لاوی کورد چوونە ڕیزی ئەم شۆڕشە.

٣- هێزی پێشمەرگە بەهۆی بیروباوەڕی پتەوییەوە بەچەکی ساکار و یارمەتی کەم و نانە ڕەقە چەندین داستانی قارەمانانەی لە بەرامبەر لەشکری عێراقی پڕ چەك و خاوەن فڕۆکەی پێشکەوتوو تۆمارکردووە.

٤- مەلا مستەفای بارزانی تاکو ساڵی ١٩٧٠ سەرکەوتووانە ڕابەرایەتی شۆڕشی ئەیلولی کردووە و بەیەك چاو سەیری هەموو گەلی کوردستانی دڵسۆزی کردووە، بۆیە هەموو لا بە سەرکردەی خۆیانیان زانیووە. حیزبی شیوعی عێراقیش هەر لە ساڵی ١٩٦٣ تاکو ١٩٧٠ بەشدار و پشتیوانی شۆڕشی ئەیلول بووە. هەر جارەی هێزەکانی سوپای عێراق لە شەڕەکاندا لەبەرامبەر هێزی پێشمەرگە شکستی هێنا بێت حکومەتی بەغدا داوای دانوستانی لە سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلول کردووە، هەمووجار سەرکردەی شۆڕشی ئەیلول دانوستان و ڕێگای ئاشتی پەسەند کردووە و دەستی ئاشتی بۆ بەغدا درێژ کردووە، بەڵام هەموو جار حکومەتەکانی بەغدا لە بەڵێن و ڕێکەوتنەکان پەشیمان بوونەتەوە وئامادە نەبوون داواکارییە ڕەواکانی گەلی کورد جێبەجێ بکەن.

پەراوێزەکان :

[1] د. كاظم حبيب، لمحات من نضال حركة التحرر الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، دەزگای ئاراس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، ٢٠٠٥، ل٢٨١.

[2] عەلی کەندی، مێژوونامە، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٥٥٢- ٥٥٣.

[3] د. نوري عبدالحميد العاني و آخرون، تأريخ الوزارات العراقية في العهد الجمهوري، چاپی یەکەم، خانەی حیكمة، بەغدا، ٢٠٠٠، ل١٢٦.

[4] د. کازم حبیب، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨٤.

[5] حبيب محمد كريم، تأريخ الحزب الديمراطي الكردستاني (في محطات رئيسية) ١٩٤٦- ١٩٩٣، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٩٨، ٦٨.

[6] حبیب محمود کریم، هەمان سەرچاوە، ل٧٤.

[7] محسن دزەيي، أحداث عاصرتها، بەشی دووەم (١٩٦١- ١٩٧٥)، دەزگای ئاراس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ١٩.

[8] د. عبدالفتاح علي يحيى، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٤٢٢.

[9] مەسعود بارزانی، بارزانی و بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١- ١٩٦٢، چاپخانەی وەزرەتی پەروەردە، ٢٠٠٤، ل٢٠.

[10] بۆ سەرنجدانی دەقی یاداشتنامەکەی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە: (حبیب محمد کریم، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٥- ٨٣).

[11] حەمەد سالح ئاکرەیی، کورد و دەوڵەتی سەربەخۆ، دەزگای توێژنەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، ٢٠٠٧، ل١٢٦.

[12] مەسعود بارزانی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٩.

[13] کریس کۆچێرا، کورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا، و: حەمەکەریم عارف، چاپی چوارەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٧١.

[14] دیڤید ماکداول، مێژووی هاوچەرخی کورد، وەرگێڕانی ئەبو بەکر خۆشناو، چاپخانەی ڕوون، ٢٠٠٢، ل٦٢٧.

[15] د. كاظم حبيب، سەرچاوەی پێشوو، ل۲۹۵.

[16] كريش كۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل۲۷٦– ۲۷۷.

[17] ديڤيد ماكداول، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٤٢.

[18] مەسعود بارزانی هەمان سەرچاوە، ل٣٦– ٣٧.

[19] مەسعود بارزانی، هەمان سەرچاوە، ل٥٧– ٥٨.

[20] مەسعود بارزانی، هەمان سەرچاوە، ل٢١٥– ٢١٧.

[21] زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، بیرەوەرییەكانم، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ۲۰۰۷، ل٤١٦– ٤١٧.

[22] زۆربەی سەرچاوەكان ئاماژە بۆ سێ شەهید دەكەن، كە ئەم قارەمانانە بوون: ۱– شەهید عەریف یونس، ۲– شەهید خدر عەولا بەگ، ۳– شەهید سالح مام ئەلیاس. حەوت پێشمەرگەش بریندار بوون.

[23] مەسعود بارزانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢١.

[24] مەسعود بارزانی هەمان سەرچاوە، ل٢٥٨– ٢٦٠.

[25] كريس كۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣٧.

[26] مەسعود بارزانی سەرچاوەی پێشوو، ل٢٢٨.

[27] مەسعود بارزانی، هەمان سەرچاوە، ل٢٢٩.

[28] كريس كۆچێرا، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٥٨.

[29] كريس كۆچێرا، هەمان سەرچاوە، ل٣٥٨.

## سەرچاوەكان

سەرچاوەكان بە زمانی كوردی:

١– مەسعود بارزانی، بارزانی و بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی كورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەكەم، شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١– ١٩٦٢، چاپخانەی وەزرەتی پەروەردە، ٢٠٠٤، ل٢٠.

٢– كريس كۆچێرا، كورد لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا، و: حەمەكەریم عارف، چاپی چوارەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٢٧١.

٣– شەوكەت مەلا ئیسماعیل حەسەن، ڕۆژانێ لە مێژووی شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١– ١٩٧٥، التفسير بۆ بڵاوكردنەوە و ڕاگەیاندن، چاپخانەی وەزارەتی پەرەردە، هەولێر، ٢٠٠٧.

٤- دیڤید ماكداول، مێژووی هاوچەرخی كورد، وەرگێڕانی ئەبو بەكر خۆشناو، چاپخانەی ڕوون، ٢٠٠٢، ل٦٢٧.
٥- زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەیی، بیرەوەرییەكانم، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٤١٦-٤١٧.
٦- د. شاكر خەسباك، كورد و مەسەلی كورد، ئەمجەد شاكەلی كردوویە بە كوردی، دەزگای چاپ و بلاوكردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥.
٧- عەلی كەندی، مێژوونامە، بەرگی یەكەم، چاپی یەكەم، هەولێر، ٢٠٠٧، ل٥٥٢- ٥٥٣.
٨- محەمەد سالح ئاكرەیی، كورد و دەوڵەتی سەربەخۆ، دەزگای توێژنەوە و بلاوكردنەوەی موكریانی، ٢٠٠٧، ل١٢٦.
٩- نازناز محەمەد عەبدولقادر، سیاسەتی ئێران بە رامبەر بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی كورد لە كوردستانی عێراقدا ١٩٦١- ١٩٧٥، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

سەرچاوەكان بە زمانی عەرەبی :
١٠- حبیب محمد كریم، تأریخ الحزب الدیمراطي الكردستاني (في محطات رئیسیة) ١٩٤٦- ١٩٩٣، چاپخانەی خەبات، دهۆك، ١٩٩٨، ٦٨.
١١- محسن دزەیي، أحداث عاصرتها، بەشی دووەم (١٩٦١- ١٩٧٥)، دەزگای ئاراس بۆ چاپ و بلاوكردنەوە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل ١٩.
١٢- د. محمد الطاهر محمد، القضیة الكوردیة و حق تقریر المصیر، (مكتبة مدبولي)، ٢٠٠٨.
١٣- د. كاظم حبیب، لمحات من نضال حركة اتحرر الوطني للشعب الكردي في كردستان العراق، دەزگای ئاراس بۆ چاپ و بلاوكردنەوە، ٢٠٠٥، ل٢٨١.
١٤- د. نوري عبدالحمید العاني و آخرون، تأریخ الوزارات العراقیة في العهد الجمهوري، چاپی یەكەم، خانەی حیكمة، بەغدا، ٢٠٠٠، ل١٢٦.
١٥- د. عبدالفتاح علي یحیی، وثائق عن الحركة القومیة الكوردیة التحرریة، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٤٢٢.

# پۆلینی قۆناغەکانی مێژوو
## ( مێژووی کورد )

هۆشەنگ ساڵح نەجار

دەروازە:

سەبارەت بە قۆناغەکانی مێژوو کۆمەڵێك بیر و بۆچون خراونەتە ڕوو.هەر یەك لەمانە پشت بەستوو بەتیۆرێکی تایبەتی قۆناغەکانی مێژووی پۆلێن کردووەوچەندرووداوێکی گەورەی مێژووییشی کردۆتە تخوب بۆجیاکردنەوەی دووقۆناغی مێژویی لەیەکتر[1]. ئەم چەشنە دابەش کردنە بایەخ وتایبەتمەندی خۆی هەیە و تارادەیەك نوێیە.چونکە لێکۆڵینەوەکانی مێژوو بۆ یەکێك لەم قۆناغانە تایبەتمەند دەکات وتوێژەری مێژوویی لەکۆڵ نووسینەوەی مێژووی دووروقوڵ دەکاتەوە و ئەو پرەنسیپە دەچەسپێنێ (کەهەرچی دەستی دایە بواری مێژوو،مەرج نیە پسپۆڕی لەسەرجەم قۆناغەکانی پەیدابکا)، بەڵکو تایبەتمەندی لەقۆناغێك لەم قۆناغانە وەردەگرێ ودەیکاتەخاڵی بایەخ پێدانی خۆی ونەگەر بیەوێ توێژینەوەیەکی دەوڵەمەندوزانستیانەی لێ بەرهەم دەهێنێت.

لەپێش دا،بەو شێوە یە نەبوو.مێژوونووس کاتێك دەستی دەدایە نووسینەوەی مێژوو، دەبوایە هەرلەسەرەتای دروستبوونی ئادەمیزادەوە دەست پێبکات تا بەو قۆناغە دەگەیشتەوە کەخۆی تێیدا دەژیا.مێژوونوسانی ئیسلامی وەك (تەبەری)و(ئیبن کەسیر)و(مەسعودی)وئەوانی تر..هەریەك لەمانە مێژووەکەی لە چەندبەرگێك

پێکهاتووە.هەمووقۆناغەکانی مێژووی مرۆڤایەتی گرتۆتە خۆی تاسەردەمی (مێژوونوس) خۆی[2]، ئەمەش لەچەندرویێکەوە باش نەبوو،وەك:

١-مێـــژوونوس لـــە ئـــەنجامی لێکۆڵینـــەوە لـــەو مێـــژووە دوور و قوڵـــەی کـــە دەینوسییەوە.دووچاری هەڵەی گەورەی زانستی دەبوەوە.چونکە ئـەم جـۆرە مێـژووە پێویستی بە سەرچاوەی زیاتر هەبووە.دەبوایە مێژوونوس بۆئەم مەبەستە لا لـە سـەدان سەرچاوەی جۆراوجۆر بکاتەوە,تادەگاتە کرۆکی ڕاستییەکان. لەکاتێك دەسکەوتنی ئـەم سەرچـاوانە لەوســەردەمانەدا کـارێکی ئاسـان نـەبووە.سـاکارترین نمونـە نەتوانـدراوە لەوســـەردەمانە (خـــەتی مێخـــی)بخوێندرێتـــەوە ،یـــان کـــاری شوێنەوارناســـی ئەنجامبـدرێت.تـەنها بابـەتێك بوبێتـە سەرچـاوەی کـاری ئـەم مێژوونوسـانە (سەرچـاوە ئاسمانیەکانی وەك (تەورات وقورئان) و وگێڕانەوەی دەماودەم و هەنـدێ لێتوێژینـەوەی مەیدانی بووە).زۆرجاریش مێژوونوس پەنای بردۆتە بەر هەقایەت وسەرچـاوەی مێـژووی بردۆتەوە سەر ئەفسانە. بەنمونە کەسێکی وەك (مەسعودی) ڕەچەڵەکی نەتەوەی کـورد دەباتەوە سەر(جنۆکە)پێی وایە کەکورد لە نەوەی جنۆکەکانی پەیامبەر (سلێمان)ن[3]، کە ئەمە بۆچونێکی لۆجیکی نییە وسادەترین ئەقڵ لەبواری مێـژوو، ڕەتیدەکاتـەوە.ئـەم جۆرەهەڵەوپەڵـــە لەئـــەنجامی بێـــسەرچاوەیی لەســـەر ڕەچـــەڵەکی کورد،دروســـت بـووە.ئەمەجگـە لەدەیـەها شـوێنی دیکـە کـەهانا بردراوەتـە بەرئەفـسانە.تـا(ئـیبن خەلدون١٣٣٢-١٤٠٦ز)هات بۆیەکەم جار ئەوبەرگەدەستکردە داسەپێندراوەی دامـاڵی و ڕووداوەکانی گەڕاندەوە هەوارگـەی خۆیـان[4]. سـەرەڕای ڕەخنـەگرتن لـە مێژوونوسـانی پێش خۆی بەوەی کەوا ئەفسانەوهەقایەتی زۆر خزاوەتە ناو مێژووەکانیان .

٢-یـەکێك لەخراپییـەکانی تـری نووسـینەوەی هـەموو قۆناغـەکانی مێـژوو بەسـەر یەکەوە (حولیات)، بریتییە لەنـەبوونی میتۆدوشـیکاری مێـژوویی.واتـە بابـەتی مێـژوویی تـــەنها بـــریتی بـــووە لەگێڕانـــەوەی دەقێکـــی مێـــژوویی ڕووت، دوور لەهەرفەلـــسەفە و

شـیکردنەوەیەکی مەعریفیانــە.بۆنمونــە بــاس لەشــەڕێك دەکـا.گــەورەیی قــەبارەی شــەڕەکەوپاڵەوانیەتی ســەرکردەکانی دەگێڕێتــەوە.بــێ ئــەوەی هۆکــار و بەرئــەنجام وکاریگەریەکانی تاوتوێ بکات.بەمەش (خوێنـەر)دوچاری بێزاربـوون دەکـات.وەك ئـەوە وایەهەقایـەتێك بگێڕێتـەوە.((ڤۆلتێر١٦٩٤–١٧٧٨ز)فەیلەسوفی فەرەنسی لەوبارەیـەوە دەڵـێ((هەنـدێ لەمێژوونوســان لەمێــژووەکانیان تــەنها بایــەخ بەشــەڕوپەیمانەکان دەدەن،ئەمـە لـەکاتێك دا مـن لەبەرئـەنجامی خوێندنـەوەی سـێ تـا چـوار هـەزار شـەڕ وبەســەدان لەپەیمانــەکان، هــیچ بابــەتێکی نــوێ فێرنــەبووم، تــا لــەڕووی زانیــاری ومەعریفیەوە لێی سودمەندبم))[5].

ئەمڕۆ وێڕای پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و زۆری سەرچاوە بەڵام هیچ کەسێك ناتوانێت مێــژووی سەرتاســەری مرۆڤایــەتی بنوســێتەوە.یــان مێــژووی قۆناغــەکانی وەك (کوردوکوردستان)بەسەریەکەوە.

ئەم هەوڵە لەپێش دا لەناو کورد هەبووە،کەسێکی وەك (ئەمین زەکی بـەگ)، هەوڵیـداوە لەتوێی کتێبی (خولاصەیەکی تـاریخی کوردوکوردسـتان لەقەدیمـەوە تـا ئـەمڕۆ)مێـژووی هــەموو قۆناغــەکانی کوردوکوردســتان بنووســێتەوە.بــەڵام نــەیتوانیوە ئامــانج بپێکێ .هەروەك خۆی لەپێشەکی کتێبەکەدا دەڵێ((من قەت پڕوپاگەنـدە بۆئـەوە ناکـەم کەئەم کتێبـە بریتیـە لەمێـژوویێکی تـەواوو بـێ کـەم وکـوڕی بـەڵکو بەپێـچەوانەوە کـەم وکــوڕی زۆرە لەگــەڵ ئەمــەدا لەبەرئــەنجامی لێکۆڵینــەوە لەدووســەدوپەنجا بــەرگی شـوێنەواری ئینگلیـزی وفەرەنسی وئـەڵمانی وعـەرەبی وتـورکی وفارسی،دیـسان کـەم وکــوڕی هەیــە.ئەوەتــەنیا بنەماییێکــە بــۆلاوان وخوێنــدەوارانی کــورد. چــونکە شـوێنەواروبەڵگەنامەکانی کەئێـستا لەبەردەسـتمن.هەرئەوەنـدە هاوکاریـان کـردم))[6].

ئەمەلـەکاتێك (ئــەمین زەکــی بــەگ)بەمێژوونوسـێکی یـەکجار گـەورەی کـورد دێتـە زانین .دکتـۆر(کـەمال مەزهـەر)لـەبارەی ئـەوەوە دەڵـێ((هـیرۆدۆت وگویچـاردینی وئـیبن

خەلدونی کوردە))(٧). کەواتە نووسینەوەی مێژووی پاك وبێ خەوش وزانستیانەی کورد کاری کەسێك و دوان نییە، بەڵکو کاری کۆمەڵە کەسێکە یان دەزگایەکە کەبێت و زانستیانە وپشت ئەستوور بە بەڵگەنامە و کەرەستەی شوێنەواری زۆر، سەرلەبەری مێژووی کورد بە هەموو قۆناغەکانیەوە، یەك بەدوای یەك بنوسێتەوە .هەوڵی تاکە کەسی بۆنووسینەوەی سەرجەم مێژووی کورد و کوردستان مێژوویەکی ناتەواو دەبێت.

دکتۆر (جەمال ڕەشید)سەبارەت بەپسپۆری قۆناغی مێژووی کۆن، دەڵێ ((باشترین شت ئەوەیە کەمێژوونوس لەپلەیەك لەپلەکانی مێژووبدویّ و خۆی بۆنەمە تەرخان کردبێ و هەمووکەرەستەکانی ئەو پلەیە شیبکاتەوە، بەرهەمی هەرکەشفێکی ئارکیۆلۆژی خۆی شیبکاتەوە دەبێ لەپلەیەك داپسپۆڕبێت.ئەگەرپسپۆڕی لەمێژوودانەبێ وبەهەست مێژووی کۆن شیبکاتەوە کارەکەی کرچ وکاڵ ونادروست دەبێ ،زۆری ئەوانەی لەسەرمێژوو دەنوسن, کاری خۆیان بەئەنجام ناهێنن)) سەبارەت بە(محەمەد ئەمین زەکی) یش پێیوایە ڕێبازەکەی زانستی نییە بەڵکو کۆکردنەوەی زانیارییە دەربارەی مێژوو،واتا چۆنی دەستکەوتوە،ئاواچۆتەسەر کتێبەکە(٨).

**بەشی یەکەم**

**تیۆرەکانی پۆلینی قۆناغەکانی مێژووی جیهان:**

کەوایە دابەش کردنی مێژوو بەپێی قۆناغەکان، هەم چوارچێوەی پسپۆڕی لێکۆڵەردیاری دەکات وهەم بایەخی لێکۆڵەربۆبابەتەکە زیاتردەکات، هەم لێکۆڵەر لەگرفتی پەرت وبلاّوی وبێ شیرازەیی وناپێوەندی ڕزگاردەکات.هەرئەمەش هانی زانا و بیریارانی مێژووی داوە بەتایبەت مێژوونوسانی سەردەمی ڕێنسانس،کە بیر لەپۆلاندنی قۆناغە مێژوییەکان بکەنەوە.

(دکتۆرکەمال مەزهەر) لەکتێبەکەی دا(مێژوو) ئاماژە بەوە دەکات، کەمێژوو یەك قۆناغ نییە، بەڵام مێژوونوسان لەسەر جیاکردنەوەی قۆناغەکان لەیەکتر هاوڕانین و وەك

یـەك لەیـەكی جیاناكەنـەوە.هەریەكـەیان لـەم بارەیـەوە خـاوەن بۆچـونێكی تایبـەت بەخۆیەتی.هەیەپێی وایـە ڕووداوی گـەورە (ئەوڕووداوانـەی زۆرگـرنگن) دەبێتـە سـنوری جیاكردنەوەی نێـوان دوو قۆنـاغ.هەشـیانە لـەقوڕبنی سروشـتی كۆمـەڵ وپێوەندیـەكانی ناوییەوە، سەیری قۆناغەكانی مێژوو دەكەن[٩] .

١- پۆلینەكان بەپێی ڕووداوە گەورەكان:

ئەوانەی كەڕووداوی گەورە دەكەنە ڕۆخی دووقۆناغی جیاواز،ساڵی ( ٤٧٦ز) یـان بـۆ كۆتایی قۆناغی كۆن و سـەرەتای سـەدەكانی ناوەڕاسـت هەڵبـژاردووە. واتـە ئەوسـاڵەی (بەربەر)ەكانی باكور ڕۆمایـان گـرت .كـەوتنی ڕۆمـا بـەڕووداوێكی گـەورەی مێـژوو دێتـە زانـین، چـونكە دوائیمپراتـۆری ڕۆم (ڕۆمۆلـۆس ئۆگـستۆلۆس)كەپایتەختەكـەی لـەئیتالیابوو.لەدەسـەلآت كـەوت وبێئـەوەی هـیچ جێنـشینێكی بۆدیـاریبكرێ[١٠] . بۆیـە لەمێژوودا دەبێتە دەسپێكی قۆناغێكی نـوێی مێـژوویی، كەئـەویش قۆنـاغی (سـەدەكانی ناوەڕاست)ـە[١١] .

زۆر كـەس پێیـان وایـە ئـەم ڕووداوە بۆمێـژوو بایەخەكـەی بـەم شـێوەیە نییـە، ئەمەبەبۆچونێكی ساكارانە دادەنێن.چونكەلەوكاتەی كەبەشـی ڕۆژئـاوای ئیمپراتۆریـەتی ڕۆما ڕووخا ،بەشی ڕۆژهەلآتی لەناونەچوبوو.هێشتا وەك پێشوو بەهێزوتواناوە بـەردەوام بوو.سـەرەڕای ئـەوەش ئاڵوگۆڕەبنەڕەتییـە ئـەنجامگرتووەكان.دەسـپێكی سـەردەمێكی دژواریان ڕادەگەیاند و بەبیری خـەڵكیان دەهێنایـەوە كـە گـە شەسـەندنی شارسـتانیەت هەمیشە دەتوانێت بەپێچەوانەوە بسوڕێتەوە[١٢] .

بەلآم سەبارەت بەسنوری سەدە ناوەنجییەكان وسـەدەنوێیەكان بیروڕاكـان لەگـەڵ یـەكتردا كـۆك نـین .هـی وایـان هەیـە سـاڵی (١٤٥٣ز) هەڵدەبـژێرێت .واتـە ئەوسـاڵەی (محمدفاتح)ـی سوڵتانی عوسمانی شاری (قوستەنتینیە)ی گرت،كەچی هـی وایـان هەیـە ئەم ڕووداوەی لاپەسند نیە،چونكە ژێركەوتنی گاوڕان دەگەیەنێ.ئەوانـە سـاڵی (١٤٩٢ز) یان بەلاوە باشترە چونكە دوو ڕوداوی گەورەی لەگەڵ خۆی هێنا.یەكـەمیان دۆزینـەوەی

کیشوەری ئەمەریکا بوو، لە لایەن ئیسپانەکانەوە بەڕابەرایەتی (کریستۆفەرکۆلۆمبس) و دووەمیان گرتنەوەی (گرانادا–غرناگە) بوو.کەتائەوکاتە بەدەست موسوڵمانەکانەوە بوو.مێژوونوسی ئەوتۆش هەیە، رەمەکی هەموو ئەو رووداوانە لەساڵی (١٥٠٠ز) داکۆدەکاتەوە و دەیکاتە ناوەندی دوو قۆناغ.بەهەمان دەستوور مێژوونوسانی ئەم رێبازە ،ساڵی( ١٨٧٠ز) یان شەڕی یەکەمی جیهانی دەکەنە کۆتایی قۆناغی مێژووی نوێی ئادەمیزاد[١٣].

٢– پۆلینەکان بەپێی سروشتی پەیوەندی کۆمەڵایەتی:

ئەوانەشی کەبەپێی سروشتی پەیوەندی کۆمەڵەوە ئەوقۆناغانە لەیەك جیادەکەنەوە،پێیان وایە رۆژگاری کۆیلایەتی، قۆناغی کۆنی مێژووە[١٤]. لەم قۆناغەدا مرۆڤەکان وەك کۆیلە کڕین وفرۆشتنیان پێدەکرا.ببونە بەردی بناغەی بەرهەم هێنان وهەموو کارێکیان پێ ئەنجام دەدرا.ئەم قۆناغەش چەندین شۆڕشی (کۆیلەکان)ی بەخۆیەوە بینیوە ،وەك شۆڕشی کۆیلەکان، بەڕابەرایەتی(سپارتاکۆس)لەدژی دەسەڵاتدارانی (رۆما).

ئەم بۆچونە پێی وایەڕژێمی دەرەبەگی قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاستە[١٥]. ئەم قۆناغە کاتێك دەست پێ دەکا،کەهۆزی(جەرمانەکان)لەهەموو ئەوروپا شوێنپێی خۆیان بەهێزکردبوو (ئیتالیا)لەساڵی( ٤٩٨ز) لەلایەن(ئوستروکێتەکان)ی سوڵتان (تیۆدۆریك٤٥٤–٥٢٦ز) داگیرکرا.(ئەنگلەکان و ساکسۆنەکان و ژووتەکان) هێرشیان کردە سەر دوورگەی (بەریتانی).لەساڵی( ٥٠٠ ز) بەکردەوە شوێنەوارێك لەئیمپراتۆریەتی رۆمانی رۆژئاوا نەما بوو،دۆخی سیاسی بەتەواوی گۆڕابوو هەرێمەکانی ژێردەستی بەربەرەکان، کەپاشماوەی چینی خوارووی رۆمەکانی لێ نیشتەجێ بوون، لەلایەن بەگزادەکانی پێگەیشتووی جەرمانەوە بەڕێوەدەچوو.لەڕوانگەی گۆڕانی کۆمەڵایەتیەوە جیاوازی چینایەتی بوو بەیەکێك لەبەرچاوترین خاسڵەتەکانی ئەوسەردەمە, رۆژئاوای ئەوروپا پێی نایە سەردەمی ستەمکارییەوە[١٦].

سـەرمایەداری قۆنـاغی نـوێی ئـەم چەشـنە دابـەش کردنـە بـوو[١٧]. کەئەمـەش بەکۆمـەڵێك خاسـڵەتی نـوێ لەچـاخەکانی دەرەبەگایـەتی جیادەکرێتـەوە. کەیـەکێکیان بریتییـە لەبـەرپابوونی بزوتنـەوەی بۆرجـوازی کەئـەنجامێکی ئاشـکرای لـەگۆڕان وپێشکەوتنی زۆرانبازی ئادەمیزاد لەژیان دا هەبوو[١٨].

ئـەو قۆناغـە پێشکەوتنی ئـاوەدانی وپیـشەسازی و بەرهـەم بـەرزی ڕاددەی ژیـانی لەگەڵ دابوو .ئەگەرچی زۆر کەس پێیان وایە کە لەم قۆناغە ململانێی چینایەتی لـەنێوان دەرەبەگ و چینی گشتیەوە گواستراپەوە بۆ سێ چین، کەئەوانیش بریتیبوون لـە چـینی یەکەم :خانەدان ودەرەبەگەکان،چینی دووەم:چـینی بازرگـان وخـاوەن پیـشەکان،چینی سێ یـەم :چـینی کارگەروجـەماوەر و میللـەت بـوون[١٩]. ئەمەجگـە لـەوەی ئـەم قۆناغـە هەڵگری سەردەمێکی نوێیە، کەئەویش سـەردەمی (ڕێینـسانس)ە.کـە سـەدەی پـازدە و شـازدە دەگرێتـەوە.لەوسـەردەمەدا گۆڕانکـاری زانـستی وکۆمەڵایـەتی وئـابووری گـرنگ بەتایبەت لەئەورووپا هاتنە دروستبوون.

ئـەم تیـۆرە (سۆشـیالیزم)دەکاتـە قۆنـاغی هـەرە نـوێ وهاوچـەرخ[٢٠]. بەبۆچـونی (دکتۆرکـەمال مەزهـەر)ئـەم تیـۆرەی کەلەسـەر بنـەمای (سروشـتی کۆمـەڵ)دروسـت بووە،زانستی ترە.پێی وایـە چ کـەوتنی ڕۆمـا و چ دۆزینـەوەی کیـشوەری ئـەمریکا هـیچ کاریگەرییەکی جیهانیان بەسەر جیاکردنەوەی دوو قۆناغی مێژوویی نـەبووە.دۆزینـەوەی ئەمریکا ئەگەر بۆ ئەمریکیەکانەوە کارێکی گرنگ بێت بەڵام بۆ گەلانی ڕۆژهەڵات یـان بـۆ کورد مایەی هیچ گۆڕانکارییەك نەبوەو بارودۆخی ناوچەکە هەروەك خۆی بووە[٢١].

٣- تێڕوانینی(ڤیکۆ)بۆپۆلێنی قۆناغەکانی مێژوو:

هەنـدێك لەبۆچـونەکان، دەگەڕێنـەوە سـەر تیۆرەکـانی هاوشـێوەی تیـۆری کـۆنی یۆنانی و ڕۆمانی و بـەتێڕوانینی جیـاوازەوە قۆناغـە مێژوویـیـەکان دابـەش دەکـەن ،وەك (ڤیکۆ)کە مێژوو دابەش دەکاتە سەرسێ قۆناغ:

١-قۆنـاغی خواوەنـدەکان:کەپێیوایـە زۆربـەی چـالاکیە مرۆییـەکانی ئـەم قۆناغـە پابەندە بەخواوەندەکان ڕەنگە ئەمەش قۆناغی زۆر کۆن بگرێتەوە.لەوقۆناغەی کە مـرۆڤ

بیری لەسروشت وکاریگەرییەکانی سروشت کردۆتەوە .وەك (ئاسمان وخاك و ڕۆژ وشەو و لەدایك بوون ومردن..)سەری سوڕماوە بەخەیاڵی سادەوساکارانەی خۆی کەوەك ئێستای نەبووەو کەم ئەزموون بووە.بەخەیاڵ و وەهم دیاردە سروشتییەکانی وێنا کردووە ولێکیداوەتەوە .لەم قۆناغە پیاوەئاینییەکان بەناوی خواوەندەوە دەسەڵاتیان بەسەر زەویدا دەکرد[٢٢].

لەم سەروبەندەدا ،چەند بیروڕایەکی ئاینی پەیدابوون و بەم ئاینانە دەگوترێت ئاینی سەرەتایی بتپەرستی.(بت) واتە بەرجەستە بوونی گیانی خواوەندەکان.ئەوخواوەندانەی کەسەرچاوەی هێز و بزوێنەری زۆرینەی دیاردە سروشتیەکان بوون وسەرچاوەی هێزو دەسەڵات بوون بەسەر سەرجەم گەردوون وئادەمیزاددا..هەیانبوو، خواوەندی شەڕبوو.هەیانبوو،خواوەندی ئاشتەوایی، سەرەڕای بوونی خواوەندی ڕزق و ڕۆزی وجوانی و..زۆرجۆری تر.

٢-قۆناغی قارەمانەکان:لەم قۆناغە ڕۆڵی قارەمانە ئەفسانەییەکان دێتە گۆڕێ، ئەم قارەمانانە یان لەنەوەی خواوەندەکان بوون، یان لەخواوەندەکانەوە هێزودەسەڵاتیان وەرگرتبوو.پاش ئەوەی لەسەر زەوی شارودەوڵەتیان دامەزراند وبوونە فەرمانڕەواو شەڕکەری بەهێزوچاونەترس، ئیتر بوونە خاوەن دەسەڵاتی ڕەها و یاخی بوون و شەڕی خواوەندەکانیان دەکرد. لەم قۆناغە یاسای گشتی لەکۆمەڵگا یاسایەکی ئەرستۆکراتی بوو،کەهەردووچینی دەسەڵاتدار و کۆیلەکانی لەیەکتر جیادەکردەوە. قارەمانە ئەفسانەییەکان ئەوقۆناغە مێژووییەیان پێ جیادەکرێتەوە کەدەوڵەتەکان بەشێوەیەکی گەورە و فراوان دروست بوون ودواتر لەشێوەی ئیمپراتۆر، بەشی زۆری جیهانیان داگیرکرد .

٣-قۆناغی مرۆڤ : لەم قۆناغە ڕۆلی مرۆڤەکان دێتە گۆڕێ، مرۆڤ وعەقلی مرۆڤ جێگەی خواوەند و قارەمانەکان دەگرێتەوە.مرۆڤ دەبێتە سەرچاوەی هێزی بەرهەم هێنان وشەڕوئاشتی بەدەستی ئەودەبێ، بەو بەهرە دەسکردانەی خۆی دەتوانێت

داهێنان بکات وگۆڕانکاری دروست بکات. ئەم قۆناغەی مرۆڤ لەگەڵ دەسپێکی قۆناغی نوێی مێژوویی و ڕێنسانس لەئەوروپا دێتە گۆڕێ[٢٣].

**٤- پۆلینی قۆناغەکان بەپێی پەرەسەندنەکانی ئایینی مەسیحی:**

کەسێکی وەك (ا.ج.گرانت) یش لەسەربنەمایەکی ئاینی دابەشبوونێکی مەسیحیانە دەبەخشێتە قۆناغە مێژووییەکان. پێی وایە سەدەکانی ناوەڕاست لەوکاتە دەست پێ دەکا کەقوستەنتین ی ئیمپراتۆری ڕۆم قبوڵی ئاینی مەسیحیەت دەکا وراپەڕینی بزوتنەوەی پرۆستانتیەکانیش بەڕێبەرایەتی (مارتین لۆتەر)دەبێتە دەسپێکی قۆناغی مێژووی نوێ وکۆتایی سەدە ناوەنجییەکان[٢٤].

**بەشی دووەم**

**قۆناغەکانی مێژووی کورد:**

لێکۆڵەرانی مێژووی کورد پێیانوایە، کەدابەشبوونی مێژوو بەپێوەری ڕووداوە گەورەکان لەڕۆژئاوا جیاوازی هەیە لەگەڵ ڕۆژهەلات. چونکە کۆمەڵێك گۆڕانکاری گرنگ ئەوکاتە لەڕۆژهەلات هاتنە کایەوە، کەبۆکورد و هەموگەلانی ڕۆژهەلات جێگای بایەخ وگرنگین[٢٥]. ئەوان پێیانوایە کەمێژووی کۆن لەبەرەبەیانی دەرکەوتنی یەکەمین مرۆڤەوە لەسەرزەوی دەستی پێکردووە، تاساڵی( ٦١٠ز) ی درێژەی کێشاوە.تائەوکاتەی ئاینی ئیسلام لەنیوە دوورگەی عەرەب ولەشاری مەککەوە بۆناوچەکانی ئاسیا و ئەوروپا وئەفریقیا بلاوبوەوە وبارودۆخی ژیاری کۆمەڵگای بەشێکی لەوکیشوەرانە گۆڕی .سەبارەت بەمێژووی نوێ بۆ ناوچەکانی ئاسیاوخۆرهەلاتی ناوەڕاست وئەفریقیا تاساڵی (١٤٥٣ز) درێژە دەکێشێ تائەوکاتەی (سوڵتان محەمەدفاتیح )ی عوسمانی شاری (قوستەنتینیە) ی پایتەختی دەوڵەتی بێزەنتی داگیرکرد.سەبارەت بەمێژووی نوێی ناوچەکانی ڕۆژهەلات بەگرتنی (قوستەنتینیە)دەست پێ دەکا تاکوو دەسپێکی جەنگی جیهانی یەکەم ساڵی (١٩١٤ ز) بەلام بۆخۆرئاوا و ئەوروپا، یان لەگەڵ دەسپێکی شۆڕشی فەرەنسا لەساڵی (١٧٩٢ز )کۆتایی دێت[٢٦].

١- کۆتایی مێژووی کۆن ودەسپێکی مێژووی ناوەڕاستی کورد:

سەبارەت بەکورد تاڕاددەیەك لەگەڵ ڕووداوە گەورەکان مێژووەکەی بۆچەند قۆناغێك دابەش دەبێت. بێگومان بڵاوبونەوەی ئاینی ئیسلام وگەیشتنی بەناوچە کوردیەکان، لەلایەك کۆتایی بەدەسەڵاتی ساسانی وبێزەنتیەکان هێنا، کەساڵانێك بووبەسەر کوردستان وناوچەکە فەرمانڕەوابوون.لەلایەك زۆر گۆڕانکاری لەڕووی ئاینی وکۆمەڵایەتی بەسەرناوچەکەداهات.واتە هێزێك هاتە ناوچەکە تەنها ئامانجی ئابووری نەبوو بەڵکو ئامانجی کۆمەڵێك گۆڕانکاری بوو بەسەرجۆری بیرکردنەوەی خەڵکی ناوچەکە .

پێش هاتنی ئیسلام ،ناوچەکانی میسۆپۆتامیاو شارەزوور وسەرچاوەکانی باکووری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری دیجلە،بوونە مەیدانی جەنگی نێوان دوودەوڵەتی بەهێزی ئەوسەردەمە. بۆیە کوردی ئەوناوچانە دوچاری زوڵم و بەدبەختی بوون. هەروەکوو زانراویشە هەرلەبەراییەکانی سەدەی حەوتەمەوە ئێران لەڕووی سەربازییەوە بەسەر بێزەنتییەکان سەردەکەوت وباڵادەستتربوو.لەساڵەکانی( ٦٠٢-٦٢٠ ز)، ئێران زۆربەی ئەو ناوچانەی داگیر کرد، کەلە ژێردەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی بوو (نێوان هەردوو ڕووبار سوریا و ئەرمینیا و میسر)بەلام لەساڵی (٦٢٤ ز)، بێزەنتی یەکان دووبارە دەستیان بەسەر داگرتنەوە.لە ئەنجامی ئەو سەرکەوتنانەی کەپەلامارە عەرەبیەکان(سوپای موسڵمانان) لەئێراندا بەدەستیان هێنا.سنورێکی بۆکێشەکانی نێوان ئێران وبێزەنتە دانا[٢٧].

٢- کۆتایی مێژووی ناوەڕاست ودەسپێکی مێژووی نوێی کورد:

سەبارەت بەدەسپێکی مێژووی نوێ لەڕۆژهەلات، کەلەگرتنی (قوستەنتینیە) دەست پێ دەکا. تێبینی دەکرێ هیچ گۆڕانێکی ئەوتۆ لە ناوچەکە بەرچاوناکەوێت.بەتایبەت ئەگەر ئەوەش بڵێین، کەهێشتا کوردستان بەدەست هۆزە تورکمانەکانەوە بووە.وەك(تەیموری لەنگ وقەرەقۆینلۆ و ئاق قۆینلۆ) لەوماوەیە

گۆڕانکاری یەکی ئەوتۆ بەرچاوناکەوێ[٢٨]. (عبدالرحمن قاسملو)لەوبارەیەوە دەڵێ (سێ هێرشی گەورە وەزعی دانیشتوانی کوردستان وئاسیای نزیکیان تاراددەیەکی زۆر شپرزە کرد ،هاتنی تورکەکانی سەلجوقی ساڵی( ١٠٥١ ز) کەئەوکاتە هێشتا عەباسی یەکان خەلافەتیان بەدەستەوە بوو.بەڵام دەسەڵاتیان زۆر لاوازبوو) و مەغۆل ساڵی( ١٢٣١ ز) ،تەیموری لەنگ لەساڵی ( ١٤٠٢ ز)، یەك لە دوای یەك بوونە هۆی داگیرکردن و وێران کردنی وڵاتەکە و زۆرگیروگرفتی ئابووری وکۆمەڵایەتی گەورەیان پێك هێنا.کەتاماوەیەکی دوور چارەسەرنەکران[٢٩].

لەسەرەتای سەدەی شازدەهەم دا، لەئێران و وڵاتی عوسمانی دا دووحکومەتی ناوەندی دامەزرابوون کەلەچاو ئەوسەردەمە بەهێزبوون ،شائیسماعیلی یەکەم (١٥٠٢-١٥١٨ز)بناخە دانەری بنەماڵەی سەفەوی لەئێران دا مەزهەبی شیعەی لەدژی مەزهەبی سوننە بەهێزکرد، کەمەزهەبی ڕەسمی ئیسلام بوو .کاتێك پیاوە گەورەکانی کورد پێشنیاریان پێکرد کەلەشەڕی سوڵتانی عوسمانی دا یارمەتی بدەن، شائیسماعیل ئەم پێشنیارەی پەسەند نەکرد و فەرمانی گرتنیدان.سوڵتان سەلیمی عوسمانی بەکەڵك وەرگرتن لەهەستی ئاینی کوردە سوننی یەکانی لەدژی سەفەویەکان هاندا.بەم جۆرە تورکەکان بە یارمەتی کوردەکان لەشەڕی (چاڵدێران) لەساڵی( ١٥١٤ ز)، توانیان لەشکری سەفەوی یەکان بەسەرکردایەتی (شائیسماعیل) تێکبشکێنن. کەئەمەش بۆنەتەوەی کورد ساڵێکی شوم بوو. لەئەنجامی ئەو شەڕەدا کوردستان لەنێوان ئێران(سەفەویەکان) وئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا بەکردەوە دابەش کرابوو. بەشی گەورەی کەوتە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکانەوە[٣٠].

شەڕی(چاڵدێران) لەمێژووی کورد دەسپێکی قۆناغێکی نوێیە، دەکرێ بۆ کورد ببێتە سەرەتای قۆناغی (مێژووی نوێ) گرنگیەکەشی لەم خاڵانە دایە:

(١) دابەشکردنی کوردستان لەنێوان هەردوو دەسەڵاتەکە، کەتائەمڕۆش ئەم دابەش بوونە درێژەی هەیە. سەرەڕای گۆڕانکاری زۆرو دووبارە دابەشکردنەوەی بەنەخشە و

بەرنامەی جیاجیا.چونکە دواتر ئەم دابەشکردنە بەفەرمی جێگیربوو کاریکردە سەر ڕووداوەکانی پاشەڕۆژی گەلی کورد.

(٢)بەفەرمی دروستبوونی چەندان ئەمارەتی کوردی. چونکە پاش سەرکەوتنی عوسمانیەکان لەشەڕی چاڵدێران بەسەر سەفەویەکان، لەڕێگەی کوردێکەوە بەنێوی (مەلائیدریسی بەدلیسی)بڕیاری دامەزراندنی چەندئەمارەتێکی کوردی یان دا، لەسنوری دەوڵەتی عوسمانی کەلەخاکی کوردستان بوو.بەومەرجەی لەکاتی دروست بوونی هەرشەروپێویستیەك، کوردەکان پاڵپشتی لەدەوڵەتی عوسمانی بکەن. حکومەتی عوسمانی بەهۆی دامەزراندنی هەندێ لەوئەمارەتانە کوردەکانی بەلای خۆی داکێش کرد. تەنانەت خودی (سوڵتان سەلیم)چەندجارێك لەسەربازگەی (ئەماسیە)وە (مەلائیدریس)ی ناردووە بۆناو کوردەکان بۆڕازیکردنیان. بۆئەم مەبەستەش کۆمەڵێك لەسەرکردە کوردەکان بوونە پشتیوانی دەوڵەتی عوسمانی ودەسەلاتی خۆیان بەوهۆیەوە فراوان وبەهێزکرد بۆنمونە میری سۆران (سەیدبەگ)،(کەرکوك وهەولێر)ی داگیرکرد و ئەمیری ساسۆن (محەمەدبەگ)موڵکی (هەرزن) ی لەسەفەوییەکان زەوت کرد و(قاسم بەگ)،(ئەکێل)ی داگیرکرد[٣١].

(٣)ئەمەجگە لەدامەزراندنی چەندئەمارەتێکی کوردی لەژێر قەڵەمڕەوەی (سەفەویەکان)، لەماوەی نێوان ساڵی( ١٥١٤ز) ونیوەی دووەمی چەرخی نۆزدەدا چەندمیرنشینێکی کورد دامەزران، کەهەرکامێکیان لەچوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یان ئێران دا خاوەن چەشنە سەربەخۆییەك بوون. تەنانەت هەندێکیان هەم لەگەڵ شای ئێران وهەم لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی پێوەندیان هەبوو[٣٢].

(٤)دەکرێ قۆناغی دوای شەڕی چاڵدێران بەهۆی بوونی هەندێ بەڵگە ،بە سەرەتاکانی دەرکەوتنی هەستی نەتەوەیی لای کورد دەست نیشان بکەین بەلام بەشێوەیەکی پێنە گەیشتوو.هەندێ ئاماژە هەیە ئەمە ڕوون دەکەنەوە، کەلەوکاتانە

واتــە ســەدەی پــازدە وشـازدە لەسەرئاسـتی تاکەکەســی هەنـدێ بیرۆکــەی نەتــەوەیی لەســەرەتای دروســت بــوونی دابــووە.لــەم ڕووەوە دووبەڵگــەی مێــژوویی زۆر گــرنگ بەدەستەوەوەن:

یەکـەمیان: (میرشــەرەفخانی بەدلیـسی یــە ١٥٤٣-١٦٠٤ن)،کـە مێـژووی کـوردی نووسیوەتەوە،زۆربۆچـون بـە یەکـەم مێژوونوســی کـوردی دەداتــە قەڵـەم ئەگەرچــی لەنووسینی (شەرەفنامە) زمانی فارسی بـەکارهێناوە، بـەڵام کـەباس لەمیرنـشین ومـیرە کوردەکان دەکات ،بەتـەواوی هەست بـەبوونی بـیری نەتـەوەیی دەکرێ .هەرلەوەسـفی ئازایـەتی وجـوامێری میرەکوردەکانــەوە بگـرە تــا دەگاتــە وەسـفی سروشـتی جـوانی کوردســتان وبــارودۆخی ئەودەمانــەی کوردســتان.ئەگەرچــی لەهەڵــە و کــەم وکــوڕی بەدوورنییــە بــەڵام گرنگــە، چـونکە ئــەوەی تائێــستا زانــراوە هــیچ کەســێك بــەر لــە (شــەرەفخانی بەدلیــسی) تێکــڕای بەرهــەمی خــۆی بــۆ مێــژووی کوردکوردســتان تەرخاننەکردووە[٣٣].

دووەمیان: (ئەحمەدی خانی١٦٥٠-١٧٠٦ن)،هۆزانڤان و بیریارێکی گـەورەی کـوردە. لــەزۆر شـوێن دا، بـیری نەتــەوەیی لــەنێو هۆنراوەکـانی بەرجەسـتە بـووە .لەپارچــە شیعرێکی دا دەڵێ:

ئەڤ ڕۆم وعەجەم بوان حەسارن
کرمانج هەمی لەچارکەنارن
ئەما ژئەزەل خودێ وەساکر
ئەڤ ڕۆم وعەجەم لەسەر مەڕاکر

(عەلائەدین سەجادی)دەربارەی بیری نەتـەوەیی(خـانی)دەڵـێ((لـەکاتێك داڕۆم وعەجـەم سەرتاپای خەیاڵ وئاسۆی کوردیان وەکوو (ژێی کەوان) وێك هێنابۆوە.کوردیان بەبەردی جەورستەم مۆڵ دابوو.بەڵام ئایا(خانی)ئەم هەستە نەتەوایەتیەی لەکوێ هێنا؟))[٣٤].

کەواتە دەبێ ئەوکاتە گۆڕانکارییەکان زۆر بیری نەتەوەییان لەوقۆناغە دروست کردبێ .ڕەنگە زۆر هاوشێوەی (ئەحمەدی خانی)لەوسەردەمانەدا هەبووبن کەهەمان بیرۆکەی نەتەوەییان هەبووە بەڵام وەك خانی بەهرەی ئەوەیان نەبووە، دەربیبڕن. هیچ گومانیش لەوە نەبووە کە(خانی)زانایەکی ئاینی بووە،قوتابی وشوێنکەوتەی خۆی هەبووە. تۆبڵێی ئەم بیرۆکە نەتەوەییەی لای ئەوان گەڵاڵە نەکردبێ و ئەوانیشی لەم ڕووەوە هۆشیارکردبێتەوە ؟ بێگومان ئەم کارە کراوە ،ئەم بیرە نەتەوەییە قۆناغ دوای قۆناغ خاسڵەتی نوێی بەخۆ وە گرتووە تا لەسەردەمی (میربەدرخان)ی میری بۆتان گەیشتۆتە ترۆپك.

(٣)کۆتایی مێژووی نوێی کوردودەسپێکی مێژووی هاوچەرخی کورد:

سەبارەت بەکۆتایی مێژووی نوێ ،کەجەنگی جیهانی یەکەم داندراوە[٣٥] ، بێگومان ئەمە بۆکوردیش گونجاوە. چونکە لەکۆتاییەکانی جەنگی جیهانی یەکەم زۆر گۆڕانکاری گەورە هاتنە کایەوە کەهەم بۆناوچەکەوهەم بۆکوردیش مایەی گۆڕان بوون. ئەگەرچی بەشمەینەتی کورد وداگیرکاری وخاك دابەش کردن ڕەگیان قوڵتر داکوتایەوە ،بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێین کەخەباتی نوێخوازانەی کورد چۆتە قۆناغێکی پێشکەوتوتر لەجاران.کورد وێڕای چڕکردنەوەی خەباتی چەکدارانەی خۆی دژ بەداگیرکاران، ئەمجارە پەرەی بەخەباتی سیاسیانەی خۆشی داوە. لەڕێگەی کردنەوەی چەندین کۆمەڵەوگروپ وڕێکخراوی سیاسیەوە هەوڵی داوە،پێداگیری لەسەر مافەکانی خۆی بکات وبەزمانی وهۆشیاری وعەقڵەوە بچێتەپێش وئەوبۆچونە گڵاوەی دوژمنان پوچەڵ بکاتەوە، کەپێیان وابوو(کورد تەنها ئاشنای شەڕە و شەڕی خۆش دەوێ وشەڕخوازوشەڕناسن). ئەگەرچی دامەزراندنی کۆمەڵە و یانە کوردییەکان زۆر لەپێش دەسپێکی جەنگەوە دامەزرابوون بەتایبەت دوای( کودەتای ئیتحادیەکان) بەسەر سوڵتان عبدالحمیدی دووەم. وێڕای دەرچوونی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لەقاهیرە لەساڵی( ١٨٩٨ز)،

هەرلەهەمان ساڵ دا واتە ساڵی( ١٨٩٨ز)، لەتورکیادا حیزبێکی سیاسی تازە بەناوی (کۆمەڵەی ئیتیحادوتەرەقی) لەلایەن چوارکەسی چالاکەوە دادەمەزرێ، کەدوانیان کورد دەبن بەناوی (ئیسحاق سکوتی وعەبدولاجەودەت ). ساڵی( ١٩٠٨ ز)(ئەمین عالی بەدرخان وشێخ عەبدولقادری شەمدینان وشەریف پاشاوئەحمەدزولکەفل پاشا،(کۆمەڵەی تەعالی وتەرەقی کوردستان وکۆمەڵەیەکی تری هەندێ جەماوەری وبەناوی (کۆمەڵەی بەلاڤکردنی مەعاریفی کوردی )دادەمەزرێنن وقوتابخانەیەکی کوردی لەگەڕەکی (چەمبەرلی تاش) لە ئەستەنبۆڵ دەکەنەوە[٣٦]، بەڵام ڕووداوەکانی دوای جەنگ زۆر گۆڕانکاری گەورەی نەتەوەیی لەهەڵوێستی کوردان دا هێنایە گۆڕێ جیاوازی یەکانی پێش ودوای جەنگ زۆر گەورەبوون کە خۆی دەبینێتەوە لە:

١-دووبارە دابەش کردنەوەی کوردستان ئەمجارەیان بۆ چوار بەش، (تورکیاوئێران وعێراق وسوریا)ئەم دابەش کردنە لەناو جەنگ دا لەلایەن زلهێزەکانەوە پیلانی بۆدارێژراو لەدوای جەنگ بەکرداری جێبەجێکرا.

٢- ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی، ئەودەوڵەتەی کەبەشی زۆری کوردستانی لەژێرچنگ دابوو. نزیکەی چوار سەدە فەرمانڕەوایی بەسەر زۆربەی بەشی کوردستان دادەکرد.هاوکات لەئێرانیش بەماوەیەکی کەم لەدوای جەنگ ،(دەوڵەتی قاجاری)ڕووخا. کەئەویش زیاتر لەسەدەیەك بەسەر ناوچەکە فەرمانڕەوابوون. ئەوگۆڕانانەی کەلەدوای ڕووخانی هەریەك لەدەوڵەتی عوسمانی و قاجاری هاتنە کایەوە، زۆربابەتی نوێیان لەسیستەمی کارپێکراوی چەندین ساڵەی ئەو وڵاتانە هێنا کایەوە.هەردوو وڵات لەپاشماوەی دوو ئیمپراتۆریەتی تەقلیدی وکلتور پەرستی یەوە، گۆڕان بۆ دوو دەوڵەتی عیلمانی ونەتەوەیی نوێ. کەهەموو نەتەوە کەمینەکانی، لەناو یەك نەتەوەی باڵا دەستەوە دەتواندەوە. ئەمەش پاڵپشت بەدەستورێك کەئەونەتەوانەی لەزۆر مافی سەرەتاییانەی خۆیان بێ بەش کردبوو. بەتایبەت لەتورکیای نوێ،سیاسەتی بەتورك

کـردن وسانـسۆر لەسـەر زمـانی کـوردی خـاڵی بنـەڕەتی سیاسـەتی تورکیـای تـازە بوو[٣٧].(هایکۆفلوت ئاو)ی ڕۆژنامە نووسی ئـەڵمانی دەیـەوێ ئیـزن لەحکومـەتی تـورک وەربگرێ و وەك پـەیامنێری ڕۆژنامـەی (سویدویچەتـسایتۆنگ)ی بنـاڤ ودەنـگ سـەردانی ناوچە کوردنشینەکانی تورکیا بکات وەڵامی ڕەسمی تورکیا ئـەوەبوو، کـە هـیچ کوردێـك لەتورکیادا نییە. بۆیە ڕێنادرێ سەردانی ڕۆژهەڵاتی (ئەنادۆڵ) بکات[٣٨].

٣-گـۆڕینی نەخـشەی جوگرافیـایی ناوچـەکە و هـاتنی زلهێزەکـانی وەکـوو بەریتانیاوفەرەنسە ، بۆیەکەمجار مامەڵەی ڕاستەوخۆی کـورد لەگـەڵ زلهێزەکـان، ئـەوە خـۆی قۆنـاغێکی نـوێ بـوو لەمێـژووی کـورد. زلهێزەکـان لەچوارچـێوەی ئەوهاوپەیمانەتییـەی کەلەئـەنجامی جـەنگ دا دروسـتیانکردبوو، دەسـتیان کـرد، بـەداگیرکردنی پاشمـاوەی دەوڵـەتی عوسمـانی. لـەعێراق وسـوریاوە بـەرەو پایتـەختی ئیمپراتۆریـەتی عوسمـانی کەوتنـە پێـشڕەوی. گـەلێك لـەو ڕێکخـراوە کوردییانـەی کـە دامەزران، دڵیان بە دەوڵەتی هاوپەیمانی سەرکەوتوو خۆشبوو.بەتایبەتی بەوبەرنامەیەی کـە (١٤) خاڵەکـەی سـەرۆکی ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی ئەمـەریکای لـەخۆ گرتبـوو. کـە بەڵێنی دابوو بە دابینکردنی ماف چارەی خۆنوسـینی هەرنەتەوەیـەکی ژێردەسـتی دوای جەنگی جیهانی یەکەم[٣٩].

ئەگەرچـی ئـەم ڕووداوانـە، زۆر پێـشهاتی ناخۆشـیان بۆکـورد هێنایەکایـەوە، بـەڵام بمانەوێ ونەمانەوێ بوونە خاڵی گۆڕانکاری گرنگ لەناوچەکە ,کەهـەم کوردیـان لەخـەوی قووڵ بەئاگا هێنایەوە ,هـەم چەشنە تـەرزێکی دیکـەیان بـەبزاڤی ڕزگـاریخوازی کـوردی بەخشی.بۆیە دەشێ قۆناغەکانی مێژووی نەتەوەی کورد بەشێوەیەکی گشتی لەسـەرئەم بنەمایە پـۆلین بکرێ .ئەمـە لـەکاتێك . ئێمـە مەبەسـتمان لـەدیاریکردنی ئـەو قۆناغانـە ئەوەیە، کەمێژووی نەتەوەکەمان لەهەریەکەیان بەجیا بنووسینەوە .چۆن سەرچـاوەکان دەست بخەین؟کامە کەرەستە دەبێتە سەرچـاوەی نووسـینەوەی مێـژووی هەریـەك لـەم قۆناغانە ؟ئاياسەرچاوەکان بوونەتە مایەی ئەوەی کـە تێکـڕای مێـژووی کـورد بەهـەموو

قۆناغەکانیەوە بەبێ هیچ کۆسپ وتەگەرەو دوودڵیەك بنووسینەوە؟ ئەم پرسیارانە ،بەهەوڵ وکۆششی توێـژەران ومێژوونوسانی کورد وەڵام دەدرێتەوە. کارکردنی هەریەکەیان لەقۆناغێکی مێژوویی دا دەبێتە تەواوکەری کاری مێژوویی یەکێکی تر. تاوەکوو بەهەموولایەکمان مێژوویێکی پاك وڕاستەقینەی میلەتەکەمان بەسەرجەم قۆناغەکانیەوە بنووسینەوە.

**ئەنجامی توێژینەوەکە:**

لەبەرئەنجامی ئەم توێژینەوەیە، گەیشتینە چەند ڕاستیەك کەلەگەڵ ئامانجی توێژینەوەکەمان یەکدەگرێتەوە:

١-نووسینەوەو توێژینەوەی مێژوو بەسەریەکەوە کاری توێژەرێك ودوان نیە،چونکە ئەم مێژووە دابەش دەبێتە سەرچەند قۆناغێك وهەرقۆناغێك تایبەتمەندی خۆی پێویستە، ئەمە لەکاتێك هەرقۆناغێك چەند پلەیەك لەخۆدەگرێت وهەر پلەیەکیش تایبەتمەندی خۆی پێویستە.

٢-بەشێوەیەکی گشتی دەکرێ کۆتایی قۆناغی مێژووی کۆن ودەسپێکی قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاستی مێژووی کورد، بەهاتنی ئیسلام، وەك هێزێکی نوێ بۆ ناوچەکە دیاری بکەین، کەزۆر ڕووداوی ڕیشەیی لەگەڵ خۆید هێنا بەڵام ئەمە بەو مانایە نی یە کەلەگەڵ کۆتایی دەوڵەتی عەرەبی ئیسلامی، ئەم قۆناغەش کۆتایی پێ بێت بەڵکو دوای شەڕی چاڵدێران ودەرکەوتنی عوسمانیەکان وەك هێزێکی کاریگەر لەناوچەکە کۆمەڵێك گۆڕانکاری گرنگ لەناوچەکە دروست بوون کەکاریگەریان تائێستاش بەسەر نەتەوەی کورد ماوە .کۆتایی سەدەی نوێ وسەرەتای قۆناغی سەدەکانی هاوچەرخ جەنگی جیهانی یەکەمە .ئەو جەنگەی کەخاکی کوردستان وکلتوری ئەونەتەوەیەی بۆ چوار بەش دابەشکرد وکێشەکەشی کردە چوار پارچە.

٣-بۆ چوونەکان سەبارەت بەدیاریکردنی قۆناغەکانی مێژوو زۆرو جۆراوجۆرن بەلام ئەم زۆری وجۆراوجۆری یە هەر خۆی بەڵگەیە لەسەر ئەو بایەخدانە گرنگەی کەکاری مێژوونوسی بەجیاکردنەوەی قۆناغەکانی مێژوو لەیەکتر ،دلویەتی.

پەراوێزوسەرچاوە:

(١) کەمال مەزهەر ئەحمەد:مێژوو(کورتە باسێکی زانستی مێژوو کوردومێژوو)،چاپی یەکەم،چاپخانەی دار الافاق العربیة،بغداد ،١٩٨٣، ص١٧ .

(٢) عبدالواحد ذنون:اصول البحث التاریخي،الطبعة الاولی،دار المدار الاسلامي – بیروت،٢٠٠٤م،ص٨٩.

(٣) میرشرفخانی بدلیسی:شەرەفنامە،و:مامۆستا هەژار،چاپی سێیەم،دەزگای ئاراس- هەولێر،٢٠٠٦ز،٨٨.

(٤) کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ، ص٥١.

(٥) هاشم یحیی الملاح واخرون:دراسات في الفلسفة التاریخ،الطبعة الاولی،مدیریة دارالکتب للطباعة والنشر-الموصل،١٩٨٨م،ص٧.

(٦) محەمەدئەمین زەکی بەگ: خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان (لەزۆرقەدیمەوەتائەمڕۆ)،ئا:ڕەفیق ساڵح،بەرگی چوارەم،بنکەی ژین-سلێمانی،٢٠٠٦ ز،ل٤.

(٧) کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٦٤-١٦٥.

(٨) جەمال ڕەشید:چاوپێکەوتن ،گۆڤاری ڕامان،ژمارە(٢٧)،ئەیلولی١٩٩٨،ل٥٩.

(٩) کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٧

(١٠) ئیزاك ئاسیمۆف،فرانك وایت:مێژووی شارستانیەت(هەنگاوی هەزارەکان)،و:حامیدگەوهەری،چاپی یەکەم،دەزگای ئاراس-هەولێر،٢٠٠٣ز،ل٨٤.

(١١) کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٨٠.

(١٢) ئیزاك ئاسیمۆف،فرانك وایت: هـ.س،ل٨٤.

(١٣) کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٨.

(١٤) کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٧.

(١٥) کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٧.

(١٦)ئیزاك ئاسیمۆف،فرانك وایت: هـ.س،ل٨٤.

(١٧) کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٧.

(١٨)جۆرج حەنا:چیرۆکی ئادەمیزاد،و:رەووف زوهدی،چاپی یەکەم،بەڕێوەبەرایەتی چاپ وبلاوکردنەوە–سلێمانی،٢٠٠٧ز،ل٢١٤.

(١٩) جۆرج حەنا: هـ.س،ل٢١٨.

(٢٠)کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٨.

(٢١)کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٩.

(٢٢) هاشم یحیى الملاح واخرون: ه.س،ص ١٩٦.

(٢٣)هاشم یحیى الملاح واخرون: ه.س، ص١٩٦.

(٢٤) کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٨

(٢٥) کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٩.

(٢٦)کەیوان ئازاد ئەنوەر:ڕێبازی لێکۆڵینەوەو ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مێژوویی،چاپی یەکەم،چاپەمەنی وئۆفیسی (پەیڤ)،سلێمانی،٢٠٠٣،ل١٥–١٦

(٢٧) ئارشاك پۆلادیان:کورد لەسەدەی حەوتەمەوە تا سەدەی دەیەم،و:جەلیل کاکەوەیس،چاپی یەکەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە–هەولێر،٢٠٠٥ ز،ل٢٣.

(٢٨)ڕابیعە فەتاح شێخ محەمەد:کوردستان لەسەدەی پازدەی زاینییدا،چاپی یەکەم،چاپخانەی ڕۆشنبیری –هەولێر،٢٠٠٥،ل١٣.

[29] عبدالرحمن قاسملۆ:کوردستان وکورد(لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی وئابوری)،و:عبدالله حسن زادە،چاپی دووەم،چاپخانەی منارە،هەولێر،٢٠٠٦،ل٤٠.

[30] عبدالرحمن قاسملۆ: هـ.س،ل٤٠.

[31] محەمەدئەمین زەکی بەگ: هـ.س،ل١٢٤.

[32] عبدالرحمن قاسملۆ: هـ.س،ل٤١.

[33] کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٠٤.

[34] علاءالدین سجادي: مێژوی ئەدەبی کوردی،چاپی دووەم،چاپخانەی معارف–بەغداد،١٩٧١،ل٢٢٢.

[35] کەمال مەزهەر ئەحمەد: هـ.س ،ل١٨.

[36] کریس کۆچێرا:کوردلەسەدەی نۆزدەوبیستەم دا،و:حەمەکەریم عارف،چاپی سێیەم،چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە–هەولێر،٢٠٠٦ ،ل٢١.

[37] دیڤید مەکداول: مێژووی هاوچەرخی کورد،و:ئەبوبەکرخۆشناو،چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە–هەولێر،٢٠٠٥ ،ل٣٢٠.

[38] گوینتەر دێشنەر:کورد گەلی لەخشتەبراوی غەدرلێکراو،وەرگێڕانی بۆکوردی:حەمەکەریم عارف،چاپی دووەم،چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری–هەولێر،١٩٩٩،ل٦٨.

[39] گوینتەر دێشنەر: هـ.س،ل٧٣.

# فەلسەفەی مێژوو لای تۆینبی

پ.ی.د. ئاکۆ بورهان
سەرۆکی بەشی مێژوو/ زانکۆی کۆیە

– کورتەیەك لە ژیاننامەی تۆینبی :

تۆینبی لە دیارترین و ناودارترین مێژوونووسەکانە، ناوی تەواوی (ئارنۆلد جوزێفی توێنبی) لە ساڵی ١٨٨٩ لە شاری لەندەن چاوی بە دونیا هەڵهێناوە، لە بنەماڵەیەکی رۆشنبیر و مەسیحی لەدایك بووە، هەر لە زووە چالاك و زیرەك دیارکەوتەوە، لەرووی پێگەیاندنی رۆشنبیریەوە کەوتبووە ژێر کاریگەری دایکی کە توێنبی بە نموونەی بالای خۆیی زانیوە، دایکی توێنبی لە بەشی مێژووی زانکۆی (کەمبریدج) تەواوی کردووە، رۆڵی هەبووە لە پێگەیاندنی کورەکەی کە ببێتە ئەم مێژوونووسە ناودارەی جیهان، توێنبی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد لە بەشی مێژوو وەرگیراوە، بەسەرکەتووانە تەواوی کردووە، لەناو زانکۆدا کە قوتابی بوو زمانەکانی یۆنانی و لاتینی فێربوو، تا بە تەواوی زانییەتی، مەبەستەکەشی ئەوەبوو مێژووی کۆن بخوێنێت کە بەم زمانانە سەرچاوەی زۆری لەسەر بووە، جگە لە زمانە زیندووەکانی جیهان وەکو فەرەنسی ئیتالی و ئەڵمانی، لەژیانیدا زۆر پۆستی هەبوو (لەوانە توێژەر) لە زانکۆ و (مامۆستا) لە مێژووی یۆنان و بیزەنتییەکان لە زانکۆی لەندەن و (بەرێوەبەری فەرمانگەی توێژینەوە) لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیا.

جگە لە دایکی کە دانەری کتێبێکی مێژوویی مەنهەجی بوو بۆ قوتابخانەکانی بەریتانیا، توێنبی کەوتبووە ژێر کاریگەری نووسینەکان و بیروڕاکانی ئەفلاتوون و شکسپیر و شیلی و برگسۆن و گۆتە و ئەسخیلۆس، توێژینەوە و کتێبێکی زۆری لەسەر مێژوو فەلسەفەی مێژوو نووسیوە لە دیارترین کتێبەکانیشی (شۆڕشی پیشەسازی)، (مێژووی شارستانیەتی هیلینی)، (شارستانیەت لە تەرازوودا)، (چارەسەری مێژوونووس بۆ ئاین) ، (دادگایی شارستانیەت)، (جیهان و ڕۆژئاوا)، (ئەمەریکا و شۆڕشی جیهان)، (جەنگ و شارستانیەت)، (توێژینەوە لەسەر مێژوو)، بەلام لە ناودارترین کتێبەکنی ئەوەی دواییە کە بە زمانی عەرەبی کورتکراوەتەوە و بلاوکراوەتەوە لەژێر ناونیشانی (مختصر دراسه التأريخ)، کتێبە تەواوەکەی توێنبی پێکهاتووە لە دوازدە بەش و سی و یەك سالْ خەریکی بوو تا تەواوی کرد، بەلام بەشێوەی پچڕ پچڕ دەستی بە نووسینەکانی دەکردەوە، سێ بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە لە سالّی ١٩٣٤ بلاوکردەوە، سێ بەرگی تری لە سالّی ١٩٣٩ بلاوکردەوە، پاشان لە سالّی ١٩٥٤ چوار بەگی تری بلاوکردەوە پاشان بەرگێکی سالّی ١٩٥٩ و دوا بەرگیشی سالّێ ١٩٦١ بلاوکردەوە، توێنبی سالّێ ١٩٥٧ لە تەمەنی هەشتا و شەش سالّی کۆچی دوایی کرد.

– بیرۆکەی بەریەککەوتنی شارستانیەکان :

لە کتێبە ناودارەکەی توێنبی بەشێکی تایبەت هەیە لەژێر ناونیشانی ململانێی شارستانیەکان کە لە بەشێکی باسەکەیدا ئاوڕدانەوەیەکی قوڵی دایەوە بۆ دواوە لەسەر مێژووی یۆنان، کاتێك باسی لە ململانێی نێوان شارستانیەتی یۆنانی و ڕۆمانی کردووە، بەپلەی سەرەکی و شارستانیەکانی تری ئەو کات و دواتریش بەریەککەوتنی شارستانیەکان لەماوەی نێوان سەدەی چوارەمی پێش زایین و سەدەی سێزدەی زایینیدا، و لەسەدەی بیستدا پێکدادانی شارستانیەتی ڕۆژئاوا بە هاوچەرخەکانی لە دیارترین و بەرچاوترین ڕووداوەکانە، لەبەرئەوەی هەنگاوی یەکەم بووە بەرەو یەکیەتی

جیهـان لەیـەك كۆمەڵگـەدا، بـەو پێیـەی كـە ڕۆژئـاوا تـا ئێستەش لـە قۆنـاغی یەكـەمی ململانێیــە لەگــەڵ شارســتانیەكانی ڕۆژهــەڵاتی دوور و شارســتانیەتی ئیــسلام و شارسـتانیەتی هینـدۆس و مەكـسیك و بـیرۆ و یەكێـی سـۆڤییەت، تـوێنبی پێـی وایـە ڕوسەكان ماركسیەتیان وەكو فەلسەفەیەكی كۆمەڵایـەتی- دینـی ڕۆژئـاوایی بـردووە بـۆ خۆیان و پاشان بەكاریان هێناوە بۆ جەنگاندنی ڕۆژئاوا.

تــوێنبی پێــی وایــە كــە شــاڵاوی ڕوســەكان لەوێنــەی شــیوعییەتەوە كــارێكی سەركەوتووانە نابێت، لێرەدا ئەو ڕاستی گوتـووە و پێشهاتەكانی ڕاسـتی بـوون بـەهۆی كەوتنی كەمپی ئیشتیراكی و شكست و پاشەكشەی ترسی شـیوعیەت، بـەڵام هەڕەشـەی شارستانیەتی چینی بۆ ڕۆژئاوا، بەو ئاستە نیـە، تـاوەكو ئێسەشی لەگەڵدا بێـت وەكـو تـوێنبی پێـشبینی كـردووە، بەقـەد ئـەو تـرس و هەڕەشـەی كـە ئیـسلام بـە هـەموو شێوەكانیەوە دەیكاتە سەر ڕۆژئاوا، لەشـوێنی تـردا تـوێنی بۆمـان دەخاتـە ڕوو كـە لـە سەدەكانی ناوەڕاست ڕۆژئاوا ترسێكی زۆری لە ئیسلام نیشتبوو بەبێ ئەوەی گوێبیستی شـیوعیەت بـن، ئیـسلامیش لەوكاتـەدا بووبـووە بەشـێك لـە مـژوولبوونی ڕۆژئاواییـەكان هەروكو ئـەوەی شـیوعیەت كردوویـەتی لـە سـەدەی بیستدا. بەپێی تیۆریـای تـوێنبی ناوەڕۆك فاكتەرەكەش یەكە، كاتێك ئیـسلام وەكـو شـیوعیەت بزوتنەوەیـەكی دژەكـاری ڕۆژئاوایی بووە، وەكو شیوعیەتیش چەكی گیانیان بەكاردەهێنا، كە ناكرێت بـەرەنگاری بكرێتەوە بە چەكی مادی، بەو پێیەی كە بەلای توێنبی لایەنی ڕۆحی زیاتر كاریگـەرترە، لەچاو لایـەنی ئـابووری و سیاسـی و پێـی وایـە مێـژووی ئـاینی لەپلـەی یەكەمـە ئینجا مێژووی ئابووری و سیاسی، ئاماژە بە مێژوونووس (جەبەرتی) دەكات لـە ڕووداوەكـانی سـاڵی ١٧٩٨ ئەوكاتـەی نـاپلیۆن میـسری داگیركـرد بـەڵام ئـەم مێژوونووسـە لـەجیاتی ڕووداوی داگیركردنـی میـسر بـەگرنگ بزانێـت كەچـی ڕووداوی وەسـتانی جێبـەجێكردنی حەجكردنی لە میسرەوە بۆ شوێنە پیرۆزەكانی حیجاز بە گرنگتر زانیووە.

- شارستانیەتی ئیسلام لای توێنبی :

لە تیۆریای توینبی بۆ شارستانیەتی ئیسلام ئەو پێی وایە کە پێغەمبەر محەمەد (د.خ) هەوڵیداوە بۆ گەیشتن بە یەکیەتی عەرەب لەسەر ئاستی باوەڕی ئاینی و ئاستی سیستەمی سیاسیەوە لەڕێگەی پەیامی ئیسلام، ئەمەش بە دوو قۆناغ بۆی تەواو بوو، قۆناغی مەککی، کاتێک بە دانایی و ئامۆژگاری بانگهێشتی ئیسلام کرا و بەبێ بەکارهێنانی هێز، و قۆناغی مەدینەیی، کە تیایدا دەوڵەتی عەرەبی ئیسلام دروست بووە، و پێغەمبەر لەم قۆناغەدا هێزی بەکارهێنا بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام.

قۆناغی یەکەم کە مەککیە توێنبی پێی وایە قۆناغی داهێنان و وەڵامدانەوەی شارستانیەتێکی سەرکەوتووە بە تەنهایی، بەڵام قۆناغی دووەم کە مەدینەییە ئەو پێی وایە سەرەتای تێکچوونی ئیسلامە، چونکە پێغەمبەر (د.خ) دەسەڵاتی مادی نوێی بەکارهێناوە بۆ بانگهێشتی ئاینی ئیسلام، لە سەردەمەکانی ڕاشدی و ئومەوی دەوڵەتی ئیسلام سەرکەوتنی دیاری بەدەستهێناوە لەڕووی یەکێتی سیاسی هەرێمەکان، بەڵام لە سەردەمی عەباسیدا یەکێتی شارستانیەتی ئیسلام بە ئەنجام گەیشت بەهۆی بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام لەنێو خاوەن ئاینە پێشووەکانی مەسیحی و زەردەشتی، ئەم گەشەسەندنە بەهێزییەی دەوڵەتی عەباسی بەردەوام دەبێت تا ساڵی ٩٧٥ ز، کاتێک تووشی شاڵاوی گەلانی دیکە هات، وەکو تورک و مەغۆل و هێرشەکانی بەربەرەکانی باکوری ئەفەریقا و عەرەبە کۆچەرەکانی نەوەی هیلال لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا، ئەم ماوە تێکچوونەش نزیکەی سێ سەدەی خایاند تا کەوتنی دەوڵەتی عەباسی و پاشان سەرهەڵدانی چاخی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی و بەردەوام دەبێت تا کاتی ئێستا.

توێنبی ئاماژە بەوە دەکات کە شارستانیەتی ئیسلام بەرەو دواوە هەنگاوی دەنا، کەچی لەهەمان کاتدا شارستانیەتی ڕۆژئاوایی بەرەو گەشەسەندن و پێگەیشتن هەنگاوی

دەنا و تەرازووی هێز. بەگرانی لای ئەو هات، بەتایبەتی لە شکستی خەلافەتی عوسمانی لە ئابلۆقەیان بۆ شاری ڤیەنا ساڵی ١٦٨٣، ڕۆژئاواییەکان هەوڵیان نەدا ئەم هەلە بقۆزنەوە، چونکە لایان وابوو تورک هێشتا زۆر بەهێزن، بەڵام لەئەنجامی گەشەسەندنی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی، عوسمانیەکان ئامادە نەبوون ڕێچکەی گەشەسەندنی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی بگرن، بەڵکو کەمترین دەرمانی ئەم شارستانیەتییەیان بەکارهێنا لەجێی جێبەجێکردنی مەشقی سوپاکەیان لەسەر سیستەمی مەشقی ڕۆژئاوایی، بەڵام ئەمە چارەسەرێکی شیاو نەبووە بەلای توێنبی، چونکە دوو دەرەنجامی هەبوو کە دەبوو یەکێکیان بێتە بوون، یان دەبێت پاداشتی هەڵەکەی وەرگرێتەوە کە کەمترین دەرمانی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی بەکارهێناوە، یاخود ڕزگاربوونیان لە لاوازی و کەوتنیان بەوەی کە بەتەواوی ڕوویان وەرگێڕن بۆ سیستەمی ڕۆژئاوایی بەهەموو سۆز و بیرو گیان و هێزەوە، و لەبەرئەوەی تورکەکان خەریک بەتەواوی خۆیان بەرنە لێواری تێکچوون چونکە ڕێگا چارەی یەکەمیان هەڵبژارد، کەچی دوای ماوەیەک بیریان لە ڕزگارکردنی بوونیان کردەوە تا کات ماوە بە هەڵبژاردنی ڕێگەی دووەم، بە وەرگرتنی سیستەمی ڕۆژئاوایی بەبێ سنوور و لەژێر سەرکردایەتی کەمال ئەتاتورک، بەڵام ئەمەش، بەلای توێنبی، نەبووە هۆی دڵارامی مرۆڤی تورک لەلایەک هەموو ئەم گۆڕانە لەژیانیو لەلایەکی ترەوە بچڕانی پەیوندییەکانی بە ڕابردووی وڵاتەکەی و کەلتوورەکەی. جگە لەمەش بە ئەوندە کۆتا نەهات جگە لە گۆڕانی لایەنەکانی ئابووری و سیاسی، بەڵکو یاسایانیشی گرتەوە کاتێک یاسای سویسریان لەجێی یاسای ئیسلام دانا، هەروەها هەڵگرانی ئەم ڕێبازە نوێیە هەوڵیاندا نیشتمانەکەیان بکەنە کۆپیەک لە گەلی ڕۆژئاوایی و وڵاتی ڕۆژئاوایی. بەڵام مرۆڤی تورکی ئێستا نە ڕۆژهەڵاتییە و نە ڕۆژئاوایی، لەگەڵ ئەوەی تورکیا لەڕووی سیاسیەوە هاوپەیمانی وڵاتانی ڕۆژئاوایە تورکیا بەبەشێک لە شارستانیاندانانێت.

تـوێنبی پێـی وایـە شارسـتانیەتی ئیـسلام شارسـتانیەتێکی زینـدووە بـەڵام شارستانیەتی ڕۆژئاوایی نا هاوتایی تێدایە لەنێو هزر و کاردا، لەبەرزکردنەوەی دروشمی یەکسانی و برایـەتی و ئـازادی کـە لـە ئـەنجامی شۆڕشـی فەرەنـسی بەرزکردایـەوە، و لەنێوان هەڵسوکەوتی ڕەگەزپەرستی، بـەڵام لـە شارسـتانیەتی ئیـسلامدا هاوتـایی هەیـە لەنێوان هزر و کـاردا، بەنموونـەی گەیـشتنی کۆیلـە لـە سـەردەمە پرشـنگدارەکانی ئـەم شارستانیە بە دەسەڵات.

- بیرۆکەی کۆتایی مێژوو :

تـوێنبی بۆمـان دیاردەخـات کـە لـە کۆتـایی سـەدەی نـۆزدەدا بەشـێکی زۆر لـە ئینگلیزەکـان بڕوایـان وابـووە کـە مێـژوو گەیـشتۆتە قۆنـاغی کۆتـایی، بەهـەمان شـێوە بەشێك لە گەلانی تری ئەورووپی، و لەئەنجامی ئەو جەنگە ناوخۆییەی کە لـە ئەمـەریکادا سەریهەڵدا بوو چینی ناوەڕاست پێـی وابـووە کـە مێـژوو کۆتـایی هـاتووە، لـەو کاتـەی هەرێمـەکانی بـاکور توانیوویانـە هەرێمـەکانی باشـوور داگیر بکـەن، و لەگـەڵ زاڵبـوونی ئەڵمانیا بەسـەر فەرەنـسا و ڕاگەیانـدنی ڕایخـی دووەمـی ئـەڵمانی سـاڵی ١٨٧١ خـەڵکی چینی ناوەڕاسـت لـە ئـەڵمانیا پێیـان وابـووە مێـژوو کۆتـایی هـاتووە، هـەروەها لەگـەڵ کەوتنی بلۆکی ئیـشتیراکی سـەرکەوتنی سـەرمایەداری ئەمـەریکی خـەڵکێکی زۆر پێیـان وابووە مێژوو کۆتایی هاتووە.

لە ڕاستیدا بیرۆکەی کۆتایی مێژوو زۆر لە ڕۆشنفیکران و فەیلەسوفانی مـژوولکردووە و باسـیان لێـوە کـردووە، بۆنموونـە (هیگـڵ) پێـی وایـە مێـژوو لەوکاتـەوە دەگاتـە مەبەستەکەی کە (فەلسەفە) ببێتە سیستەمێکی سیاسی یاخود تیۆریای دەوڵەت، بەڵام (کـارل مـارکس) بـاوەڕی وایـە کـە مێـژوو دەگاتـە مەبەسـتەکەی لـە ئـەنجامی شۆڕشـی پرۆلیتاریاوە کە کۆمەڵگەیەکی بێ چینایەتی مەبەستیەتی، بەم جـۆرە بیرۆکـەی کۆتـایی مێژوو، باس کراوە بەڵام لەلایەن توێنبی ڕەت کراوەتەوە.

- چارەنووسی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی :

گرنگیدانی توێنبی بە ڕاڤەکردنی شارستانی ڕۆژئاوایی هەروەکو خۆی دەیگێڕێتەوە کە تووشی دڵەڕاوکێ بووە دەگەڕێتەوە بۆ چارەنووسی ئەم شارستانیە بەتایبەتی ئەم ڕووداوانەی کە ئەم شارستانیە تووشی هاتووە، جگە لەمە توێنبی هاوچەرخی دوو جەنگی جیهانی بووە و باوەڕیشی وایە کە جەنگ ڕێگەیەکە بەرەو خۆ کوژی شارستانیەت، هەروەها توێنبی وای دەبینێت کە شارستانیەتی ڕۆژئاوا هێزێکی باڵەپەستۆی هەیە لەسەر سەرجەم شارستانیەکانی تری ئێستا و، و چارەنووسی مرۆڤایەتی هەمووی پەیوەستە بە ڕێڕەوی شارستانیەتی ڕۆژئاوا، ئەم شارستانیەتەش کەوتۆتە ژێر کاریگەری دوو لایەن، یەکێکیان لە مۆسکۆ و ئەوی تریشیان لە واشنتۆن، بەو پێیەی کامەیان پەنجە لەسەر دوگمەی شەڕ دابنێ ئەوا مانای فەنابوونی شارستانیەتی ڕۆژئاوایە.

تاوەکو ئێستا بۆشایی گیانی وەکو دەستداریەك وایە لە دەروونی شارستانیەتی ڕۆژئاوایی لەجیاتی پەرستنی خوای تاك پەرستنی دەوڵەت جێی دەگرێتەوە، لەجیاتی ئاینەکان ئایۆدیۆلۆجیای دروستکراوی کۆمەڵ جێی دەگرێتەوە، هەروەها توێنبی بەردەوام دەبێت و دەڵێت هەندێك لە فەیلەسوفەکان ویستوویانە گۆڕینەوەیەك لە ئاین بکەن وەك داهێنانی هزرێك یان تیۆرەیەکی فکری کە لەشێوەی ئاینی مرۆڤایەتی جێگەی ئاین بگرێتەوە، وەکو نموونەی فەیلەسوف (ئۆگەست کۆنت) بەڵام وادیارە تەنها وەکو باوەڕێکی بێ بەها مایەوە، لەبەرئەوەی پرسی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی لە ناوەڕۆکدا گیانییە نەك مادی.

بەڵام ئایا چارەنووسی شارستانیەتی ڕۆژئاوا چی یە؟ ئەگەر چارەنووسی هەموو شارستانیەتێك لەناوچوون بێت وەکو دارمانی بیست شارستانی پێشوو، مانای ئەوەیە شارستانیەتی ڕۆژئاواش هەر دەبێت لەناو بچێت، توێنبی دەڵێت چارەنووسی

شارستانیەتی ڕۆژئاوا شکست بێنێت لە پێشبینی یەکەمدا لە کۆکردنەوی جیهان لە چوارچێوەی یەك خێزاندا، لێرەشدا تەقینەوە ڕوودەدات لەڕێگەی ڕاپەڕینی نەوەکانی شارستانیەکانی تری ناڕۆژئاوایی لە دژی گەورە ڕۆژئاواییەکانیان، وە پێشبینی کردنی ئەوەی موسوڵمانەکان ڕۆڵی کاریگەریان ببێت لەم پرۆسەیەدا.

پێشبینی دووەمی توێنبی بریتی یە لە سەرکەوتنی شارستانی ڕۆژئاوایی لە یەکخستنی شارستانیە جۆربەجۆرەکان لە چوارچێوەیەکی ڕێکخستوو ئەمەش چەندین سەدە دەخایەنێت بەشێوەی ئاشتی و هەنگاو بە هەنگاو گۆڕانکاری خۆی دێنێتە پێشەوە، دیارە ئەمەش فاکتەرێکی گرنگی لەدوایە یارمەتی دەر دەبێت بۆئەمە کە بریتی یە لە گیانی مەسیحیەت کە دژی جەنگ و ڕکابەرییە و داواکارە بۆ خۆشەویستی.

- تیۆریای مەیدانخوازی و وەلامدانەوە :

لە دیارترین تیۆریەکانی فەلسەفەی مێژوو تیۆریای مەیدانخوازی و وەلامدانەوەی توێنبی یە، لە چوارچێوەی ئەم تیۆرەدا سەرهەڵدانی شارستانیەکان و داڕمانیان لێکدەداتەوە، ناونیشانی ئەم تیۆرەش توێنبی لە دەروونناس (کارل یۆنگ) ١٨٧٥-١٩٦١ی وەرگرتووە. لەبەشێکی ئەم تیۆرەدا توێنبی هەوڵیداوە گرنگی بداتە ژینگە و جوگرافیا بۆ دروستبوونی شارستانیەت و پەرەسەندنی کە ژینگەی جوگرافی سەخت شارستانیەت دروست دەکات، بە نموونەی جەختکردنەوە لەسەر ڕووباری نیل کە فاکتەری سەرەکی دروستبوونی شارستانیەتی میسرییە، بەلام لەهەمان کاتدا هاوشێوەی ڕووباری نیل هەبووە لە ولاتی دیکە بەلام شارستانیەتی دروست نەکردووە، وە ئەگەر لەنێوان هەردوو ڕووبار (دیجلە و فورات) شارستانیەت دروست بووە، کەچی لە ڕووباری ئەردەن دروست نەبووە، هەروەها زیاتر بۆمان دیاردەخات و دەڵێت ئەگەر شارستانیەتی چینی لە دەرەنجامی ڕوباری زەرد بێت کەچی هاوشێوەی ئەم ڕوبارە بریتی یە لە ڕوباری دانوب شکستی هێناوە لە دروستکردنی شارستانیەت، ئەو دەڵێت

کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەکاتی وەڵامدانەوەی مەیدانخوازییە سەختەکاندا شارستانیەت دروست دەکەن، لەبەرئەوەش شارستانیەتی میسری و سۆمەری زووتر دروست بوون.

وەکو نموونەیەك بۆ تیۆریەکەی توینبی ئاماژە بە شارستانیەتی گریکی دەکات کە سەریهەڵداوە و گەشەی کردووە لە هەرێمە سەرختەکانی (ئەتیکا) و (بۆئیا) کە دوو ناوچەی چڕی پڕ لە بەردە شاخی و ڕێڕەوی بەرتەسك و ناخۆش و ووشکن، وای لە دانیشتوانەکەی کرد کە وەڵامی مەیدانخوازی سەختی ئەم دوو هەرێمە بدەنەوە لە گواستنەوەیان لە قۆناغی دانەوێڵە چاندن و ژیانی شوانکارەیی بۆ گرنگیدانیان بە چاندنی دار زەیتوون لەبەر زەیتەکە و دەرهێنانی کانزا زۆرەکانی نێو, خاکە شاخاوییەکەی و گرنگیدانیان بە فراوانکردنی بازرگانیان بەتایبەتی لە هوردەکردنی پێداویستییان لە کەرەستە و بەرهەم بەتایبەتی ناوچەی (ئەسکۆدیا) ی باشووری ڕوسیا، کورتەی ڕاکەی کەمی دەرامەت و وشکە ساڵیٚ و زەوی شاخاوی سەخت دەبنە هۆکار بۆ سەرهەڵدانی شارستانیەت.

واتە زەوی سەخت و ژینگەی سروشتی نالەبار مرۆڤ دەوروژێنێت بۆ گۆڕینی ڕێڕەوی ژیانی یان دەستکاریکردن لە ژینگەکەی چونکە ئەمانە مەیدانخوزییە لە دژی مرۆڤ و پێویستە وەڵامدانەوە هەبێت لەلایەن مرۆڤەوە بەو پێیەی کە هێزی داهێنانی مرۆڤ دەوروژێنێت، ئەو کۆمەڵگەیەی وەڵامدانەوەی شیاو و پێویست و گونجاوی نەبو بۆ مەیدانخوازییەکە ئەوا چارەنووی لەناوچوون دەبێت، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر وەڵامدانەوەکە لە ئاستی پێویست بوو بۆ مەیدانخوازییەکە ئەوا دەبنە خاوەن شارستانیەت و بوونیان دەسەلمێنن.

لەچوارچێوەی ئەم بیرۆکەیە توینبی بۆمان بەدیاردەخات لە پێدانی نموونەی چۆنیەتی سەر هەڵدانی شارستانیەتی میسری و نێوان هەردوو ڕووبار، دەڵێت ناوچەکانی نیمچە دوورگەی عەرەب و باکوری ئەفریقا لەدوای ئەوەی پڕبوو لە خێر و بێر و بەپیتی

داهاتی زەوی بۆ بژێوی ژیان لەسەر دەمی بەرەبەیانی شارستانیەتدا، کەچی دوای ماوەیەك تووشی وشکە ساڵی و بێ دەرامەتی هات کە سەدان ساڵی خایاند تا لە ئەنجامدا دانیشتوانی بیابانی گەورە لە ئەفریقیا و نیمچە دوورگەی عەرەب بڕیان لەوە کردەوە کە دەبێت وەڵامدانەوەیان هەبێ بۆ ئەم مەیدانخوازییە، کە سێ شێوەی لە خۆ گرت، یەکێکیان پابەندبوونی بەشێك لە دانیشتوان بۆ زەوییەکانیان و شوێنی نیشتەجێیان بە وەڵامدانەوەی مەیدانخوازییەکە بە دەستکاریکردنی عادات و کەلتوورە کۆنەکانیان و دۆزینەوەی ڕێگەچارەی تری ژیان، دووەمیان بەشێك لە دانیشتووان بەرەو باشوور کۆچیان کرد، سێ یەمیان کە زۆرینەی دانیشتوان بوون بەرەو ناوچە دوورەکان کۆچرەویان کرد، چ ناوچەکانی دەلتای میسر یاخود بۆ کەنارەکانی دیجلە و فورات کە لێرەشدا تووشی مەیدانخوازییەکی تر هاتن کە بریتی بوو لە شێواوی ئاودێری و لافاو، لە سەریان بوو دەست بکەن بە چاککردنی زەوی کشتوکاڵی و ئاودێری و پاشان سەرهەڵدانی شارستانیەت لە میسر و عێراق، بەم جۆرەش وەڵامدانەوەی سێیەم سەرکەوتوو بوو، لە دروستبوونی دوو شارستانیەتی جیهانی ناودار لەو کاتەدا.

ەڵام بەڕای توێنبی مەیدانخوازی هەر لە سروشت و ژینگەوە نایەت، بەڵکو مەیدانخوازی مرۆڤیش هیچی لە سروشت کەمتر نیە، وەکو هەڵمەت و شاڵاوی وڵاتێك بۆ وڵاتێکی دراوسێ یاخود کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتی، دوژمن لەشێوەی هێرشێکی دەرەکی یاخود هەڕەشەیەکی بەردەوام لەسەر کۆمەڵگەیەکی تر دەبێت، یاخود مەیدانخوازی ناوخۆیی وڵاتێك لە چینێکی دەسەڵاتداری زۆردا یاخود کەمینەی زۆردار لەدژی چین و توێژەکانی تری وڵاتەکە، لێرەدا دەبێت وەڵامدانەوە چۆن بێت، ئایا دەبێت مەیدانخوازییەکە بەردەوام هەبێت تا وەڵامدانەوەکەش بە بەردەوامی هەبێ، یاخود بەوجۆرە کە هەرچەندە بەهێز بێت وەڵامدانەوەکەشی هەر بە هێز و لەسەر ئاستی پێویست دەبێت؟ و ئایا هەموو مەیدانخوزییەك وەڵامدانەوەیەکی سەرکەوتووی دەبێت؟

توێنبی بەردەوام دەبێت و دەڵێت، وەڵامدانەوە بۆ مەیدانخوازی یەکێك لەم سێ وێنەیەی خوارەوەی دەبێت:

یەکەم/ کەمتەرخەمی مەیدانخوازی کە نابێتە هۆی ورووژاندنی لایەنی وەڵامدانەوەیەکی سەرکەوتوو.

دووەم/ توندوتیژی مەیدانخوازییەکە کە لایەنی گیانی وەڵامدانەوەکە دەڕمێنێت.

سێیەم/ مەیدانخوازییەکە بگاتە پلەیەکی شیاو کە بتوانێت تواناکانی داهێنانی لایەنی وەڵامدەر بووروژێنێت، ئەمەش وەڵامدانەویەکی سەرکەوتوو دەبێت.

بەڵام مەیدانخوازییەکی شیاو بە تەنها یەك وەڵامدانەوەی سەرکەوتووی نابێت، چونکە ئەم وەڵامدانەو سەرکەوتووە لەلایەن خۆیەوە تووشی مەیدانخوازی دیکە دەبێتەوە بە بەردەوام لەنێو ململانێی نوێدا دەبن، تا وای لێدێ کە وەڵامە کردارییەکە دەچێتە نێو ئاوازێکی ڕێکخستوو، هەریەکە لە مەیدانخوازییەکە و وەڵامدنەوەکە بە بەردەوامی تای تەرازوو بۆلای خۆی کیش بکات، تا بکرێت لەبەرامبەر یەکتردا نەبەزن، بەڵام ئەگەر مێژووی مرۆڤایەتی بریتی بێت لەکۆمەڵێك مەیدانخوازی و وەڵامدانەوە، بۆچی شارستانیەکان تووشی داڕمان دەبن؟ بۆچی کۆمەڵگە هەیە توانای وەڵامدانەوی سەرکەوتوویان نیە، کە لەناوخۆدا ڕووخاوە پێش ئەوەی فاکتەری دەرەکی کاری خۆی بکات، هۆکاری سەرەکی کەوتنی شارستانیەت لە دەستدانی کەمینەی دەسەڵاتدارە بۆ توانا داهێنانەکەیان، ئەم توانا داهێنانیە کە ڕۆڵی سیحراوی هەبووە لە سەر (پرۆلیتاریا) واتا گەل، بەڵام زوڕناژەن چیبکات ئەگەر داهێنان و لێهاتوویی خۆی لەدەست بدات و چی دی نەتوانێت سەما بە ئامادەبووانی بکات، هەوڵدەدات لەشێوەی زەبر و تۆپزییەوە ئاوازەکەی خۆی بەسەر ئامادەبووانی بسەپێنێت، تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی کە لەجیاتی زوڕناکەی قامچییەك بەکاردەهێنێت بۆئەوەی بە لێدان و هەڕەشە سەمای بۆ بکەن، کۆمەڵگەش لە باری داڕمانی شێوەیەك لەم شێوانە پێکدێنێت:

یەکەمیان/ کەمینەیەکی دەسەلاتدار توانای داهێنانی لە دەستداوە و بە توندوتیژی و زەبرەوە فەرمانڕەوایەتی دەکات.

دووەمیان/ پرۆلیتاریایەکی ناوخۆیی چەوساوە، نارازییە، لە هەلی شۆڕش دەگەڕێت.

سێیەمیان/ پرۆلیتاریای دەرەکی کە لە کۆمەڵگە خۆی دابڕاندووە و لەهەل دەگەڕێت بۆ پەلاماردان و هێرش کردن.

بەلام ئەگەر ئەوە پێکهاتەیی ناوخۆیی کۆمەڵگەی شێواو بێت، کە لەسەر لێواری کەوتنە، فاکتەرەکانی ئەم شێواویە بەم ڕووانە دەبێت،/

یەکەم: کورتهێنانی توانای داهێنان لە کەمینەی دەسەلاتدار.

دووەم: وازهێنانی زۆرینە لە ملکەچییان بۆ کەمینەی دەسەلاتدار، چونکە ئەم کەمینەیە هۆیەکانی ڕێزلێنان و ملکەچی زۆرینەیان لەدەست داوە.

سێیەم: لەدەستچوونی یەکدیگیری کۆمەلایەتی بەهۆی بێزاری و تووڕەیی گەل یاخود لێکترازانی پرۆلیتاریای دەرەکی.

بەم شێوەیە کۆمەڵگە خۆی فاکتەرەکانی دارمانی بۆخۆی دروست کردووە، پێش ئەوەی تووشی هێرشی دەرەکی بێت، تەواو وەکو دیاردەی خۆکوژی وایە، دوای ئەوەی کە خۆی کوشتووە ئینجا دوژمنەکەی یان کەسێکی تر پەلاماری دەدات، ئەوی داگیرکەر دەیکات زەبری کۆتاییە بۆ کۆمەڵگە و لە دواساتەکانی هەناسەدانیدا دوژمن پەلاماری دەدات. بەلام چۆن کەمینەی داهێنەر بنەماکانی داهێنانی لەدەست دەدات؟ هۆکار زۆرە داهێنەر بنەمای داهێنان لەدەست بدات، کەمینەی دەسەلاتدار بەزۆر و زەبرەوە فەرمانڕەوایەتی دەکات، جەماوەریش ڕێزی بۆ دەسەلاتدار کەم دەبێتەوە. لە فاکتەرەکانی کەمینەی داهێنەر بۆ داهێنان:

١- مەی (شەراب)ی نوێ لە کوپەی کۆن : کەمینە بەهرەدارەکان و داهێنەرەکان، وەکو پێغەمبەران و ڕۆشنبیران سیستەمی نوێ دادەهێنن، بەلام لەزۆر کاتدا ئەم

داهێنانە نوێیانە دەخرێتە کوپی کۆن یان قاڵبی کۆنەوە، سروشتیش وایە هەموو کۆنێک بەرەنگاری نوێ دەبێتەوە، و دواتریش لە دەستدانی داهێنانەکە و داهێنانەکەش وەکو کۆنەکەی لێدێت، نموونەی ئەمەش کرێکارانی سیستەمی سەرمایەداری وەکو کۆیلەی سیستەمی فیودالیزمی وابوون و مانای پێشکەوتنی پیشەسازی چ بەهایەکی ئەوتۆی نامێنێت، هەروەها شۆڕشی پیشەسازی کە خاڵێکی وەرچەرخانی ژیانی ئابووری مرۆڤایەتی بوو، بەڵام بەستراوەتەوە بە فراوانخوازی دەرەکی و کۆلۆنیالیزم.

٢- نەگبەتی داهێنان و وەستانی داهێنەر : ئەگەر لە سەرەتادا داهێنەر بەهۆی داهێنانیەوە توانیویەتی متمانەی خۆی ڕابگەیەنێت بەڵام لەدواتر کە لە داهێنان دەوەستێت وهیچی پێ نامێنێت و متمانەی لەدەست دەدات و ناتوانێت بەردەوم بێت لە داهێنان و ڕەزامەندی جەماوەر، ڕۆژگاری نوێ دێت و بارودۆخی نوێ دێت، بەڵام ئەو هیچی پێ نیە کە لەگەڵ بارودۆخی نوێ بگونجێت بیدات بە جەماوەر تەنها ئەوە نەبێت کە داهێنانە کۆنەکان و هەڵوێستە ڕابردووەکانی بیر جەماوەر دەهێنێتەوە، بەڵام پێداویستییەکان لە نوێبوونەدان و ئەویش توانای نیە داهێنانی نوێ پێشکەش بکات، بەوەش ناوەستێت بەڵکو دژایەتی دەرکەوتنی داهێنەری نوێ دەبێت، بەم جۆرەش داهێنەری قۆناغی یەکەم یاخود بەهرەمەند لە پێشەنگی بەرهەڵستکارانی دیارکەوتنی داهێنەر یاخود بەهرەمەندی قۆناغی دووەمە، وە هەرچەندە داهێنەری دووەم یاخود نوێ داهێنانی تیا هەبێت و لەئاستی جەماوەردا بێت، بەڵام داهێنەری یەکەم گوێی پێ نادات و دژایەتی دەکات لە دەرکەوتن وڕەزامەندی جەماوەر.

٣- جەنگ خواستێکی خۆکوژییە و فراونخوازی ڕواڵەتی دارمان و تێکچوونە : لەبەرئەوەی کەمینەی داهێنەر توانای داهێنانیان لە دەستداوە، و لەبەرئەوەی جەماوەر لێیان بێزارن و ئەوانیش بەزەبرەوە فەرمانڕەوایەتی دەکەن، لێرەدا بۆئەوەی ئەم جەماوەرە مژوول بکەن و بواریان نەبێت بیرکەنەوە، لەبەرئەوە کەمینەی دەسەڵاتدار

یـان داهێنـەری کـۆن دەسـتدەکەن بـە نانـەوەی جـەنگی دەرەکـی و جـاری واش هەیـە دەگاتە ڕادەی دروستکردنی دەوڵـەتی زاڵ یـان ئیمپراتۆریـەت، بـەم جـۆرە فراوانخـوازی دەرەکــی تــەنها دەربڕینــی دارمــانی ناوخۆییــە لــەناو کۆمەڵگــەدا و دروســتبوونی ئیمپراتۆرییەکان ڕووپۆشی نالەباری وڵات و بێزاری جەماوەر دەگەیەنێت.

٤- پێشکەوتنی مادی ئاراستەیەکی خەڵەتاندنـە: پێشـکەوتنی مـادی و گەشەسـەندنی تەکنۆلۆژیا بەڕای توینبی بەڵگە نیە لەسەر پەرەسەندن و سەرکەوتنی کۆمەڵگە، چـونکە لەوانەیە لە قۆناغی دارمانی کۆمەڵگەدا ڕووبـدات، ئـەم شـێوازە تەکنۆلۆژیانـە ئـامێرین و جێبەجێکارین و مەرج نیە داهێنانی گیانی و فیکری لەگەڵدا بێـت، چـونکە سـەرکەوتن و پەرەسەندنی ڕاستەقینەی شارستانیەت لە سەرکەوتن و پەرەسەندنی لایەنی گیانیدایە.

- ڕەخنە لە بیروڕاکانی توینبی :

١- تــوینبی دەڵێــت بنــەمای شارســتانیەکان و پەرەســەندنیان ئاینــە و نــاوەڕۆکی شارســتانی ئیــسلام ئــاینی ئیــسلامە و نــاوەڕۆکی شارســتانی ئــەورووپی ئــاینی مەسیحییە، بەڵام دەبێت چـۆن بـاس لـە نـاوەڕۆکی شارسـتانی نـوێ و هاوچـەرخی ڕۆژئاوا بکات چونکە لە سەردەمی ڕێنسانسەوە ڕێچکەی عەلمانی لـە ئـەورووپا هاتـە پێشەوە.

٢- جوگرافیاناسەکان ناکۆکن لەگەڵ بیرۆکەی توینبی لەسەر ڕۆڵـی ژینەگـەی جـوگرافی لەسەر ئاراستەی شارستانیەکان، بەتایبەتی لـەڕووی بابـەتی ڕۆڵـی سروشـتی شـیاو لەسەرهەڵدانی شارستانیە بنەڕەتیەکاندا نەك جوگرافیای سەخت بە تەنها.

٣- توینبی لەلایەك دەڵێت شارسـتانیەتی میـسری دەسـتپێکی سـەرجەم شارسـتانیەتە ناسـراوەکانی مێـژووبووە، کەچـی لەلایـەکی تـر دەڵێـت شارسـتانی میـسری لـە شارستانیەتە دابڕاوەکانە.

٤- تـوێنبی جـەخت لەسـەر کـەلتووری مرۆڤایـەتی و لایـەنی گیـانی دەکاتـەوە لـە سـەرهەڵدان و پێـشکەوتنی شارسـتانیەت، بـەڵام ئایـا بـەڕای تـوێنبی ڕۆڵـی پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا و پیشەسازی ئێستامان چۆن هەڵدەسەنگێنێت، بەتایبـەتی تـوێنبی دەڵێـت هـیچ پەیوەندییـەك نیـە لـەنێوان پێـشکەوتنی تـەکنۆلۆژی بـە پێشکەوتنی شارستانی، بەڵام ئەمەی توێنبی ناتوانرێ قبوڵ بکرێت.

٥- ڕەخنـە لـە تـوێنبی دەگیرێـت بـەوەی کـە شارسـتانی ئیـسلامی کردۆتـە نـەوەی شارستانیەتی سریانی.

٦- ئەو فەرمانەی کە تـوێنبی دەریکـردووە لەسـەر شارسـتانی ئیـسلام قورسـە چونکە دەڵێت بۆئەوەی گەلانی ئەم شارستانیە لەناو نەچن دەبێت پابەندی بیروبۆچـوون و ڕەوتی ژیانی گەلانی شارستانی ڕۆژئاوایی بـبن، چـونکە شارسـتانی ئیـسلام لەگـەڵ کـەوتنی دەوڵـەتی عەباسـی پێـی ناوەتـە قۆنـاغی تێکـچوون و هەرچـی بکرێـت بـۆ زیندووبوونەوە و نوێبوونەوەی بێ سوودە.

سەرچاوەکانی توێژینەوەکە :

د. أحمد محمود صبحي :

١- فلسفة التأريخ، مؤسسة الثقافة الجامعية، الاسكندرية، د.ت.

د. آكو برهان محمد :

٢- أثر العامل الجغرافي في نشوء الحضارات القديمة، مجلة جامعة كوية، أربيل، ١٩٧٤.

ألبان. ج. ويدجري :

٣- التأريخ و كيف يفسرونه من كونفوشيوس الى توينبي، ترجمة عبدالعزيز توفيق، الهيئة المصرية العامة للكتاب، القاهرة، ١٩٧٢.

توينبي :

٤- الحضارة في الميزان، ترجمة: أمين محمود الشريف، دمشق، ٢٠٠٦.

٥- مختصر دراسة التأريخ، ترجمة: فؤاد محمد شبل، لجنة التأليف و الترجمة، القاهرة، ١٩٦٠.

صدقي عبدالله خطاب :

٦- آرنولد توينبي، مجلة عالم الفكر، الكويت، ١٩٧٤.

لمعي المصايعي :

٧- آرنولد توينبي .. عرض و دراسة، دار الكتاب العربي، القاهرة، ١٩٦٧.

محي الدين اسماعيل :

٨ توينبي منهج التأريخ و فلسفة التأريخ، ط٢، بغداد، ١٩٨٦.

د. هاشم يحيى الملاح وآخرون :

٩- دراسات في فلسفة التأريخ، دار الكتب للطباعة و النشر، الموصل، ١٩٨٨.

د. هاشم يحيى الملاح :

المفصل في فلسفة التأريخ، دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠٠٧.

# گەشەکردنی بزوتنەوەی نیشتمانی لە ئێران
# بزوتنەوەی نەتەوایەتییە دیموکراتییەکان

و: د. محەمەد عەبدوڵا کاکە سوور

تێبینی ئەوەمان کرد کە ئەو ماوەیەی لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە تاکو ساڵی ۱۹۲۵ کە ڕەزا شا چووە سەرتەخت بە پەشێوەی لە ناوەوەی ئێران جیادەکرێتەوە، لەلایەکەوە شایەکان زۆربەی ڕۆژەکانی ساڵیان لە ئەورووپا بردە سەر کە خۆش ڕایان دەبوارد و بەبێ حیساب پارەیان خەرج دەکرد، لەلایەکی تریشەوە ئەرکەکان لەسەر گەلانی ئێران پتر دەبوون وەکو سەپاندنی باجە جۆربەجۆرەکان لەپاڵ تۆقاندن و ترساندن کە لەسەر دەستی دارو دەستەی شا ڕووبەڕوویان دەبووەوە، لەدوای ئەوەش ڕەزا شا هاتە سەر تەخت و بەتەواوی دەسەڵاتی گرتە دەست، دیکتاتۆریەتییەکی قێزەونی سەپاند کە لە ئەنجامەکانی لەناوبردنی هەموو دوژمنەکانی بوو بەتایبەتی سەرکردەکانی بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی، بەر لە بەرچاوگرتنی پەیوەستبوونی ڕەزاشا یان ئەوانەی پێش ئەو بە دەوڵەتە ئیستیعمارییەکان لەڕێگای بەخشینی جیاوکەکان یان واژۆکردنی ڕێککەوتننامە بازرگانی و سیاسیە نا هاوتایە نا حەقەکان بەرامبەر بە مافی هاوڵاتیە ئێرانییەکان، و بەردەوامبوونی چەوساندنەوەی کەمە نەتەوایەتییەکان، هەموو ئەمانە بوونە هۆی پێکهێنانی بزوتنەوەی نەتەوایەتی دیموکراتی و پێکهێنانی کۆماری دیموکراتی سەربەخۆ یان بەهرەداربوون لە ئۆتۆنۆمی کەچی نەدەکرا کە پەیوەست بێ بەو حوکمە دیکتاتۆرییە ئێرانییەی کە لەو کاتەدا باو بوو.

شۆڕشی غیلان :

ئەم هەرێمە بچووکە بەهۆی بوونی زنجیرە چیای بورز کە بە بڕی ١١٠٠٠– ١٦٠٠٠ پێ لە ئاستی ڕووی دەریا بەرزە لە ڕووی جوگرافییەوە بە جیابووەوە دادەنرێ لە دەشتی ئێران و تاران. دەریای قەزوینیش دەکەوێتە باکورەوە، کە لە ڕێگایەوە بە ڕووسیا دەگات. غیلان سەربەخۆییەکی ئابووری ولەخۆ زیادبوونێکی کشتوکاڵێ هەیە. ئینجا شوێنی غیلان لەڕێگای بازرگانی نێوان تاران و باکۆ مانای ئەوەیە کە بەندەری ئەنزلی (پەهلەوی) و (ڕشت) پایتەختی هەرێمەکە لەنێوان گرنگترین سەنتەرە بازرگانییەکانە لە ئێراندا. بەم شێوەیەش دەتوانین بڵێین کە غیلان گۆشەگیری جوگرافی، خۆتێرکردنی ئابووری، جیاوازی زمان، چینێکی ناوەڕاستی گەورەی بە ڕادەیەك کە پشتگیری نەتەوایەتی خۆجێیەتی کرد، هەیە. کوچك خان، سەرکردەی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی غیلان موڵکدارێکی مامناوەندی خۆشگوزەرانی زەوی و زار و خاوەن عەقڵییەتێکی لیبراڵی بوو. کوچك خان نەتەوە پەروەر بوو گەرچی پابەندبوونی یەکەمی ئاراستەی میللەتی ئێرانی کرابوو نەك تەنها هەر غیلان بکرێ. ئەو پیاوە بچووکەی کە زۆرجار نوسەرە ڕۆژئاواییەکان بە شیوعی وەسفی دەکەن، ئایندار بوو، بنەما نیشتمانی و ئاینییەکانی تێکەڵ بە یەکتری دەکرد[١].

لە ساڵی ١٩١٥ کوچك خان لەگەڵ کۆمەڵە گەنجێکی نیشتمان پەروەر کۆبووەوە کە بە پەرۆشبوون بۆ چاکسازیکردن لە ئێراندا و ڕزگارکردنی لەو ئاژاوەیەی کە خنکاندبووی، لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە بەرنامەیەکی چاکسازی دابنێن داوای سەربەخۆیی تەواوی ئێران و ئەنجامدانی چکسازی کۆمەلایەتی و دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیارە چەوساوەکاندا بکات، کەچی ئەوانەی بەڕووی ئەم بەرنامەیە وەستانەوە ئەو بێگانانە بوون کە بەرژەوەندی گەورەیان لە ئێراندا هەبوو، لەگەڵ گەورە موڵکداری زەوی و زارەکان و سەرۆك هۆزەکان. حکومەتی ئێرانی ساڵی ١٩١٥ لە تێڕوانینی کوچك

خان و لایەنگرەکانی لە سەربەخۆیی دابڕدرا بوو، لەژێر ویستی سیاسی هەریەکە لە بەریتانیا و ڕوسیای تزاری دا بوو. کوچك خان لە غیلانەوە دەستی بە ڕێکخستنی جوتیاران کرد، هێشتا ساڵی ۱۹۱۷ نەهاتبوو کە ئەو و ئیسلاح ئەڵلا سەرکردەی دارستانەکانی (جەنگلی)، دژی حکومەتی مەرکەزی و قەڵەمڕەوی بەریتانی بوونەوە، لەو ساڵەشدا لیژنەیەکی شۆڕشگێڕیان پێکهێنا، کە بە (یەکێتی ئیس لامی ناونرا) و بەرنامەیەکی نیشتمانی خستە ڕوو. سوودیان لە ئەزموونی شارەزا سەربازییەکان لە تورکەکان و ئەڵمانەکان وەرگرت، فون باختی بووە ڕاوێژکاری ئەڵمانی کوچك خان. ئەو تورك و ئەڵمانانە پەیوەندییەکی پتەوییان بە بزوتنەوەی کرمەنشا هەبوو کە لەکاتی خۆیدا لەبار بردرابوو. پشت بەستنی کوچك خان بەمانە بووە هۆی ئیحسان ئەڵلا ئازەربیجانی ڕەسەن لەو دوور بکەوێتەوە، ئەوەبوو کە پێی باشتر بوو هاوکاری لەگەڵ شۆڕشگێڕانی بەلشەفیکی ڕوسدا بکات. شۆڕشگێڕان توانیان بە تەواوی دەست بەسەر هەرێمی غیلاندا بگرن، کاپتن نوئێل کە ئەفسەرێکی هەواڵگری بەریتانی بوو و ملارنی کونسوڵی بەریتانی و واو کوتی بەڕێوەبەری بانقێك لە ڕشت گیران. ئینجا هێزەکانی (دنستر) گەیشتە سنووری غیلان، لەدوای چەند بە یەکدادانیك لە ئابی ۱۹۱۸ سەرکردەی هێزەکان ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ کوچك خان مۆرکرد، ئەوەبوو ڕێگای پێدان بەرەو سنووری قەزوین تێبپەڕن. ئینجا دەستپێشخەری دەرکردنی شارەزا ئەڵمان و تورکی کرد و کاپتن نوئێلی ئازاد کرد. کەچی کوچك خان ڕای کردە دارستانەکانی غیلان، ئەمەش دوای شکستی هێزەکانی بوو لەسەر دەستی تیپی قوزاقی ئێرانیەکان هەر دەشبووایە بەدوای هاوپەیمانی نوێدا بگەڕێن، تەنها شۆڕشگێڕە ڕوسەکانیش لەبەردەمی ئەو و ئیحسان ئەڵلا هەبوو، و کوچك خان توانی هێزێك پێکبهێنێت کە ژمارەی گەیشتە دەوروبەری شەش هەزار کەس[۲].

وادیارە کە ڕێکەوتننامەی نویٚ لەگەڵ شۆڕشگێڕانی بەلشەفیکی جیٚ پێی (یەکێتی ئیسلامی) لەقاند، بەتایبەتی لەدوای ئەوەی دوژمنانی بزوتنەوەکە هاوپەیمانیکردنیان لەگەڵ بەلشەفیکەکان ئیستیغلال کرد، و دەستیان بە بڵاوکردنەوەی قسە و قسەڵۆك و دەنگۆی ئاینی کرد. لەگەڵ ئەوەش بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی لەسەر ڕەوتی خۆی بەردەوام بوو و زەوی بەسەر جوتیارەکاندا دابەش کرد، کەچی ڕووبەڕووی گیروگرفتی ئەو پەنا بەرانە بووەوە کە بەهۆی شەڕەوە ڕژانە سەر شارەکان. کوچك خان ناوی (کۆماری سۆڤیەتی سۆشیالیستی فارسی) لە حکومەتەکەی نا، کەچی پێنەگەیشتنی چینی کرێکاران و جوتیاران، و خەریکبوونی شۆڕشی ڕووسی بە شەڕکردن دژی دوژمنەکانی لە ناوەوە و دەرەوە بووە هۆی لەناوچوونی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی لە غیلان.

دوای لەناوبردنی بزوتنەوەی کوچك خان سەکردەکانی پارتی شیوعی ئێرانی چوونە باکۆ کە لەویٚ بە ووردی لەو هۆ و پاڵنەرانەیان کۆڵییەوە کە بوونە هۆی هەڵوەشانەوەی کۆماری غیلانی سەربەخۆ. لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٠کۆبووەوەکان بەیانێکیان دەکرد کە ناوەڕۆکەکەی ئەمە بوو (ناکریٚ کە کودەتایەك لە ئێران بکرێت پێش ئەوەی کە سەرمایەدار و دەوڵەمەندەکان لەناو ببردرێن) کەچی کەتیبەیەکی ئیستیتلاعی لە ٦٠٠٠ کەس پێکهێنرا بۆئەوەی ببێتە پێشەکی هێزەکان، ئەم کەتیبەیەش بە (دواکارانی هەق) ناونرا. و تواتی فەرمانگای مەرکەزی پۆستە و گەیاندن بگرێت و موقەدەم شەهاب کە ئامیر بوو تیایدا بگریٚ و بەندی بکات. لە بیست و پێنجی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٢٢ بەشی گەورەتر لە شارۆچکەکە، بە بارەگای حکومەتیشەوە کەوتە دەستی شۆڕشگێڕانەوە، ڕەزاخان فەرمانی کرد بە هەموو هێزەکانی حکومی لەو ناوچەیەدا کە بچنە پاڵ حامییەی تەوریٚز، و شۆڕشگێڕان دڵنیابوون لە سەرکەوتن و ئاڵای شۆڕش لەسەر بینایەی بارەگای حکومەت بەرز کرایەوە. هەروەها لیژنەی شۆڕشگێڕیش پێکهینرا، و ئەو بەیانانەی شۆڕشیش دەرکرا کە لە سەری ڕێکەوتبوون.

لەدوای سێ ڕۆژ لە سەرکەوتن لە تەورێز واتە لە بیست و هەشتی کانوانی دووەمی ١٩٢٢ هێزە بەکرێگیراوەکانی حکومەت توانیان بچنە ناو شارەکەوە، و شۆڕشەکەش بە ئاگر و ئاسن دامرکێنرایەوە. هەرچی هۆیەکانی شکستە بۆ ئەمانە دەگەڕێتەوە:

١- کورت بوونەوەی بزوتنەوەکە لە تەنها تەورێزدا و نەگرتنەوەی هەموو ناوچەکە واتە ئازەربیجان.

٢- بەهێزی و چڕی هێزە حکومییە پاڵپشت کراوەکان بە سوپای سپی و هێزە ئیستیعمارییەکانی تر و گردبوونەوەی لە لایەنەکانی ئازەربیجاندا.

٣- حکومەتی شۆڕشگێڕی لە ڕووسیا نەیتوانی بە چالاکی پاڵپشتی بزوتنەوەکە بکات، ئەمەش لە ئەنجامی خەریکبوونی بەو شەڕە ناوخۆییەی کە لەو کاتەدا هەڵگیرسابوو، و گەلەکۆمەکردنی هێزەکانی هەڵگەڕانەوەی ڕەش و دەستەکانی ئیمپریالی دژی.

٤- لاوازی هێزەکانی شۆڕشگێڕی لە تەورێز بە بەراورد کردن لەگەڵ هێزەکانی دوژمن و دەست پێشخەری یەکەمیان بە دەرکردنی هێزە بەکرێ گیراوەکانی حکومەتەکاتی سەرکەوتنی لە تەورێز بەرەو ئەودیو سنووری ئازەربیجان بەڵکو ئەوەندە وەستان کە لە تەوریز وەدەریان نێن[٢].

لە ڕاستیدا شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستی ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە ڕوودانی ڕاپەڕینە میللییەکان لە ئێراندا و بەتایبەتی لە ناوچەکانی باکوردا کە پەیوەندیکردن بە ڕووسیا ئاسانە. هەرچەندە فارس بە سەرکەوتوویی بەرەنگاری داواکارییە دیپلۆماسیەکانی حکومەتی بەریتانیا بووەوە، و سەرەڕای ئەوەی کە گەیشتە چارەسەرێکی مایەی ڕەزامەندی و ماقووڵ لەگەڵ حکومەتی بەلشەفی کەچی وڵاتەکە لە سەرەتای ساڵی ١٩٢١، لە ڕووی دارایی و ئیدارییەوە لە بارودۆخێکی بێ ئومێدی دابوو، و خەزێنەی وڵات تووشی ئیفلاس بوون بووبوو. کوچك خانی هەڵگەڕاوە بە یارمەتیدانی

لە لایەن بەلشەفیکەوە- کۆمارێکی لە غیلان دامەزراند، ئەوە و خۆراسان و کوردستانی فارسی لە بارودۆخی جۆش و خرۆشی و ڕاپەڕیندا بوو و سەرکردەی هۆزەکان لە باشوور دژایەتی حکومەتیان دەکرد"[٤].

هێزەکانی فارسی بەسەرکردایەتی ڕەزا خان خەریك بوون بە دانانی ئاستێ بۆ بڵاوبوونەوەی شۆڕشە چەکدارییەکان " لە ساڵی ١٩٢٢ ڕەزا شا کۆتایی بە هەڵگەڕاوەکان لە ئازەربیجان و کوردستان و خوراسان هێنا و حوکمی لە سێدارەدانی بەسەر سەرکردەکاندا جێبەجێکرد و ئەو هەرێمانەی بۆ دەسەڵاتی حکومەتی مەرکەزی گەڕاندەوە"[٥].

لە ساڵی ١٩٢٦ وەکو بەردەوامییەکی چالاکییەکانی شۆڕشگێڕی لە بەشەکانی تری ئێرانیش شۆڕش لە خوراسان هەڵگیرسا، ئەم شۆڕشەش بەسەرکردایەتی سالار جنك بوو لەگەڵ هاوڕێکانی کە نزیکەی حەوت سەد کەس بوون، بەڵام لەبەر ئەوەی لە ڕووی ڕێکخستنەوە بە سەنتەرەکانی شۆڕش لە لایەکانی تر و تەقینەوەی بە خێرایی و بەشێوەیەکی خودی، نەتوانینی شۆڕشگێڕان لە ئازەربیجان و ناوچەکانی کە لەکاتی گونجاودا زیارمەتی شۆڕشگێڕانی خوراسان بدەن، ئەوەبوو هێزە بەکرێگیراوەکانی حکومەت خۆیان بۆ یەکلا کردەوە و ئەنجامەکەیشی شکست بوو.

پیلان گێڕان دژی عەرەبستان :

هەرێمی عەرەبی -عەرەبستان- یان وەکو دانیشتوانە عەرەبەکانی بە ئەهواز ناوی دەنێن، و خوزستانی ئێران وەکو ئێرانی زەوتکەر ناوی دەنێن، دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای تەپۆڵکەکانی ئێران، کە زنجیرەیەك چیا هەیە، کە لە پێکهاتنی لە مانگێکی کراوە بەسەر باشووری ڕۆژئاوای دەچێ، یەکێك لەسەرەکانی لەگەڵ کەناری کەنداوی عەرەبی بۆ باشووری شارۆچکەی بەندەربوشەهر نزیك دەبێتەوە. کەرچی سەری دووەمی ئەوا بە چیاکانی عێراقەوە نووساوە بۆ باکوری شاری کوت. و لەنێوان ئەم زنجیرە چیایە و لەنێوان کەنداوی عەرەبی، چەند دەشتێکی بە پیت و بەرەکەت لە زەوی عەرەب هەن، کە لە کۆندا بەناوی عەرەبستان ناسراوە وئەحواز پایتەختی بووە.

ڕووبەری ئەم ناوچە عەرەبییە دەگاتە (١٨٥) هەزر كیلۆمەتری چوارگۆشە، و سامانی بێشومار لە پەترۆڵ بەخۆوە دەگرێت. ئەم ناوچە عەرەبییە ئۆتۆنۆمی خۆجێییەتی هەبوو بەڵام سەر بە سەڵتەنەی عوسمانی بوو، لەبەرئەوەی توركەكانیش بەشداری شەڕیان دژ بە بەریتانیا كردبوو، ئەوە دەوڵەتی دوایی وابینی كە ئێران هانبدات بەوەی هەندێ دەستكەوتی پێبدات بۆ ئەوەی بیخاتە پاڵ خۆی. ئەمەش پاڵی بە ئەحمەد شای قاجاری ئیمپراتۆری ئێرانەوە نا كە عەرەبستان داگیر بكات، بۆ بێهێزكردنی قەڵەمڕەوی تورك و بۆ مسۆگەركردنی ئەوەی ئێران بچێتە پاڵ هاوپەیمانەكان، كە لە ساڵی ١٩١٦ جەنەڕاڵ ڕەزا خان جێگری وەزیری بەرگری ئێرانی سەركردایەتی سوپایەكی ئێرانی كرد و بەرەو عەرەبستان بە نیازی داگیركردنی بەڕێكەوت، بەڵام دانیشتوانی ناوچە عەرەبیەكە ڕاپەڕین بۆ پارێزگاریكردنی وڵاتیان لە هێرشی لە ناكاوی ئێران. چیاكانیان كرد بە بارەگایەك بۆ خەباتە خۆڕاگرەكەیان. لەدوای دوو مانگ و نیو لە بەرنگاری عەرەبی سوپای ئێرانی ناچاربوو كە بكشێتەوە[٦].

ڕەزا شا بە بەشداریكردن و یارمەتی بەریتانیا توانی عەرەبستان زەوت بكات و بیخاتە سەر ئێران. كەچی گەلەكەمان خەباتێكی دوورودرێژ و بەیەكتر بەستراوی دژی ئیمپراتۆرییەتی كۆنەپەرستی كۆلۆنی ئێرانی لە ساڵی ١٩٢٥ تاوەكو ئێستا كرد، ئەمە سەڕای ئەوەی كە تووشی ناشیرینترین شێوەكانی چەوساندنەوە و تۆقاندن و سەرپێ شۆڕكردنی نەتەوەیی هاتن. لەپاڵ چەوساندنەوەی ئیستیعماری ئەنگلۆ- ئەمەریكی و كۆمپانیا مۆنۆپۆلییەكانی كە خێر و خێراتی كانزایی و كشتوكاڵی گەلمان تالان دەكات. گرنگترین بزوتنەوە ڕزگاریخوازییەكان ئەمانەبوون:

- بزوتنەوەی كەعبی دبیس بەسەركردایەتی شێخ حەیدەر (لە ناوچەی میناطەسەر ڕوباری دبیس لە ساڵی ١٩٤٠).
- بزوتنەوەی شێخ عەبدوڵا خەزعەل، كە بە بزوتنەوەی هۆزەكان دەناسرێ ئەمەش لە ساڵی ١٩٤٢ بوو.

- بزوتنەوەی شێخ جاسمی خەزعەل و بزوتنەوەی قەمەرییە دەناسرێ ئەمەش لە ساڵی ١٩٤٣ بوو.
- بزوتنەوەی هۆزی نەسار بەسەرکردایەتی شێخ مەزخور نەساری لە ناوچەی قەسەبە لەسەر کەناری شەتی عەرەب لە باشوری ڕۆژئاوای وڵات لە ساڵی ١٩٤٦.

بەرهەمی ئەم بزوتنەوانەش بەرزکردنەوەی هۆشیاری سیاسی بوو لەلایەن هەندێ لە گەنجانی عەرەبی ئەحواز[٧].

بێگومان ئەو کردەوە سەرەکییەی کە حکومەتی ئێرانی دوای داگیرکردن ئەنجامیدا کۆچپێکردنی عەرەبەکان و نیشتەجێکردنی ئێرانییەکان لە جێگای ئەواندا بوو، ئەمەش لە هەوڵێکدا بۆ لێدانی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی ئەحواز کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە سەرووتر بووندا بوو، لەگەڵ بزوتنەوە ڕزگاریخوازییە نیشتمانییەکانی تر لە ئێراندا دەست لە ملان دەبوو. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٢٧ دکتۆر ئەفسەر ئەو مەترسییەی زانی کە دەکرێ توشی ئێران بێت ئەگەر نەتەوایەتی عەرەبی لە خوزستان لەڕێگای سنووری عێراقەوە پەرە بسێنێ. و چارەسەرکردنەکانیشی وەکو خوارەوە بوو:

"نەهێشتن یان کەمکردنەوەی زمانی عەرەبی وەکو زمانێکی قسەپێکراو لە ئێراندا، دووبارە ڕێکخستنەوەی هەرێمەکان بە جۆرێك بکرێت ناو و شوناسی خوزستان بناسرێتەوە، و هەندێ لە هۆزە عەرەبییەکان بۆ بەشەکانی تری ئێران بگوازرێنەوە"[٨].

بە دەراوتنی عەرەبستان ئەو هەرێمە عەرەبییەی ئێران زەوتی کرد ئەمەش لەبەر ئەو سامانە پەترۆڵی و کشتوکاڵییانەی بەخۆیانەوە دەگرێت، ئەوە بزوتنەوە نەتەوایەتییەکانی تر لە ئێران بەتایبەتی لە باکور کە لەماوەی ١٩٠٦– ١٩٤١ سەریانهەڵدا بەهۆی زۆرەوە شکستیان هێنا، لەوانە پێنەگەیشتنی هۆشیاری سیاسی لەلای ئەو جوتیارانەی بەشی هەرە زۆر لە دانیشتوانی ئێران پێکدەهێنن، و نەبوونی چینی کرێکاری سەرکردە، هەروەها بارودۆخی تریش وەکو خەریکبوونی شۆڕشی بەلشەفی بە لەناوبردنی دوژمنەکانی لە ناوخۆ و شەڕکردن دژی دوژمنان لە دەرەو ڕۆڵی خۆیان

هەبوو، ئینجا سەرکەوتنی خێرا و یەکلاییکەرەوەی شۆڕشی ئۆکتۆبەر پاڵی بە هەندێ شیوعی و دیموکراتی نا کە پەنا ببەنە بەر ڕێگای خەباتی چەکداری یان شۆڕشی چەکداری بەچاولێکەری شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەو بۆچوونەیانەوە کە دەتوانن سەرکەوتنی تەواو بە دەست بهێنن. لە بەشی تردا تێبینی ئەوە دەکەین کە هەمان ئەو هەڵانەی لەو ماوەیەدا ئەنجامدران جارێکی تر لەکاتی پێکهێنانی هەردوو کۆماری ئازەربیجان و مەهاباد دووبارە کرانەوە. بەهەر حاڵ گەشەکردنی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نیشتمانی ئێرانی لەو ماوەیەدا ئەو ئەزموونانەی کە پێیدا ڕۆیشتن گورپوتینێکی بەهێزی پێدا و پاڵنەرێکی خێرایش بوو، ئەمەش لە ترۆپکی سەرکەوتنی بەخۆماڵیکردنی پترۆڵی ئێرانی ڕەنگی دایەوە.

بەشی دووەم

١٩٤٢ — ١٩٥٣

پاری یەکەم

گەشەکردنی دۆزی پەترۆڵ

کۆتایی فەرمانڕەوایی دیکتاتۆری شا ڕەزا پەهلەوی بە دەستهەڵگرتنی بوو لە تەخت بۆ کوڕەکەی محەمەد ڕەزا پەهلەوی، و چوونە دەرەوەی لە وڵات و هەرەسهێنانی سوپای ئێرانی کە ڕەزا شا بە درێژایی بیست ساڵ بە بەردەوامی بەهێزی دەکرد، و ئێران چووە بارودۆخێکی نوێوە. ئەوەبوو هێزەکانی سۆڤییەتی و بەریتانی لەترسی ئەوەی ئێران بکەوێتە دەست نازییەکان وڵاتەکەیان داگیرکرد. ڕێکەوتننامەیەکی سێ لایەنی لەنێوان حکومەتی ئێرانی و هەردوو حکومەتی یەکێتی سۆڤییەت و بەریتانی لە بیست و نۆی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٤٢ واژۆ کرا. بوونی هێزەکانی ئەمریکیش لە وڵاتدا بە هەنجەتی ئەوەبوو لەژێر سەرکردایەتی گشتی بریتانیدا بوو[٩].

لە ماوەی ئەو بارودۆخە تایبەتییەدا، جۆرەها شەپۆل و پارتی سیاسی و هەروەها ڕۆژنامەی سیاسیش پەرەیان سەند. هەرچەندە کاتەکەش لواو نەبوو بۆ دیموکراتییەت ئەوەبوو ئەنجومەنی نوێنەرانی ئێرانی لەو ماوەیەدا وەکو هێزێکی ڕاستەقینە لە ژیانی سیاسی ئێرانیدا بەدیارکەوت، هەروەکو لە خۆماڵیکردندا گەواهیدەری ئەمە دەبێت. دیارترینی پارتە سیاسیەکانیش و بەهێزترینیان لە ڕووی ڕێکخستنەوە پارتی (تودە)ی خاوەن ئاراستەی شیوعی بوو، کە ڕۆڵێکی گەورەی لەو ڕووداوانەدا بینی کە لە دواییدا ڕوویاندا، بەتایبەتیش لەکاتی کردەوەی خۆماڵیکردنی پەترۆڵدا، پارتی دووەمی دیاریش پارتی ئێرانی بوو. نووسەرە بۆرژوازییە ڕۆژئاواییەکان بوونی پارتی خاوەن ڕێکخستن ڕەت دەکەنەوە بەڵکو ئەوانە بوونی خەباتی گەلانی ئێرانیش دژی هێزەکانی ئەنگلۆ-ئەمریکی ڕەت دەکەنەوە، ئەو هێزانەی کە وڵاتیان داگیرکرد. ئەوەتا جۆن مارلو دەڵێت: "ئەو شتەی کە ئێران جیادەکاتەوە ئەوەیە کە ئەو بزوتنەوە نیشتمانییە ئەنجامی بزوتنەوەیەکی ڕووبەڕووبوونەوە دژی هێزی داگیرکەرەکان و لە چوارچێوەی کاری پارتی سیاسی یەککگرتوو گەشەی نەسەند. زیاتر لە پێگەیشتنێکی بەدوای یەکتردا هاتووی تاکەکان دەچوو، کە پەرەسەندن لە نێوانیاندا بەشێوەیەکی نا هۆشیارانەیە، بەبێ ڕێکخستن بەبێ بەرنامەیەکی سیاسی و تەنانەت بەبێ ئەو زانینە گشتییە پێویستە بۆ ئەنجامدانی چاکسازی کۆمەڵایەتی کە هێز و یەکترگری بە چەندین بزوتنەوەی نیشتمانی دەورە دراوە"[101].

ئەوەی کە مارلو باسی لێوەکرد ئەوەندەی کە دەلالەتە لەسەر شێواندنێکی مەبەستدار بۆ مێژووی بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی ئەوەندە دەلالەت نییە لەسەر نەزانی، هەروەها هەوڵێکی بێ ئومێدانەیە بۆ ڕەتکردنەوەی ڕێکخستن لە ناوەوەی ئێران لەو کاتەدا کە بزوتنەوەی نیشتمانی سەرەتایەکی نوێ بووەوەی بەخۆوە بینی بۆ خەباتی جەماوەری ئێرانی دژی مۆنۆپۆلییە بێگانەکان و دەرەبەگایەتی و خێزانی فەرمانڕ'وا پێش شەڕی دووەمی جیهانی.

لە ئەنجامی داگیرکردنیش ئێران دابەشکرایە سەر سێ ناوچە: ناوچەی بەریتانی لە باشوور، ناوچەی ڕوسی کە زۆربەی پێنج هەرێمەکەی باکوری ئازەربیجان و غیلان و مازندەران و ئاسترئاباد و خوراسان (بە دەرواوتنی شاری مەشهەد) پێکدێت، هەرچی ناوچەی سێیەمە ئەوە داگیرنەکراوە و لە زۆربەی ناوچەی ناوەڕاست پێکدێت لەوانەش شارەکانی تاران و ئەسفەهان و مەشهەد. شتێکی سروشتی بوو کە هێزەکانی سۆڤییەتی پارێزگاری لە هێزە نیشتمانی و دیموکراتییەکان بکات لەو ناوچانەدا کە هێزەکانیان پارێزگارییان دەکرد. بۆیە ڕێکخستنە شیوعی و دیموکراتییەکان بەشێوەیەکی خێرا پەرەیان سەند. هەرچی بەریتانیایە ئەوە هەوڵیدا کە دەسەلاتی خۆی بەسەر ئێراندا درێژ بکاتەوە، لە هەموو ئاوات و ویستەکانی جەماوەر بدات کە مەبەستییان بوو لە کۆمپانیای ئەنگلۆ- ئێرانی مۆنۆپۆلی ڕزگاریان ببێت. " سیاسەتی بەریتانی لە ناوچەی داگیرکراوی بەریتانی - لەگەڵ ئەوەی لەگەڵ سیاسەتی ڕوسیش جیاوازبوو- قەرزاری بوونی کۆمپانیای ئەنگلۆ- ئێرانی، و دووبارەکردنەوەی پەیوەندییە بەرتانییەتەوەکانی پێشووبوو لەگەڵ هۆزەکانی باشوور.."[11].

سیاسەتی بەریتانی لەسەر لێدانی هەموو بزوتنەوەکانی ڕزگاریخوازی نیشتمانی لە ناوچەکە ڕاهاتبوو، و ڕێگای خۆشکرد لەبەردەم هاتنە ناوەوەی ئیستیعماری ئەمەریکی. لەئابی ١٩٤٢ بڕیاردرا کە سوپای ئەمەریکی خۆی گواستنەوەی وشکانی و ئاسمانی و دەریایی لە ڕێگای ئێرانەوە بگرێتە دەست. لەمانگی تشرینی دووەمی هەمان ساڵیش سەرکردایەتی باڵای سوپای ئەمەریکی لە کەنداوی عەرەبی کە دەورووبەری سی هەزار پیاوی بەخۆوە دەگرت ڕێکخرا.."[12]. ئەوە و چەسپاندنی دەسەلاتی دەوڵەتە ئیستیعمارییەکانی وەکو بەریتانیا و ولاتە یەکگرتووەکان لە ئێران، و بەردەوامبوونی هاتنە ناوەوەیان بە هەموو ئامرازەکانەوە بە پاساوی دژایەتی کردنی قەڵەمڕەوی نازی. سەرەڕای هەموو ئەو کارانەی کە هاوپەیمانەکان دەسەلاتی خۆیان لە ئێران پێ چەسپاند

ئەوە سیخوڕیایەتی ئەڵمانی چەکی خۆی فڕێنەدا، بەڵکو توانی چەند کەسانێك لە گەورە کەسایەتییەکانی ئێران بۆلای خۆی کێش بکات. لەساڵی ١٩٤٢ سیخوڕێ مەترسیداری ئەڵمانی (مایر) توانی هێزەکانی باشووری ئێران دژی هاوپەیمانەکان هانبدات ئەمە لەکاتێکدا کە سوپایەکانی ڕایخ لەسەر ئەوەبوون کە بگەنە قەوقاز. لەوەدا سەرکەوتووبوو کە جەنەڕاڵ فەزوڵوڵا زاهیی بۆ لای خۆی کێش بکات ئەوەی کە لە دواتردا ڕۆڵێکی گەورەی دژی دکتۆر موسەدەق گێڕا بە هاوکاریکردنی لەگەڵ ئەمەریکییەکاندا. بەڵام ئارەزووی ئەڵمانیا لە داگیرکرنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نەهاتەدی لەبەرئەوەی هاوپەیمانەکان توانیان چالاکی بەکرێگیراوانی نازی لە ئێران بە بەستەلەك بگەیەنن، سوپایەکانیان لە سوریا و میسر و لیبیا و تونس لە سەرکەوتنێکەوە بۆ سەرکەوتنێکی تر دەڕۆیشتن، ئەو کارەی کە پاڵی بە ئێرانییەکانی بانگەشەکەری میحوەری کرد کە بە قوڵی بیر لە خۆیان بکەنەوە"، ئەم کارەش لە کۆتاییدا بەوە تەواو بوو کە لە ئەیلولی ١٩٤٣ ئێران بەشێوەیەکی فەرمی شەڕێ دژی ئەڵمانیا ڕاگەیاند"[١٣١].

لە هەمان ئەو کاتەی کە ململانێ لەنێوان بریتانیا و وڵات یەکگرتووەکان بۆ دەست گرتن بەسەر ئێران و بازاڕەکانی لەوپەڕیدا بوو، لەسەر دژایەتیکردن و لەناوبردنی هێزە نیشتمانییەکان پێکهاتن ئەمەش بە پاساوی هاتنە ناوەوەی شیوعی، بەم شێوەیەش وڵاتە یەکگرتووەکان بوونی سەربازی خۆی پشت ئەستوورتر کرد. "لەساڵی ١٩٤٢ هێزەکانی ئەمەریکی بۆ یارمەتیدانی گواستنەوەی تەقەمەنی جەنگی ئەمریکی لە ڕێگای ئێرانەوە بۆ ڕوسیا هاتنە ئێران و لە ساڵی ١٩٤٤ .. ژمارەیەك ڕاوێژکاری ئەمریکی لەکاتی داگیرکردن هاتنە ئێران بۆ یارمەتیدان لە دووبرە ڕێکخستنەوەی کاروباری دارایی ئێرانی و هێزەکانی ئاسایش .. هتد. گرنگترین ئەو ڕاوێژکارانەش ئای. سی. ملزیف بوو ئەوەی کە پێش ئەوە بە بیست ساڵ ڕاوێژکاری دارایی بوو لە ئێران، و ئەوەی لە ساڵی ١٩٤٢ بەهەمان شایستەییەوە گەڕایەوە ئێران، و کە لەگەڵ نێردراوەکەی دەسەڵاتێکی

جێبەجێکردنی گەورەی بەسەر کاروباری دارایی ئێران پێدرا تاوەکو ساڵی ١٩٤٤یش کاتێک کە بەهۆی کێشەیەک لەگەڵ حکومەتی ئێرانی لەگەڵ نێردەکەی وڵاتی جێهێشت"[١٤١].

هۆشیاری جەماوەری پەرەیسەند و بزوتنەوەی نیشتمانی فراوانتر و گشتگیرتر بوو و چەند رەهەندێکی نوێی بەخۆوە گرت کە خۆی لە لێدانی هەموو شێوەکانی خۆ سەپاندنی مۆنۆپۆلییانەی ئیستیعماری بینیووە. لەپێشتردا وتمان کە هاتنە ناوەوەی هێزەکانی ئەنگلۆ- سۆڤییەت لە ئابی ١٩٤١ بۆ ئێران و وازهێنانی رەزا پەهلەوی لە تەخت بۆ کورەکەی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر گەشەکردنی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە وڵاتدا هەبوو، و ساڵەکانی شەڕ و دوای شەڕ سەرەتای پێکهێنانی پارتە نوێیەکان بوو وەکو پارتی (تودە) و پارتی ئێران. لەگەڵ کۆتایی شەڕ و کشانەوەی هاوپەیمانەکان لە ئێران شەپۆلێکی وریابوونەوەی فیکری و هۆشیاری سیاسی وڵاتی گرتەوە، ئێران لە داگیرکردن و سەرپێ شۆڕکردن و هەستکردن بە تاڵییەکانی لەلای ئێرانییەکان دەرچوو بەبێ ئەوەی هیچ بەرهەمێکی سەرکەوتن بەدی بهێنن، هستکردنیان بە رق لێبوونەوە و کینە بەرامبەر بە وڵاتە یەکگرتووەکان و بریتانیا پتر بوو، ئەو دوو دەوڵەتەی قەڵەمرەوی مۆنۆپۆلی خۆیان چەقاند بەتایبەتی بەریتانیا کە پارێزەر و خاوەنی کۆمپانیای پەترۆڵی ئەنگلۆ- ئێرتنی مۆنۆپۆلی بوو. لەدوای شەڕ ئێران ڕووبەڕووی چەندین گێروگرفتی دارایی و سیاسی بووەوە، ئەوەبوو هەڵئاوسانی دارایی هەبوو کە وڵات لەکاتی شەڕدا بەخۆیەوە بینی و کاریگەرییەکانی لە ماوەی دواتردا تا کۆتیی بەردەوام بوو، هەروەها تەرازووی بازرگانی ئێران تووشی شکستێکی دیاربوو و بەشێوەیەکی پلەپلەیی لە پتر بووندا بوو، هیوای جەماوەری ئێرانی بەرەو ئەوە دەچوو کە فەرمانڕەواییەکی دیموکراتی دابمەزرێ کە پەیوەست نەبێ بە ئیستیعمار و کۆمپانیا مۆنۆپۆلییەکانی.

لە سەرەتای ١٩٤٦، و لە دوای ئەوەی كە قەوام ئەلسەڵتەنە بووە سەرۆك وزیرانی ئێرانی، ئەو كەسەی كە بەوە ناسرابوو كە سۆز و مەیلی بۆ ئەمریكییەكان هەبوو، ئەمە پالی بە ئینگلیز نا كە ڕۆڵی سەرەكییان لە ئێراندا دەبینی بچنە پلەی دووەم و ئەمەریكییەكانی لە خۆی نزیك كردەوە. لە كۆتاییەكانی ساڵی ١٩٤٧ قەوام ئەلسەڵتەنە بە سەفیری بەریتانی ڕایگەیاند كە دەبێ جیاوكی كۆمپانیای پەترۆڵی ئەنگلۆ- ئێرانی بگۆڕدرێ، سەفیری ئەمەریكیش لە تاران داوای دووبارە تەماشاكردنەوەی كرد لە جیاوكەكان لەسەر بنەمای پێكهێنانی كۆمپانیایەكی نوێی ئەنگلۆ- ئەمریكی – ئێرانی بۆ بەكارهێنانی پەترۆڵی ئێرانی[١٥]. لە ڕۆژەكانی یەكەمی شەڕێ یەكەمی جیهانییەوە ولاتە یەككگرتووەكانی ئەمەریكا كۆششی دەكرد بۆ دەست بەسەرداگرتنی ناوچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئیستیغلالكردنی سامانە پترۆلییەكانی ئەوە و لیژنەیەكی تایبەتی لە كۆنگریسی بەسەرۆكایەتی هاری ترومان ئەم پێشنیارانەی خوارەوەی چەسپاند:

- ڕێگا بە كۆمپانیا تایبەتییەكانی پترۆڵ بدرێ كە چالاكییەكانی خۆی لە دەرەوەی ولاتە یەككگرتووەكانی ئەمەریكا فراوان بكات.
- ولاتە یەككگرتووەكانی ئەمەریكا پشتگیرییەكی دیبلۆماسی تەواوی پێشكەش بكات، وەكو ئەو پشتگیرییەی كە حكومەتی ئینگلیزی پێشكەش بە كۆمپانیاكانی دەكات.
- حكومەتی ولاتە یەككگرتووەكانی ئەمریكا داهات پەترۆلی بەدەست بهێنێت بەوەی كە داوا لە هاوپەیمانەكانی بكات كە واز لە هەندێ داهاتی پەترۆلی بەنرخ بهێنن بۆ ولاتە یەككگرتووەكان لە ڕۆژانی شەڕی دووەمی جیهانی بەم هاوپەیمانانەی بەخشی.
- فراوانبوون لە بەشداریكردن لە كردەوەكان و بەڕێوەبردنی سەرچاو پترۆلییە بەكارهاتووەكان لەلایەن كۆمپانیا تایبەتە ئەمریكییەكان.

سەرۆكی ئەمریكیش لە نیسانی ساڵی ١٩٤٧ ئەوەی ڕاگەیاندبوو كە سیاسەتی ئەمریكا بۆ جلەوكردنی شیوعییەت، بەرگریكردن لە نەتەوە بچووكەكان دژی دوژمنكاری

و هاتنە ناوەوەی شیوعی بەخۆوە دەگرێت. پەیمانیشی بە یۆنان و تورکیادا کە یارمەتی ئابووری و سەربازییان پێبدا بۆ یارمەتیدانیان لە دژایەتیکردنی فشاری شیوعی ئەوەش روون بوو، کە ولاتە یەکگرتووەکان ئەوەی لە ئێران دەویست کە دژی ئەم فشارە بوەستێت، ئەمەش بەرامبەر بە پێشکەشکردنی یارمەتییەکی هاوشێوە[16].

بەم شێوەیەش لە شوباتی ساڵی ١٩٤٨ ڕێکەوتننامەیەك لەنێوان ئێران و ولایەتە یەکگرتووەکان مۆرکرا ئەوەی بەخۆوە گرت کە ئێران هەڵبستێ بە کڕینی چەك و تەقەمەنی سەربازی بەبەهای دە ملیۆن دۆلار لە ولایەتە یەکگرتووەکان، و ماوەی خزمەتکردنی نێردە سەربازی و پۆلیسییەکانی ئەمریکی لە ئێران تاکو ساڵی ١٩٤٩ درێژکردەوە، لە ئایاری ساڵی ١٩٤٨ وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکی پێشنیارێکی خستە بەردەم کۆنگرێس کە بڕی (٦٠) ملیۆن دۆلار بۆ کڕینی چەك و پێشکەشکردنی بە ئێران تەرخان بکات..!! بەرامبەر بەو هێرشە ئیستیعمارییە توندەش گەلی ئێرانی ڕاپەڕی لە پێناو لەناوبردنی دەسەلاتی بێگانە بە هەموو شێوەکانیەوە، بزوتنەوەی دژایەتیکدنی ئیستیعماری ئەمریکیش گوڕوتینێکی جەماوەری فراوانی بەخۆوە گرت، وای لێهات کە خەباتکردن لەپێناو لەناوبردنی کۆمپانیای پترۆڵی ئەنگلۆ- ئێرانی لە ئەرکە بەپەلەکان بوو لەبەردەم گەلی ئێراندا. ئەم ماوەیە لەکاتی شەڕی دووەمی جیهانی و دواتریش سیمای پێگەیشتنێکی خێرای سیاسی و خۆپیشاندانی دژ بە ئیستیعمار و کۆمپانیای ئەنگلۆ- ئێرانی، و مانگرتنی کرێکاران کە لە عبادان و ئاغاجاری و کرمانشاه بڵاوبووەوەی هەبوو.

لە نیسانی ١٩٤٦ حکومەتی ئێرانی نێردەیەکی ناردە عەرەبستان بۆ وردبوونەوە لە چالاکی کۆمپانیای ئەنگلۆ- ئێرانی، لەدوای تەواوبوونی وردبوونەوەش حکومەت داوای لە کۆمپانیاکە کرد دووبارە سەیری حساباتی دارایی ئاڵوگۆڕکراو بکات، ئەو گفتوگۆیانەش دەستیان پێکرد کە بە هیچ ئەنجامێك نەگەیشت، لە تەموزی ساڵی ١٩٤٧

گفتوگۆیەکان نوێ بوونەوە ئەمەش کاتێک بوو کە حکومەتی ئێرانی ژمارەی بەکارهێنراوەکانی بێگانەی لە کۆمپانیاکە ووروژاند. لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٤٨ ئەو حکومەتە ئێرانییەی کە عەبدولحوسەین هاجەر سەرکردایەتی دەکرد بیرخەرەوەیەکی پێشکەش بە کۆمپانیاکە کرد، ئەو بیرخەرەوەیە لەدواییدا بە "لائحەی تاوانباران" ناونرا.

لە ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٧ پەرلەمانی ئێرانی (ئەنجومەن) یاسایەکی پترۆڵی چەسپاند کە پەرەگرافی (د)ی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دژی بەرژەوەندییەکانی کۆمپانیاکە ئاراستە کرابوو، ئەوەبوو تیایدا هاتبوو: "حکومەت لە هەموو ئەو بارودۆخانەدا کە مافەکانی گەلی ئێرانی لە سامانی وڵاتەکەی زیانمەند دەبێ (لە ژێر زەوی و لەسەرەوەی) بەتایبەتی مافەکانی لە ناوچەکانی باشووردا، ئەوە حکومەت لەسەریەتی کە بچێتە گفتوگۆکردن و ئەو ڕێوشوێنانەی گرتەبەر کە بۆ گەڕاندنەوەی مافە نیشتمانییەکان پێویستن، و ئەنجومەنیش بە کارەکانی ئاگادار بکات. وەزیری داراییش هاجەر کە بە پەیوەندییەکانی بە ئەمریکییەکان ناسراو بوو لە بیرخەرەوەکانی بۆ حکومەت ئاماژەی کرد بە دوو ڕێگا بۆ هەموارکردنی جیاوکەکە کە بریتی بوون لە: یاخود ڕێکەوتن لەگەڵ کۆمپانیایاکە بۆ پترکردنی ئەو داتهاتانەی دەیدات بە ئێران (وەکو ئەوەی کە لە فەنزوێلا ڕوویدا) یاخود خۆماڵیکردنی پیشەسازی پەترۆڵ (وەکو ئەوەی لە مەکسیك ڕوویدا).

لە ماوەی ساڵی ١٩٤٨ ڕێکخراوە سیاسیەکان و کەسایەتییە نیشتمانییەکان سەندیکا یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی تر خەباتێکی فراوانیان دژی کۆمپانیای ئەنگلۆ- ئێرانی بەرپا کرد، ئەوە و بزوتنەوەی نیشتمانی خەباتە خۆگرییەکەی سەروتر کردبوو لەو کاتەو کە لەساڵی ١٩٤١ ڕەزا شا دەستی لە تەخت هەڵگرتبوو، لەبەشی دووەم خۆمان لەو بابەتە دەدەین، بۆیەش و بەمەبەستی خنکاندنی

بزوتنـەوەی نیـشتمانی لـە ٤ی شـوباتی ١٩٤٩ هـەوڵێکی تورەکەرانـە بـۆ کوشـتنی شـا ڕێکخرا، ئەمەش لەلایەن حکومەتەوە ئیستیغلال کرا. ئەوەبوو بارودۆخی نـا ئاسـایی لـە تاران و شـارەکانی تـر ڕاگەیانـدرا، لەگـەڵ ڕێگـەگرتن لـە پـارتی تـودە، و ڕێگـەگرتن لـە دەرچوونی هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارە دیموکراتییەکان[١٧].

بەم شێوەیەش بارودۆخەکە لوا بۆ حکومەتی ئێرانی و لـە حەڤـدەی تـەموزی سـاڵی ١٩٤٩ ئەو شتەی واژۆکرد کە بە (ڕێکەتننامەی تەواوکەری) ناونرا، لـە کۆتاییـەکانی ئـەو ساڵەشدا ڕای گشتی لە ئێران جێگیربووبوو کە ڕێککەوتننامـەی بـە پاشـکۆ کـراو بـەهیچ شێوەیەك بەس نیە بۆ ڕایزکردنی داواکارییە ئێرانییەکان، و دکتۆر عـاتف سلێمان دەڵـێ "لەکاتی هەڵبژاردنەکانی ١٩٤٩ پارتی دکتۆر موسەدەق (ئەو پارتە بە بەرەی نیـشتمانی ناونرا) هەشت کورسی لـە کۆی ١٩٣٦ کورسـی ئەنجومـەنی نوێنـەرانی ئێـران بەدەسـت هێنا. کەچی ڕێکخستنی ئەو پارتە و هەڵوێستی وەکو پارتێکی دژی دەسەڵاتی بێگانە چ دەسەڵاتی سیاسی یان ئـابووری وای لێکـرد کـە بـەرەوڕووی بەپیلـەوە هـاتنێکی میللـی گەورە ببێتەوە، کە وایلێکرد سیاسەتی پترۆڵـی وڵات ئاراستە بکـات، و ڕێگـا بگرێـت لـە هەر هەولێك بۆ واژۆکردنی ڕێکەوتننامە بە پاشکۆکراوەکە لە ماوەی هەردوو ساڵی ١٩٤٩ و ١٩٥٠"[١٨]، لەکاتێکـدا -لـە ڕاسـتی دا- هەڵبژاردنـەکان لـە سـاڵی ١٩٥٠ نـەك ١٩٤٩ ئەنجامـدرابوو، هـەروەها دکتـۆر عـاتف سـلێمان ووتـی "دانیـشتوانی تـاران لـە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٥٠ دەنگییـان بـۆ ئەنجومـەنی شـازادە دا ئەمـە سـەرەڕای ئـەو تۆقاندنە پۆلیسییە ناشیرینەی لە وڵاتدا باوبوو، بەشێوەیەکی جـەماوەری دەنگییـان بـۆ پـاڵێوراوانی (بـەرەی نیـشتمانی) دا ئـەوەی کـە لـە هەڵبژاردنـەکانی سـاڵی (١٩٤٢)ەوە بەسەرۆکایەتی دکتـۆر موسـەدەق و لەکەسـایەتی نیـشتمانی بـۆرژوازی دژی کۆمپانیـای پترۆڵـی ئـەنگلۆ- ئێرانـی، پێکهـاتبوو، و ئـەم هەڵوێـستەی (بـەرەی نیـشتمانی) پشتگیریکردنی گەلی مـسۆگەر کردبـوو"[١٩]، وەکـو ئـەوەی دامەزرانـدنی پـارتی تـودە لـە

ساڵی ١٩٤١ کە تاکە پارت بوو فراوانترین کەرتە جەماوەرییەکانی لە کرێکاران و جوتیاران و قوتابیان و ڕۆشنبیران بۆ خۆی ڕاکێشا. ئەمەش وایکرد کە هۆشیارییەکی سیاسی دژی بەرژەوەندییە بێگانەکان بەگشتی و دژی کۆمپانیای ئەنگلۆ- ئێرانی بەشێوەیەکی تایبەتی پەرەپێبدا. لەبەشێکی تایبەتی باس لە خەتی پارتی تودە پارتە سیاسیەکانی تر دەکەین. گەلانی ئێران بەسەرکردایەتی پارتی تودە و بەرەی نیشتمانی کە موەدەق سەرکردایەتی دەکات خەباتیان کرد دژی (ڕێککەتننامەی تەواوکەری) ئەوە و لە هەردوو ساڵی ١٩٥٠ و ١٩٥١ خەباتی جەماوەری گەلاڵە بوو نەك هەر تەنها دژی (ڕێکەوتننامەی تەواوکەری) بەڵکو لەپێناو خۆماڵیکردنی پیشەسازی پترۆڵ و ڕزگارکردنی وڵات لە کۆنترۆڵکردنی ناشیرینی بێگانە. لە ئەنجامی فشاری میللیش عەلی مەنسوری سەرۆك وەزیران لەوە سەرکەوتوو نەبوو کە ڕەزامەندی ئەنجومەن بەدەست بهێنێت بۆ وازۆکرن لەسەر ڕێکەوتننامە پاشکۆکراوەکە یان ناچارکردنی کۆمپانیاکە لەسەر گفتوگۆکردن لەسەر بنەمای نیوەکردنی قازانجەکان. جەنەڕاڵ عەلی ڕازماران لەدوای ئەوە بوو سەرۆکی حکومەت ئەوەی کە زانی ناتوانێ ئەنجومەنەکە والێبکات کە ڕێکەوتننامەکە واژۆ بکات ئەگەر کۆمپانیاکە بەکردنەوەی دەرگای گفتوگۆکردن ڕازینەکات، کەچی ڕەتکردنەوەی ئەم داوایە لەلایەن کۆمپانیاکە پاڵی بە جەنەڕاڵ ڕازمارا نا کە ڕێکەوتننامەکە پێشکەش بە ئەنجومەن بکات بۆ واژۆکردنی، و خرایە بەردەم لیژنەی کاروباری پترۆڵ لە ئەنجومەن بۆ لێکۆڵینەوەی، ئەوە و محەمەد موسەدەق سەرۆکی ئەم لیژنەیە بوو. لەکانونی ١٩٥٠ لیژنەکە ڕاپۆرتی خۆی دەرکرد تیایدا وەسیەتی کردبوو کە ڕێکەوتننامە پاشکۆکراوەکە ڕەت بکرێتەوە لەبەرئەوەی ماف و بەرژەوەندییە مەشروعەکانی گەلی ئێرانی بەدی ناهێنێت. لەژێر فشاری بزوتنەوە فراوانەکەی دژ بە ئیستیعمار، کە سەرجەم وڵاتی گرتەوە، لە یازدەی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٥١ ئەنجومەنەکە فەرمانێکی یاسایی پەسەند کرد کە تیایدا هاتبوو "ئەنجومەن

جەخت دەکاتەوە لەسەر راپۆرتی لیژنەکە کە ئاماژەی بەوە کردبوو کە رێکەوتننامەی تەواوکەری مافەکانی ئێران بە گوێرەی پێویست و وەکو ئەوەی لە یاسای تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧ چەسپا، بەخۆوە ناگرێت. و ئەنجومەنەکە ئەوەی بە لیژنەکە سپاردبوو کە لەماوەی دوومانگدا راپۆرتێك ئامادە بکات و پێشنیارەکانی تیایدا بخاتە روو سەبارەت بە رێوشوێن، و کارە پێویستەکان، بۆ چەسپاندنیشی بیخاتە بەردەم ئەنجومەن".

لەو کاتەشدا کۆمپانیای ئەنگلۆ- ئێرانی دژە هێرشێکی دارایی کرد و تەشقەرە پێکردنی سەربازی ئەنجامدا بە ناردنی کەشتی جەنگی بەریتانی بۆ کەنداوی عەرەبی، حکومەتی بەریتانیش لەلایەن خۆیەوە رایگەیاند کە ناتوانێ هەڵوێستێکی بێ خەمانە بەرامبەر بە بەرژەوەندییەکانی لە ئێران بنوێنێت و ئەوەی دواییان مافی نیە کە جیاووکی ساڵی ١٩٣٣ هەڵبوەشێنێتەوە، هەواڵ گەیشتە تاران سەبارەت بە واژۆکردنی رێکەوتننامەکە لەنێوان مەملەکەتی عەرەبی سعودی و کۆمپانیای ئارامکۆی ئەمریکی لە سی کانونی یەکەمی ١٩٥٠ کە تیایدا بنەمای نیوەکردنی قازانجەکان لەنێوان حکومەت و کۆمپانیاکە هاتبوو.

بەرامبەر بەو دەستدرێژییە ئیستیعمارییانەی دژی گەلانی ئێران و مافە شەرعییەکانی، تورەیی و بێزاری خەڵك پتر بوو کاتێك کە کۆمپانیاکەش زانی کە ئەنجومەنەکە بڕیارێك وەردەگرێ کە لە بەرژەوەندیدا نەبێ لە دەی شوباتی ساڵی ١٩٥١ شتێکی خستە بەردەم حکومەت بە کردنەوەی دەرگای گفتوگۆکردن لەسەر بنەمای نیوەکردنی قازانجەکان، بەڵام کاتەکە درەنگ بوو، لە نۆزدەی هەمان شوباتدا، موسەدەق پرۆژەی بڕیارێکی خۆماڵیکردنی پیشەسازی پترۆڵی ئێرانی پێشکەش بە لیژنەی پترۆڵ لە ئەنجومەن کرد، لە هەمان کاتیشدا پارتی بەرەی نیشتمانی کە موسەدەق و پارتی تودە و کەسایەتییە نیشتمانییەکان و تەنانەت ئاینییەکانیش

سەرکردیەتییان دەکرد بەکارێکی فراوان هەڵستان بۆ ڕوونکردنەوەی کردەوەی خۆماڵیکردن و کاریگەرییە باشەکانی "لەم ماوەیەدا بەدیارکەوت کە سەرکردە ئاینییەکان لە ئێران بەوپەڕی گەرمییەوە پشتگیری لە بیرۆکەی خۆماڵیکردن دەکەن.لە بیست و هەشتی کانونی دووەمی (١٩٥١)ەوە بەدیارکەوت کە حەوت لە گەورە سەرکردە ئاینییەکان پشتگیرییان لە ئایەتوڵلا کاشانیان کردبوو لە ڕاگەیاندنەکەی: "کە ئەرکی ئاینی هەموو موسوڵمانێکی ئێرانی لە پاڵپشت کردنی بزوتنەوەی خۆماڵیکردن و یارمەتیدانی بەدیهێنانی خەونی گەلە"[٢٠]. ئەوە و ئەم ڕاگەیاندنە بەشێوەیەکی تایبەتی کاریگەری بەسەر جەماوەری جوتیاران هەبوو، ئەمەش بە لەبەرچاوگرتنی ئەو دواکەوتوویە ڕۆشنبیرییەی لەناویاندا باوبوو.

لە پازدەی ئازاری ١٩٥١ ئەنجومەنەکە بڕیاری خۆماڵیکردنی پیشەسازی پەترۆڵیدا. ئەوە و جەنەراڵ ڕأزمارا لەبەر هەڵوێستی دوژمنکارانەی لە خۆماڵیکردن لەسەر دەستی یەکێك لە کۆمەڵەی برایان کوژرا، حوسەین عەللا لەجێگای ئەو بوو بە سەرۆك وەزیران، بەڵام نەیتوانی هاوکاریکردنی ئەنجومەنەکە بەدەست بهێنێت، و لە بیست و حەوتی نیسانی ساڵیّ ١٩٥١ دەست لەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش کرد، لە ٢٩ی هەمان مانگ و ساڵیش دکتۆر موسەدەق سەرکردەی (بەرەی نیشتمانی) بە سەرۆکی وەزیران دانرا.

خۆماڵیکردنی پیشەسازی پترۆڵی ئێرانی لەماوەی ١٥ی ئاداری ١٩٥١ تاکو نۆزدەی ئابی ساڵی ١٩٥٣ بەچەندین قۆناغ تێپەڕی:

یەکەم: لە بیست و هەشتی ئایاری ساڵی ١٩٥١ دکتۆر موسەدەق لە لێدوانێکی ڕۆژنامەنووسی بۆچوونی حکومەتی شرۆڤە کرد بە ڕەتکردنەوەی ئەوەی کە بابەتەکە بخرێتە بەردەم دادگاییکردن —بەپێی داواکردنی کۆمپانیاکە— و باسی ئەوەی کرد کە ئێران بەگوێرەی مافەکانی سەروەری میللەتی ئێرانی پیشەسازییە پترۆڵییەکانی خۆی خۆماڵیکرد، و هیچ ڕێکەوتننامەیەکیش ناتوانیّ ئەم مافانە لەگەل بسەنێتەوە؛

لێدوانەکەشی بەوە کۆتایی پێهێنا کە "بەکورتی ئەو حکومەت کاتێک بەگوێرەی مافەکانی لە سەروەری بەکارێك هەڵدەستێت و دەبێتە هۆی زیان بۆ کۆمپانیایەکی تایبەتی، ئەوا تاکە چارەسەر کە دەکرێت کۆمپانیاکە داوای بکات بریتی یە لە داواکردنی قەرەبووکردنەوە لە حکومەت. ئەم قەرەبوو کردنەوەیەش لە یاسای خۆماڵیکردندا هاتووە. هەرچی ڕێکەوتننامەی ١٩٣٣ ئەوا جێگای مشتومڕکردن نیە لەسەری و جێگای ئەوە نیە کە بە هیچ شێوەیەك ناوی بهێنرێت"[٢١]. لە بیست و شەشی ئایار حکومەتی بریتانی دۆزەکەی بردە بەردەم دادگای نێو دەوڵەتی لە لاهای، حکومەتی ئێرانیش بە دادگای نێو دەوڵەتی ڕاگەیاند کە داننانێت بە پسپۆرییەتی لە ڕوانینە کێشەیەك لەنێوان ئەو حکومەتە و کۆمپانیای ئەنگلۆ-ئێرانی، لەبەرئەوەی کاتێك کە دەوڵەت سەروەری خۆی پیادە دەکات ئەوە نابێتە سەرچاوەیەك بۆ شکاتکردن، و لەبەرئەوە گرفتەکەش لەنێوان دوو دەوڵەتدا نیە، بەڵکو گرفتێکی خۆجێیەتییە لەنێوان دەسەلاتێکی خاوەن سەروەری و کۆمپانیایەکی تایبەت کە دەکەوێتە ژێر باری دادگای خۆجێیەتی ئێرانی و دادگای نێو دەوڵەتی مافی سەیرکردنی نیە. بەم شێوەیەش هەوڵەکە سەرنەکەوت.

دووەم : دوای دەستهەڵگرتنی حکومەت بەریتانیا و بابەتی گفتوگۆکردنی خستە ڕوو، حکومەتی ئێرانی ئامادەیی خۆی بۆ ئەمە دەبڕی، و لە چواردەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥١ گفتوگۆکردنەکان دەستیان پێکرد، بە لەبەرچاوگرتنی هەوڵەکانی شاندی بریتانی کە هەوڵیدا دۆزی خۆماڵیکردنی نەوتی ئێرانی لەناو ببات، ئەوە دوای نیو کاتژمێر لەسەر ڕاگۆڕینەوە شاندی ئێرانی پێشنیارەکان بریتانی ڕەت کردەوە، دوای ئەوەش دکتۆر موسەدەق ئەم لێدوانەی بۆ ئەنجومەنی نوێنەراندا: "ئەو پێشنیارانەمان ڕەتکردەوە لەبەرئەوەی لەگەڵ یاساکانی خۆماڵیکردنی پترۆڵ دژ بەیەك بوون". لەبەر سووربوونی حکومەتی ئێرانیش لەسەر هەڵوێستی خۆی بارهەڵگرەکان لەوە وەستان کە لە عەبادانەوە پترۆڵ باربکەن.

سـێیەم: ڕاوەسـتانی بـارکردنی پترۆڵـی ئێرانـی فەرمانبـەرە بریتانییـەکان کـە لەکۆمپانیا کاریان دەکرد خوڕەم شەهریان جێهێشت. سەرۆکی ئەمریکی مسـتەر ترومـان هاتە ناو مەسـەلەکە و نێـردراوی خـۆی ئـەفریل هارمـانی نـاردە تـاران بـۆ گفتوگۆکردن لەسەر ئەو ئەو گێروگرفتە، ئـەوە ودکتـۆر موسـەدەق لەسـەر پێـشنیازکردنی ڕازی بـوو، کەچی جاماوەری ئێرانـی خۆپیـشاندانی بـە هـات و هـاواری نـاڕازیبوونی بەسـەرۆکایەتی پـارتی تـودەی دژ بـە ئیـستیعمارییەکانی ئـەنگلۆ- ئـەمریکی، ڕێکخـست. ئـەم خۆپیشاندانەش بووە مایەی پێکدادانی خوێناوی ئەویش مایەی کوشـتن و برینـدارکردنی هەندێك لەوان، هەر لەو کاتەدا حکومەتی ئێرانی فەرمانی دەرکرد بە گرتنی شیوعییەکان و ئەو ڕۆژنامانەی دەست بەسەردا گرت کە بە زمانی ئەوان دەردەچوون. ئەم هەنگاوەش ڕێگـای خۆشـکردبوو بـۆ هێـزە کۆنـە پارێزەکـان بۆئـەوەی هێـزە نیـشتمانی و پێشکەوتنخوازەکان پەرت و بلاو بکەنەوە. وتوێژ لـەنێوان هاریمـان و حکومـەتی ئێرانـی دەستی پێکرد. حکومەتی ئێرانی پێشنیارێکی بۆ گفتوگۆ لەسەر کردن پێشکەش کـرد و ئـەو بنەمایانەشـی دانـا، کـە حکومـەتی بریتـانی لەسـەری ڕازیبـوو، شـاندی بریتـانیش پێـشنیارە ئێرانییـەکانی ڕەت کـردەوە کـە تـەنها دووبارەکردنـەوەی پێـشنیارەکانی پێشووتر بوو. گفتوگۆکردنەکەش بە گەڕاندنەوەی شاندی بریتانی بـۆ وڵاتەکـەی کۆتـایی هات، و بریتانیاش دەستی کـرد بـە تەشـقەلە پێکردنـە سـەربازییەکانی، ئـەوەبوو چـەند یەکەیەکی لە سوپا و دەریاوانی و هێزی ئاسمانی بریتـانی لـە ڕۆژهـەڵاتی دەریـای سـپی ناوەڕاست و کەنداوی عەرەبی جوڵاندەوە بۆئەوەی ئەگەر فەرمانی بۆ دەرچوو ئامادەبێـ بۆ دەست تێوەردانی کاروباری ئێران. لەکاتی گوێبیستبوونی ئەم هەواڵانەش حکومـەتی ئێرانی فەرمانەکانیخۆی دەرکرد بە وێرانکردنی دام و دەزگا پترۆڵییەکانی لەکاتێکدا کـە هەر هێزێکی بێگانە هەوڵبدات لە خاکی نیشتمان دابەزێ.

چوارەم: لە بیست و هەشتی ئەیلولی ساڵی ١٩٥١ حکومەتی بریتانی داوای بەستنی ئەنجومەنی ئاسایشی کرد بۆ سەیرکردنە کێشەکەی لەگەڵ ئێران بە هەنجەتی ئەوەی کە ئەو کێشەیە ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی ئیستیعماری تووشی مەترسی دەکات، لەم ڕووەشەوە دەچێتە پسپۆڕییەتی ئەنجومەنەوە. لە یەکی تشرینی یەکەم تاوتوێکردنەکان لەبەردەم ئەنجومەنی ئاسایش دەستی پێکرد و دەرکەوت کە ناکۆکییەکی گەورە لەنێوان ئەندامەکان هەیە سەبارەت بەوەی کە ئایا ئەو کێشەیە لە بنەڕەتەوە لە چوارچێوەی پسپۆڕییەتی خۆجێیەتی ئێراندایە، و سەبارەت بەوەی کە ئەگەر ئەو کێشەیە بە هەڕەشەیەك دادەنرێ بۆ ئاشتی جیهانی. لەدواییشدا ئەنجومەن بە زۆرینەی دەنگەکان، بڕیاری دواخستنی ڕوانینی کێشەکەیدا تاکو دادگای دادی نێودەوڵەتی باس لە بابەتەکە دەکات.

پێنجەم: لە بیست و دووی تەموزی ساڵی ١٩٥٢ دادگای دادی نێو دەوڵەتی بڕیاری خۆی دەرکرد تیایدا داواکاری بریتانی ڕەت کردەوە و پشتگیری گازاندەکردنی ئێرانی کرد لەسەر ئەو بنەمایەی کە کێشەکە کێشەیەکی نێو دەوڵەتی نییە لەوەی کە بچێتە دادگای نێودەوڵەتی بەڵکو لە ڕاستیدا کێشەیەکە لە نێوان دەوڵەتێکی خاوەن سەروەری کە (ئێرانە) و کۆمپانیایەکی تایبەت کە (کۆمپانیای ئەنگلۆ- ئێرانییە)، بەمەش کێشەیەکی خۆجێیەتییە دەچێتە پسپۆڕییەتی خۆجێیەتی دەوڵەتی ئێرانی. ئەم بڕیارەش شکستێکی گەورەبوو بۆ بریتانیا، و سەرکەوتنێکی یاسایی گەورەش بوو بۆ بۆچوونی ئێرانی کە لە بەرزترین لایەنی قەزایی نێودەوڵەتی دەرچوو بوو. هەروەها لە تێڕوانینی یاسای گشتی نێودەوڵەتی ئەم یاسایە گرنگیەکی گەورەی هەبوو، ئەوەبوو جەختی لەسەر بنەمایەکی گرنگ کردەوە لە بنەماکانی ئەو یاسایە ئەویش ئەوەیە "کە هەڵسانی دەوڵەتێك بە خۆماڵیکردنی موڵکییەتە بێگانەکان لە دەوڵەتەکەدا مەسەلەیەکی ناوخۆییە، ئەمەش ئەوەی بەدوادا دێت بڕیاری مافی هەموو دەوڵەتێك بدرێ لەوەی کە

موڵکە بێگانەکان خۆماڵی بکات وئەم هەڵوێستەش بە سەرپێچیکردنی یاسای نێو دەوڵەتی داناندرێ".

هۆیەکانی سەرنەکەوتنی خۆماڵیکردنەکە :

سەرنەکەوتنی خۆماڵیکردنی پیشەسازی پترۆڵی ئێرانی بۆ هۆی سیاسی و ئابووری دەگەڕێتەوە، ئەوەبوو ئێران هەوڵیدا دووبارە پیشەسازی پترۆڵ لەسەر بنەمای پیشەسازی نیشتمانی ڕێکبخاتەوە، بەدیارکەوت کە ئەمە کارێکی قورس نیە، ئەوەبوو دەکرا بە هاوکاریکردن لەگەڵ هەندێ لە هونەرییەکانی بێگانە کردەوەکانی بەرهەمهێنان و پاڵاوتن بۆ سەردەمی پێشویان بگەڕێندرێتەوە، بەڵکو هەندێ شارەزای بێگانە وایان دانابوو کە کۆمپانیای پەترۆڵی نیشتمانی ئێرانی دەتونێ بە هاوکاریکردن لەلایەن هونەرییەکانی بێگانەوە، پاڵاوگەی عبادان لە چوارچێوەی شەش یەك بۆ سێ یەکی خۆی کارپێبکات.

دکتۆر موسەدەق سەرکردەی (بەرەی نیشتمانی) بوو کە کەسایەتی بۆرجوزی و نەتەوایەتی و نوێنەری ڕۆشنبیرانی بەخۆوە دەگرت کە وایان دەبینی لەناوبردنی کۆمپانیای پەترۆڵی ئەنگلۆ- ئێرانی ئەو ئامرازەیە کە وادەکات بەسەر ئەو تەنگژە ئابووری و داراییەدا زال ببن کە لە وڵاتدا باوبوو، بەڕووی "مەترسی شیوعی" بوەستنەوە، بۆیە ئامانجی سەرەکی لە بەرنامەی حکومەتی موسەدەق بەدیهێنانی یاسای خۆماڵیکردنی پترۆڵ بوو. هەمووش دەزانن کە لێدانی کۆمپانیا مۆنۆپۆلییەکانی نوێنەری ئیستیعمار دژەهێرشی لەلایەن ئیستیعمارەوە بە هەموو ئەو ئامرازانەی کە دەتوانێ بەکاریبهێنێت، بەدوادا دیت. پێویست بوو کە پارتی تودە و پارتی بەرەی نیشتمانی لەپاڵ یەکتریدا هاوکاری یەك بکەن نەك هەر دژی ئیستیعمار و کۆمپانیاکانی لەو ماوەیەدا، بەڵکو لەپێناو گۆڕینی ژێرخانی ئابووری کۆمەڵگا، و ئەنجامدانی گۆڕینی ئابووری بنەڕەتی.

پارتی تودە پێشنیاری ئەوەی کرد بۆ دکتۆر موسەدەق کە بەکاری هاوبەش هەڵبستن دژی ئیستیعمارییەکان، دکتۆر موسەدەق بەمە رازینەبوو، ئەمەش سروشتی بۆرژوازییەت بوو، کە لە پارتی (بەرەی نیشتمانی)دا خۆی بینییەوە، ئەوەبوو لەلایەك هەوڵی رزگارکردنی ئێرانی لە کۆنترۆلکردنی بێگانە و بەدیهێنانی سەربەخۆیی سیاسی و ئابووری دەدا. و لەلایەکی تریش پارێزگاری کیانی ئابووری بۆرژوازی دەکرد. رووداوەکان جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە کە بۆرژوازییەتی نیشتمانی لە ئێران بە توندی خەباتی کردووە دژی ئیستیعمار و لەو کاتەوەی کە بەرژەوەندییەکانیان رووبەرووی یەکتر بوونەتەوە، بەڵام کاتێك بەرژەوەندییەکانی دژ بە بەرژەوەندییەکانی جەماوەری بێ دژی دەوەستێتەوە. بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی یارمەتی بۆرژوازییەتی نیشتمانیدا لەپێناو بەدیهێنانی سەرکەوتنی مەزن لە خەبات کردن دژی ئینگلیز، بەڵام ئەم بۆرژوازییەتە هەوڵیدەدا پەنا ببانتە بەر ئەمریکییەکان، کاتێك کە چوارچێوەی بزوتنەوەی میللی فراوان بوو، هەر بۆ نموونەش کاتێك هاریمان لە پازدەی تەموزی ۱۹۵۱ گەیشتە تاران رووبەرووی خۆپیشاندانی توندی دژ بە ئیستیعمارییە ئەنگلۆ-ئەمریکییەکان بووەوە، لە ئەنجامی ئەمەش حکومەت هەڵستا بە گرتنی شیوعییەکان و دەست بەسەرداگرتنی رۆژنامەکانیان کاتێك کە دکتۆر موسەدەق بە داوایەکی سەرۆکی ئەمریکی ترۆمان بۆ سەردانیکردنی واشنتۆن رازیبوو، وتوێژی هاوبەشی ئەنجامدا کە سێ هەفتە بەردەوام بوو، موسەدەق داوایەکی پێشکەشکرد بۆ وەرگرتنی قەرزێکی ئەمریکی، و بەرپرسە ئەمریکییەکانیش رایانگەیاند کە بەوپەری گرنگییەوە سەیری داوایەکە دەکەن، چەند هەزار گەنجێك خۆپیشاندانێکیان ئەنجامدا کە پارتی تودە سەرکردایەتی کرد لە شەشی کانونی هەمان ساڵ وەکو ناڕەزایی دەربرینێك بەرامبەر بە نزیکبوونەوە لەگەڵ ئەمریکادا لە شەقامەکنی تاراندا بەڕێوەچوو.

خۆپیشاندەران لەگەڵ پۆلیس و لایەنگرانی موسەدەق و ئەندمانی پارتەکەی (پارتی بەرەی نیشتمانی) بەیەکیاندادا و ئەم پەشێوییە پێنج ڕۆژی خایاند، بووە مایەی کوشتنی پێنج کەس و برینداربوونی زیاتر لە دوو کەس، دەشبوایە کە هێزە نیشتمانی و پێشکەوتنخوازییەکان لەبەرەیەکی فراوان دژی پیلانگێڕانی ئیستیعماری یەك بگرن - سەرەڕای چەندین هەوڵ لەلایەن ڕێکخراوە دیموکراتییەکان بۆ یەکخستنی هێزە پێشکەوتنخوازەکان لە وڵاتدا، ئەوە حکومەتی موسەدەق بە پیلییەوە نەهات لەترسی ئەوەی بە شیوعییەت تۆمەتبار بکرێت. بەم شێوەیەش بۆرژوازییەتی نیشتمانی هەلی ڕەخساند بۆ لەناوبردنی خۆی.

هەرچی هۆیەکانی ئابووری سەرنەکەوتنی خۆماڵیکردنی پترۆڵی ئێرانییە لەمانەدا کورت دەکرێنەوە:

- تاکو کۆتایی ساڵی ١٩٥١ بارودۆخی ئابووری و دارایی وڵات مایەی دڵەڕاوکێ نەبوو، بۆ مسۆگەرکردنی پارەی پێویستیش بۆ کاروبارە گشتییەکان و کردنەوەی بواری کار بۆ بێکاران دکتۆر موسەدەق ڕووی کردە گەل و داوای لێکرد کە بەبەهای دوو بلیۆن لەریالی ئێرانی کۆمپیالەی گشتی پڕبکەنەوە.
- لە بیست و یەکی کانونی دووەمی ساڵی ١٩٥٢ ڕاگەیەندرا کە وڵاتە یەکگرتووەکان ڕازیبووە لەسەر ئەوەی کە یارمەتییەك بەبەهای ٢٣,٤ ملیۆن دۆلار بۆ ساڵی ١٩٥٢ بە ئێران بدات. بەدەستهێنانی ئەم یارمەتییەش لەم جۆرە بارودۆخەدا وەکو سەرکەوتنێکی ڕاستەقینە وابوو بۆ موسەدەق، هەروەها بەخشینی ئەم یارمەتییە ئەوەی پیشاندا کە وڵاتە یەکگرتووەکان لەو کاتەدا بەتەواوی ڕێکنەبوو لەگەڵ بریتانیا لە سیاسەتەکەی کە ئامانجی هەبوو هەموو شتێك بکات کە دەتوانی لەپێناو گەیشتن بە ڕوخاندنی حکومەتی موسەدەق.

- بێ لایەنی ئەمریکی هەر زوو گۆڕا بۆ پشتگیری بریتانیا و فشار خستنە سەر حکومەتی ئێرانی لەپێناو چارەسەرکردنی کێشەکە بەچەند مەرجێك کە لەگەڵ کارتلی پترۆڵی جیهانی بگونجێ و ولایەتە یەکگرتووەکان بەشێوەیەکی کارا بەشداریکرد لەو ئابلۆقە ئابوورییەی کە ئیستیعمارییە ئینگلیزەکان سەپاندبوویان بەسەر ئێراندا. سەرەڕای ئەوەی کە (چالاکی خاڵی چوارەمی ترومان) لە ڕۆژانی موسەدەق پتر بوو، بەتایبەتی لەبواری هێزە چەکدارەکاندا –سوپا و پۆلیس– ولایەتە یەکگرتووەکان ڕازینەبوو یارمەتی دارایی پێشکەش بکات لەجیاتی ئەوە یارمەتی تەکنیکی پێشکەش کرد لەگەڵ هەموو ئەوەشدا دکتۆر موسەدەق وایلێهات کە لەلایەن هەموو ئیستیعمارییەکانەوە کەسێکی حەز لێنەکراو بێت.
- هیچ لێکۆڵینەوەیەك ئەنجام نەدرابوو بۆ چۆنیتی جێبەجێکردنی یاسای خۆماڵیکردن و بەتایبەتی کردەوەکانی گواستنەوە وسەرفکردن و دابینکردنی بارهەڵگرەکان کە ئەکەوتنە ژێر دەسەڵاتی مۆنۆپۆلییە پترۆلییەکان و ڕێککەوتنی پێشینە لەگەڵ دەوڵەتە بەکارهێنراوەکان بۆ مسۆگەرکردنی تێپەڕبوونی پترۆڵی ئێرانی.

لەکۆتاییدا دەگەینە ئەوەی کە کۆمەڵە هۆیەکی سیاسی و ئابووری هەبوون بوونە مایەی سەرنەکەوتنی پترۆڵی ئێرانی لەوانەیە لە دیارترینیان پەرتەوازەبوونی بەرەی سیاسی ناوخۆ، و ڕادەدانان بێ بۆ چالاکی بەکرێگیراوە ئینگلیز و ئەمریکییەکان دژی بزوتنەوەی نیشتمانی ئێرانی، بەم شێوەیەش ئەم یاسایە مەزنە بە کودەتایەکی کۆنەپەرستانە لەباربردرا کە جەنەراڵ فەزلوڵا زاهیدی لە نۆزدەی ئابی ١٩٥٣ پێی هەڵسا، بەم شێوەیەش سەردەمێکی نوێ لە کۆنترۆڵکردنی ئیستیعماری دەستی پێکرد، ئەویش بە واژۆکردنی ڕێکەوتننامەی کۆنسرسیومی پترۆڵی دەست پێدەکات.

## پەراوێزەکان :

[١] Nationalism in Iran, by Richard W. Cottam, ١٩٦٤, Pp. ١٠٢&١٠٣.

[٢] Modern Iran, by Peter Avery, London ١٩٦٥, Pp. ٢١٤.

[٣] أذربيجان و الحركة الثورية في ايران، كيف بدأت و كيف انتهت؟ بقلم منا خذل ازربيجاني، جريدة بيروت، نيسان ١٩٧٢.

[٤] Iran, a short political guide, by John Marlowe, London ١٩٦٣, Pp.٤٥.

[٥] Ibid, Pp.٥٠.

٦ عربستان الاقليم العربي، ملحق العمل الشعبي العدد ١٣.

٧جبهة التحرير الأحوازية– الحركة الثورية النامية في الأحواز، مجلة الهدف بتأريخ ١٩٧١/٨/٢١.

[٨] Nationalism in Iran, by Richard W. Cottam, ١٩٦٤, Pp. ١١٤.

[٩] The history of Modern Iran, An Interpretation, by Joseph M. Upton, Pp. ٨٢.

[١٠] Iran, Short Political guide by John Marlowe, London, Pp.٦٩.

[١١] Ibid, Pp.٧١.

[١٢] الخليج العربي، بقلم جان جاك بيربي، ص٧٧ز

[١٣] المصدر السابق.

[١٤] Iran, Short Political guide by John Marlowe, London, Pp.٧٦.

[١٥] النفط يستعبد ايران، حميد صفدي، ص٧٩.

[١٦] Iran, by John Marlowe,Pp. ٨٣.

[١٧] النفط يستعبد ايران، حميد صفدي، ص٩٤ و ٩٥.

[١٨] تأميم البترول الايراني ١٩٥١ كيف ولماذا فشل مصدق؟ مجلة البترول و الغاز العربي، العدد التاسع ايار ١٩٦٦، بقلم الدكتور عاطف سليمان.

[١٩] النفط يستعبد الايران، ص٩٦.

[٢٠] تأميم البترول الايراني بقلم د. عاطف سليمان، مجلة البترول و الغاز العربي.

[٢١] المصدر السابق.

# کورتە مێژووی فەلسەفە لە چاخی ناوەڕاست دا "فەلسەفە لە ئامێزی ئاین دا"

نەبیل عبدالحمید
و. لە عەرەبییەوە: هاوار محەمەد

مەبەست لە (چاخی ناوەڕاست)، ئەو ماوە زەمەنییەیە کە دەکەوێتە نێوان سەدەی یەکەمی دوای زایین و هەرەسهێنانی شاری (قوستەنتینیە) لەژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی عوسمانیەکاندا (ساڵی ١٤٥٣ ز)، و فەلسەفەش بەردەوامبوو، لەمیانەی ئەم ماوەیەدا، لە مومارەسەکردنی کاریگەرییەکەی لەسەر عەقڵی خەڵکی. بەڵام بە لەبەرچاوگرتنی بوونی هەردوو ئاینی (مەسیحی و ئیسلامی)، کە پلەی یەکەم داگیردەکەن لە ئاراستەکردنی خەڵکی و وێناکردنی شێوازی هەڵسوکەوت و ڕەفتاریان، ئەوا (فەلسەفە) هەروەك هەر شتێکی دیکە، ملکەچی (ئاین) بووبوو، و خۆی تەرخان کردبوو بۆ خزمەتکردنی ئامانجەکانی ئاین. ئەم ماوەیە دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی (دوو فەلسەفە)ی بەخۆیەوە بینی- ئەوانیش (بەپێی ڕیزکردنی مێژوویی):

١- فەلسەفەی مەسیحی.

٢- فەلسەفەی ئیسلامی.

دەربارەی هەر یەکێکیان و هەلومەرجی بڵاوبوونەوەیان، و ئەو قۆناغانەی کە پیایدا تێپەڕیوون، و ئەو خەسڵەتانەی کە هەر یەکێکیانی پێ جیادەکرێنەوە، بە کورتی دەدوێین.

أ- فەلسەفەی مەسیحی :

مەسیحیە بەراییەکان -بە دڵنیاییەوە مەبەستم فێرکاران و ڕۆشنبیرەکانیانە- دانویان لەگەڵ کەلەپووری فەلسەفی یۆنانی- ڕۆمانی نەدەکولا، کە لە سەرەتای بڵاوبوونەوەی بانگەوازی مەسیحیەتەوە باو بوو، و ڕەنگە ئەوە بۆ ئەم دوو هۆی خوارەوە بگەڕێتەوە:

یەکەم: باوەڕییان بەوەی کە (ئەو حەقیقەتەی) خەڵکی بە شوێنیدا وێڵن، بە تێڕوانینیان لە سروشتێکی بە دوور لە هەڵەی ڕاگەیەنراو بە گەورەی مەسیح، دەستەبەری دەکات، دواتر ئیدی هیچ پێویست ناکات کە خەڵکی هەوڵبدەن، دوای ئەوە، بەدوای حەقیقەتدا بگەڕێن.

دووەم: هۆی دووەم پەیوەندی بە باوەڕی (ڕزگاری)یەوە هەیە، کە ئاینی مەسیحی لە سەریەوە دامەزراوە، مەسیحییە بەراییەکان وایان دەبینی کە گرنگترین شتێك مرۆڤەکان پێویستیان پێی بێت ، و بەردەوام بە شوێنیدا وێڵبن بریتی یە لە (ڕزگاری). خودا مەسیحی نەناردووە تەنیا بۆ ڕزگارکردنی ئەوانە نەبێت کە باوەڕیان پێیەتی. کاتێك (دانایی) یۆنان گەنارگیر بوو لە بەدەستهێنانی ئەو مەبەستە، کەواتە شوێن بۆ سروشێکی نوێ چۆڵ بوو، سروشی نوێش بەو (موژدە)ی ڕزگارکردنەی کە بۆ مرۆڤەکانی هەڵگرتبوو، (دانایی) یۆنانی لابرد و لە ڕێنماییکردنی مرۆڤەکاندا خۆی جێی گرتەوە.

بەڵام لەگەڵ سەرەتای سەدەی دووەمی زایین، بیرمەندە مەسیحییەکان بایەخدانێکی زیاتریان بە تێرکردنی باوەڕە ئاینییەکانیان بە پێدراوەکانی کەلەپووری فەلسەفی یۆنانی، دەرخست، بە خواستنی بنچینەیەکی عەقلی لە تیۆرەکانیەوە، کە لە سەریەوە ئەو بنەما و ڕێنماییانە بەند بکەن، کە مەسیح موژدەی پێدابوون، تا بۆیان ئاسان ببێت بەرپەرچی ئەو ڕەخنانە کە ڕووبەڕووی باوەڕەکەیان دەکرێتەوە، بدەنەوە. بە بەکارهێنانی هەمان (ئەو چەکەی) کە دوژمنەکانیان لە هێرشبردنە سەریاندا بەکاری

دێنن– واتە (فەلسەفە). ئەوان (واتە بیریارە مەسیحییە بەراییەکان) لەبری ئەوەی پشت بەستن بە دارشتنی فەلسەفەیەکی نوێی تایبەت بە خۆیان، بە یارمەتی ئەوەی لە (ئینجیل)دا هاتووە، بینیان بۆیان ئاسانترە کە لە کەلەپووری فەلسەفی یۆنانییەوە یارمەتی وەرگرن، و ئەو هزر و بۆچوون و تیۆرانە بژاردە بکەن کە لەخۆی دەگرێت، و ئیتر کاریان کرد بۆ (پۆلێنکردنیان)، بە داماڵینی خەسڵەتی بتپەرستی لێیان، لەوەشدا بە رێنمایی وەرگرتن بە پێوەرەکانی باوەڕی مەسیحی.

دەکرێت ئەو رێگایەی کە فەلسەفەی مەسیحی گرتیەبەر، لە سەرهەڵدانی و پەرەسەندنیدا، دابەشبکرێت بۆ دوو قۆناغی لێکجوودا، ئەوانیش:

١– قۆناغی باوکان : ئەم قۆناغە لە ناوەڕاستی سەدەی دووەمی (دوای زایین)ەوە، و بەدیاریکراوی لەسەر دەستی (کلیمانت ئەسکەندەری) –یەکەمی ئەوانەی کە بە زاراوەی (باوکان) ناوبران– دەستی پێکرد. لە واقیعدا، زۆرێك لە (باوکان)ی کەنیسە، بەر لەوەی ببنە پیاوانی ئاین فەیلەسووف و بیرمەند بوون، و ئەم قۆناغە بەکرداری بە باوکە ئۆگەستین (٣٥٤– ٤٣٠ ز) کۆتایی پێهات. بەڵام هەندێك نووسەران و دانەرانی کەنیسەیی –کە ئەوان لە پلەی دووەمدان دوای بەراییەکان– بەسەر ئەم میتۆدەدا باز دەدەن و دەیگەیەننە سەدەی نۆیەم.

٢– قۆناغی فەلسەفەی قوتابخانەیی (ئسکۆلائی) : ئەم قۆناغە لە سەدەی نۆوە بۆ سەدەی پانزە درێژ دەبێتەوە، و لەمیانەیەوە فەلسەفە بە (قوتابخانەیی)– یان (ئسکۆلائی) ناوزەند کراوە یان پەسن کراوە، چونکە فێرکردنی فەلسەفە رەهبانەکان و پیاوانی ئاینی لە قوتابخانە پاشکۆکانی کەنیسەدا، پێی هەڵدەستان. دامەزرێنەری ئەم فەلسەفەیە سکۆتس ئەریجینایە (لەماوەی سەدەی نۆیەمدا ژیاوە). پاشان زۆری نەبرد کە ڕواڵەت و ئاراستەکانی لە میانەی هەوڵەکانی هەر یەك لە سانت ئەنسلیم (١٠٣٣– ١١٠٩ ز) و ئەبیلارد (١٠٧٩– ١١٤٢ ز) و دینس سکۆت (دەورووبەری ١٢٦٥– ١٣٠٨ ز)ەوە، قووڵبوویەوە و ڕەنگ ڕێژبوو. بەڵام دیارترین نوێنەری و زۆر کاریگەرترینیان

تۆمـا ئـەکوینی (١٢٢٤– ١٢٧٤ ز) بـوو، کـە هەوڵـەکانی دەرکـەوتنی ئاراسـتەیەکی فەلسەفی، بە بەرهێنا، لەناو بازنەی قوتابخانەییدا بە (تۆماوی) ناوبرا.

لە ڕاستیدا، ئێمە دەتوانین لەناو فەلسەفەی قوتابخانەییـدا، لـەنێوان دوو ئاراسـتەی سەرەکیدا جیا کاری بکەین، کە هەریەکێکیان مۆرکی تایبـەت بـە خـۆی هەیـە، ئـەوەش ئەوەیـە لـە سـەرەتاوە (واتـە لـە سـەدەی نۆیەمـەوە) هـەتا سـەدەی سـیانزە خـاوەن مۆرکێکی ئەفلاتوونی بوو– واتە کاریگەر بوو بە فەلسەفەی ئەفلاتوون، بەڵام لە سەدەی سیانزەوە هەتا سەدەی پانزە کاریگەر بوو بە فەلسەفەی ئەرستۆ (و لەم ڕەوتەدا "تۆما ئەکوینی" کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە دەرخستنی بایەخی فەلسەفەی ئەرستۆ، و ڕا و بۆچـوونەکانی بـردە نـاو ڕێنماییـەکانی فەلـسەفەی قوتابخانـەیی). بەگـشتی، فەلـسەفەی قوتابخانـەیی بـە هـەردوو ئاراسـتەکەیەوە بـە پێـداگری مایـەوە لەسـەر یەکخستنی نێوان ڕێنماییەکانی مەسیحییەت و عەقڵ.

ب– فەلسەفەی ئیسلامی :

مسوڵمانە بەراییـەکان هـیچ پێویستیەکیان بۆ ئاراسـتە وەرگـرتن بـەرەو فەلـسەفە نـەدەبینی، بـەو شـێوەیەی لەپێـشتر یۆنـان کـردی، چـونکە ئـەوان (واتـە موسـوڵمانە بەراییـەکان) لـە (قورئـان)دا هـەموو ئـەوەی کـە پێویـستیان بـوو دەربـارەی خـودا، و گەردوون، و مرۆڤ– ژیانی و چارەنووسی مرۆڤ بیزانن، بینییەوە. بۆیە دەکرێـت بـووترێ، کە (قورئان) بیروباوەڕێکی تەواوی لـەخۆ گرتـووە، موسـوڵمانەکان ئارەزووقـەی پێویـستی تیۆرییان تێیـدا بینییـەوە، و هەوڵیانـدا لـە پێنـاو زانینـی شـتەکانی تریـشدا، لەبەرئـەوە ڕۆژهەڵاتناسـی فەرەنـسی (کـارا دی فـو) لەسـەر هـەق بـووە کاتێـك لـە دەسـتپێکی کتێبەکەیدا لە بارەی (ئیبن سینا)وەیە، وتوویـەتی: "موحەمـەد ئەگەرچـی بـە واتایـەکی تەواو فەیلەسووف نەبوو، کەچـی ڕووبـەڕووی زۆرێـك لـە پرسـە فەلـسەفییەکان بـووەوە بەجۆرێك کە بیروبـاوەڕی ئیـسلامییان پێکهێنـا. کەواتـە حەقیقـەتی ڕەهـا ئـەو کێـشەیە

نەبووە کە عەرەب هەوڵیانداوە چارەی بکەن، چونکە ئەوان ئەم حەقیقەتەیان لەلایەنە جەوهەرییەکانیەوە، بەهۆی سروشتی خوداییەوە، زانیووە، بەڵکو مەبەستیان تاوتوێکردنی ئەم حەقیقەتە و سەرخستنی بووە".

خەریکە سەرچاوە کۆنەکان هەموویان کۆکبن لەسەر ئەوەی کە موسوڵمانەکان، لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ)، خۆیان نەداوە لە قەرەی پرسەکانی بیروباوەڕ (عەقیدە)، و لە بوار و بابەتە هزرییە جەدەلییەکان، یان فەلسەفیەکاندا لێکۆڵینەوەیان نەکردووە، وەکو بوونی خودا، و بەڵگە لەسەر ئەوە، و سیفاتەکانی خودا، دەکرێت ئەوە بۆ چەند هۆکارێك بگەڕێنرێتەوە کە لەمانەی خوارەوەدا کۆیان دەکەینەوە:

١- خۆ لە قەرەدانی ئەم جۆرە پرسانە نەخوازراو بووە، بەڵکو نەهی لێکراو بووە، قورئان دەڵێت: "ولا تكونوا كالذين تفرقوا و اختلفوا من بعد ما جاءهم البينات و اولئك لهم عذاب عظيم"(آل عمران/ ١٠٥)[1] و هەروەها دەڵێت: "وأطيعوا الله ورسوله ولا تنازعوا فتفشلوا وتذهب ريحكم" (الانفال/ ٤٦)[2]. لێکۆڵینەوە لە پرسە باوەڕییەکان، و مشتومڕ لەو بوار و بابەتانەی کە لە کرۆکی ئاینن، کەواتە، ڕێپێدراو نەبووە تەنیا بۆ پێویستی نەبووبێت و قورئانیش هانی موسوڵمانان نادات بۆ چوونە ناویەوە، بەڵکو لێیان دوور دەخاتەوە لە ووتەکەیدا: "ومن الذين قالوا إنا نصارى اخذنا ميثاقهم فنسوا حظاً مما ذكروا به فأغرينا بينهم العداوة و البغضاء الى يوم القيامة وسوف ينبئهم الله بما كانوا يصنعون" (المائدة/ ١٤)[3].

٢- بوونی پێغەمبەر (د. خ) لە ناویاندا، خۆ ئەگەر ڕووبەڕووی پرسێ ببونایەتەوە کە وا بۆیان دەرکەوتایە تەمومژاوییە، یان تێنەگەیشتراوە، ئەوا ئەڕۆیشتن بۆلای و داوای ڕوونکردنەوە و ڕاڤەیان لێ دەکرد.

٣- ئاستی عەقڵی مسوڵمانەکان، ئەو کاتە، نەگەیشتبووە پلەیەك لە پێگەیشتنی هزری و فەلسەفی بەجۆرێك پاڵیان پێوە بنێت بۆ خستنەڕووی پرسیارە فەلسەفیەکان و

وروژاندنی کێشە هزرییەکان، چونکە (قورئان) و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) فزولییە هزرییەکانیانی دادەپۆشی و تێر دەکرد.

٤- ئەو سروشتە داخراوییەی کۆمەڵگەی ئیسلامی، و سەرەتاکەیدا، لە ئارەزووی تاکەکانی کەم کردەوە لە زانینی ئەوەی چی هەیە لای میللەتانی خاوەن پەیام (ئەهلی کیتاب) و جگە لەوانیش لە کەلەپووری بیروباوەڕی و هزری، بەتایبەتی کە تازەیی ئیسلام و نوێیەتیەکەی وایان لە مسوڵمان کرد لەوە دڵنیابێت کە ئەو حەقیقەتی هەمەکی هەیە و لایە، و شتێکی تر نیە لای شوێنکەوتووانی ئاینەکانی تر تا فێری ببێت.

٥- سەرقاڵی مسوڵمانەکان بە (جیهاد)ەوە لەپێناو بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی، و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی و جێگیرکردنی پایەکانی.

بەڵام دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ)، سەرەڕای ئەوەی کە خەلیفە ڕاشیدەکان توندبوون لە بەرامبەر هەموو ئەوەدا کە بە (بیدعە)ی نوێ ناو دەبرێ کە لەگەڵ ئەوەی لە قورئان و سونەتدا هاتووە، وێکنایەتەوە، بەڵام کۆمەڵێك بەرەنگاربوونەوەی نوێ لە ژیانی مسوڵماناندا دەرکەوت، و بینییان کە بۆ وەڵامدانەوەی و ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو دژیەکبوونانە کە لەسەر ڕووی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەرکەوتن، چار نیە، کە هەر دەبێت لەمیانەی چالاکی هزرییەوە، تێك و پێکیان بدەن یان لایانبدەن، و ڕەنگە گرنگترین ئەو بەرەنگارییانە: کێشە سیاسیەکان، و کوشتنی خەلیفە (عوسمانی کوڕی عەفان)، و پاشان (فیتنەی گەورە) و (شەڕی جەمەل) و (شەڕی سەفەین) و کوژرانی خەلیفە (عەلی کوڕی ئەبی تالب) بن. ئەو کێشانە، ئەگەر چی لەبەر هۆکاری سیاسی ڕوویاندا، بەڵام کاریگەرییەکانیان لەسەر بیروباوەڕەکان ڕەنگیدایەوە، کە دەرچوونی (خەوارجەکان) و دەرکەوتنی (مورجیئە) و (شیعە)ی لێکەوتەوە، ئەوەش بەهۆی جیاوازی بۆچوونەکان و هەڵوێستەکان لە پرسە تازەکانی وەکو: پرسی تاوانکەری گەورە، ئایا ئەو ئیماندارە یان گومڕا؟ و پرسی ئەوەی کێ شیاوە ببێتە جێنشینی موسوڵمانان و ئەو مەرجانە چین کە پێویستە تێیدان هەبن؟ و پرسی قەزا و قەدەر، و

ئایا ئەو (فیتنە)یەی کۆمەڵگەی ئیسلامی بەخۆیەوە بینی بە قەزا و قەدەری خودا بوو؟ و پرسی زەبر (الجبر) و سەرپشکی (الإختیار)، ئایا مرۆڤ ناچارە لە کردارەکانیدا یان سەرپشکە؟ و دەرکەوتنی بیرۆکەی (غەیبەت) و (رەجعەت) کە (عەبدولای کوڕی سەبەء) برەوی پێدا، و پرسی سیفاتەکانی خودا، و جگە لەمانەیش.

بەپێی ئەوە دەکرێت بووترێت، لەگەڵ کۆتاییەکانی سەردەمی ڕاشیدی و سەرەتاکانی سەردەمی ئەمەوی، پرسە سەرەکییەکان کە گفتوگۆی عەقڵی و مشتومڕێ هزری لەنێوان موسوڵمانەکاندا لەسەری دامەزرا، ڕۆشن بوونەوە.

لەم ڕەوتەدا بیرمەندە موسوڵمانە بەراییەکان (وەکو: مەعبەد ئەلجەهەنی، و گەیلان دیمەشقی، و جەعدی کوڕی درهەم، جەهمی کوڕی سەفوان) لەبارەی پرسە بیروباوەڕییەکان و هزرییەکانەوە دەست دەکەن بە وتووێژ، لەپێشیانەوە: سیفاتەکانی خودا، و ئایا (ووتەی خودا- واتە قورئان) کۆنە هێندەی کۆنی خودا یان دروستکراوێکی نوێیە؟ و مشتومڕ دەکەن لەبارەی (قەدەر) و ناچارەکی (جەبر) و سەرپشکی (ئیختیار)یەوە، و لەمیانەی مشتومڕەکانیان و بۆچوونە هەمە جۆرەکانیانەوە، ڕێباز و ئاراستە و تەوژمە هزرییەکان سەریانهەڵدا، کە هەموویان (کەلامناسی)ی ئیسلامییان پێکهێنا.

لەسەردەمی عەباسیدا کۆمەڵگەی ئیسلامی کۆمەڵێك وەرچەرخان و گۆڕانکاری لە لایەنە جیاوازەکانی ژیانی- سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری بەخۆیەوە بینی هەروەك چۆن فراوانبوونی ناوچەی وڵاتی ئیسلام، و هاتنە ناوەوەی نەتەوە و میللەتانی تری وەکو فارس و هیندەکان و ڕۆم بۆ ئیسلام، دەرفەتی ڕەخساند بۆئەوەی عەرەبە مسوڵمانەکان خۆیان بدەن لە قەرەی ئەزموونی ژانی سکپڕبوونی شارستانی، لەمیانەی ئاشنابوونیان بەو ڕواڵەتە مەدەنی و دەستکەوتە شارستانیانەی کە لای ئەو میلەتانەی تر هەبوون، و بەتایبەت- زانستەکان و هونەرەکان و دانایی. سەدەمی دەسەڵاتدارێتی خەلیفە (ئەبو جەعفەری مەنسور) سەرەتای بایەخدانی وەرگێڕانی کتێبە زانستیەکانی لەزمانەکانی ترەوە -فارسی و سریانی و یۆنانی- بۆ زمانی عەرەبی، بەخۆیەوە بینی.

بەڵام لە سەردەمی خەلیفە (عەبدوڵای کوڕی مەئمون)دا بزووتنەوەی وەرگێڕان فراوانبوو و لق و پۆپە جیاوازەکانی زانین و دانایی گرتەوە، بەتایبەت دوای ئەوەی کە ئەم خەلیفەیە (خانەی حیکمەت)ی دامەزراند بەو پێیەی دامەزراوەیەکە ئەرکی کۆکردنەوەی ئەودانراو و پۆلێنکراو و کتێبانەی کە ئەکرێت دەستیان پێی بگات، و وەرگێڕانیان و لەبەرگرتنەوەیان و ئاسانکاری ئاڵوگۆڕ پێکردنی لەنێوان بەتەنگەوەهاتووانی زانست و دانایی، دەگرێتە ئەستۆ. سریانییەکان ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە ڕاپەڕاندنی ئەرکی وەرگێڕاندا، بەحوکمی ئەوەی زمانی یۆنانی و زمانی عەرەبیان دەزانی، بۆیە خۆیان تەرخانکرد بۆ وەرگێڕانی زانستەکانی یۆنان– لە پزیشکی و زمان و ژمێریاری و کیمیا و فەلسەفە –بە لق و پۆپە جیاوازەکانیانەوە، لە سروشتناسی و خوداناسی و لۆژیك و سیاسەت و ئاکار– بۆ زمانی عەرەبی.

لە هەڵمەتێکدا دانراوەکانی ئەفلاتوون ئەرستۆ و ئەفلۆتین وەرگێڕدران. ڕەوشی ژیانی باو ئەو کاتە توانایی بایەخدانی ژمارەیەکی زۆرتری موسوڵمانان بە فەلسەفە، بۆ هاتەپێشەوە، بەشێکی زۆر لە کاتی خۆیان تەرخانکرد بۆ توێژینەوە و تێگەیشتن. و لەپاشان جیهانی ئیسلامی دەرکەوتنی کۆمەڵێك لە موسوڵمانانی سەرقاڵ بە فەلسەفەوەی بەخۆیەوە بینی، ئەوانەی کە بە (فەیلەسووفانی ئیسلام) یان (فەلسەفێنەرانی ئیسلام) ناسران.

سەرەڕای ئەوەی ناکرێت نکوڵی لەو ڕۆڵە بایەخدارە بکرێت کە وەرگێڕەرانی سریان پێی هەستان، لە وەرگێڕانی کەلەپووری فەلسەفی یۆنانی بۆ زمانی عەرەبی، بەڵام، لە هەمان کاتدا، ناکرێت چاو بپۆشرێت لەو ڕۆڵە نەرێنی و هەڵانەی کە تێکەڵ بە هەوڵەکانیان بوون، کە لەدواییدا کاریگەرییەکانی ڕەنگیان دایەوە لەسەر تێگەیشتنی فەیلەسووفە موسوڵمانەکان لە کۆی فەلسەفەکانی ئەفلاتوون و ئەرستۆ و ئەفلۆتین، لەبەرئەوەی ئەم وەرگێڕەرانە دانراوەکانی خودی ئەفلاتوون و ئەرستۆیان وەرنەگێڕا، وەکو ئەوەی خاوەنەکانیان دایان نابوون، بەڵکو دانراوەکانی ئەفلاتوونیان وەرگێڕا،

وەکو ئەوەی لایەنگرانی (ڕێبازی ئەفلاتوونیەتی نوێ)، تاوتوێیان کردبوو، و دانراوەکانی ئەرستۆیان وەرگێڕا، وەکو ئەوەی قوتابیە دواییەنەکانی، کە بە ڕێبازی (ئەفلاتوونیەتی نوێ) کاریگەربوون، تاوتوێیان کردبوو.

بەرەنجامی ئەوە بە بۆچوون و هزرەکانی ئەفلاتوون و ئەرستۆ ئاشنابوون، نەك وەك ئەوەی کە هەیە، بەڵکو وەکو ئەوەی شوێنکەوتووانی (ڕێبازی ئەفلاتوونیەتی نوێ) تێیان گەیشتبوون و تاوتوێیان کردبوون و شیان کردبوونەوە. لە کاتێکدا ئەمانەی دوایی ڕێبازەکەیان لەسەر بنەمای کۆکردنەوە و یەکخستنی یان پێکهێنانی نێوان ئەفلاتوون ئەرستۆ، دامەزراند، ئەوا فەیلەسووفە مسوڵمانەکان –بەبێ مەبەست– لەسەر هەمان میتۆد ڕۆیشتن، بە باوەڕبوون بەوەی کە ئەفلاتوون و ئەرستۆ لە زۆرێك لە بیروبۆچوونە جەوهەریەکانیاندا، بەیەکدەگەن.

بەگوێرەی ئەمە ئەکرێت بووترێت، کە زۆربەی هەرە زۆری فەیلەسووفە مسوڵمانەکان (بە هەڵاواردنی ئیبن ڕوشد تا ڕادەیەك)، بە دەرەنجامەکانی ئەم هەڵەوە تلانەوە، و ڕەنگە دیارترینی ئەو بەرەنجامانە لە جیاوازبوونی شوێنگەی هەریەکە لە ئەفلاتوون و ئەرستۆدا، لای فەیلەسووفە مسوڵمانەکان، خۆی بنوێنێت. کاتێك تێبینی دەکرێت، کە فەیلەسووفە مسوڵمانەکان یەکەمجار فەلسەفەی ئەفلاتوون و دانراوەکانی ئەویان ناسی و سەروکاریان لەگەڵدا پەیداکرد، و ڕەنگە هۆی ئەوە بگەڕێتەوە بۆ باوەڕێ ئەفلاتوون – بەپێی تێگەیشتنی ئەوان لە فەلسەفەکەی– بە نوێیەتی جیهان، واتە جیهان دروستکراوی نوێیە، و باوەڕی بەوەی دەروون نەمرە، و ئەم بۆچوونانە لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامیدا دژ یەك نیە، بەڵام ئەرستۆ باوەڕی بە کۆنی جیهان هەیە، و ڕێبازەکەی لە دەروون و ئاکاردا، کەمتر ڕۆحانی ترە لە ڕێبازی ئەفلاتوون. لەبەرئەوە فەیلەسووفە موسوڵمانەکان وایان بینییوە کە بۆچوونەکانی ئەرستۆ مەترسییەکە بەسەر بیروباوەڕی ئاینییانەوە.

بەڵام بارودۆخەکە زۆری نەخایاند کە ئاڵوگۆڕ بوو قڵپ بوویەوە، و فەیلەسووفە مسوڵمانەکان زیاتر ئارەزوویان بۆ فەلسەفەی ئەرستۆ کرد، بەتایبەت دوای ئەوەی ئەرستۆیان ناسی -بەتایبەت بۆچوونەکانی لە خوداناسیدا- لەمیانەی شیکردنەوەی بۆچوونەکانی لەلایەن شوێنکەوتووانی (ڕێبازی ئەفلاتوونیەتی نوێ)وە، و ئەمەش بوو بەهۆی ئەوەی کە پێیان وابێت لێك نزیکی و بەیەکگەیشتنێك هەیە لەنێوان هزرە سەرەکیەکانی هەردوو فەلسەفەی ئەفلاتوون و ئەرستۆدا، پاشان ئەوانە -بە هەڵە- پێیان وابوو ئەرستۆ نزیکترە لە باوەڕ (عەقیدە)ی ئیسلامی، بە بیناکردنی ئەم بیروباوەڕە لەسەر هەردوو کتێبی بە هەڵە دراوە پاڵ و گەڕێنراوە بۆ ئەرستۆ، ئەوانیش کتێبی (سێو)، و کتێبی (میسۆلۆجیا)- کە ئەوانە لە بنەڕەتدا بەشێکن لە کتێبی (نۆنۆیی- التاسوعات) کە (ئەفلۆتین) دایناوە.

بە گشتی، ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە زۆرینەی فەیلەسووفە مسوڵمانەکان لە فەلسەفەی خۆیاندا شوێنی فەلسەفەی ئەرستۆیی کەوتن، بە هەڵاواردنی (ئەبوبەکری کوڕی زەکەریا ڕازی) کە لە فەلسەفەکەیدا دەستی کرد بە نزیکبوونەوەی زیاتر لە ئەفلاتوون وەك لە ئەرستۆ.

خۆ ئەگەر یەکخستنی بۆچوونەکانی ئەفلاتوون و بۆچوونەکانی ئەرستۆ، یەکێك لە پرسە دیارەکان بێت کە فەلسەفەی ئیسلامی پێ دەناسرێتەوە، ئەوا پرسێکی تری دیار کە هزری ئیسلامی پێ جیادەکرێتەوە و وای لێ کردووە بە بۆیەیەکی تایبەت بینەخشێنێ بکات، بریتی یە لە پرسی پەیوەندی نێوان ئاین (شەریعەت) و فەلسەفە (حیکمەت). ئەوەشی کە تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە زۆرینەی فەیلەسووفە موسوڵمانەکان (دیسان لەوانەیە بە هەڵاواردنی ڕازی) پێیان وابووە کە دژیەکبوون و ناکۆکی لەنێوان (شەریعەت) و (حیکمەت)دا نیە، چونکە هەردووکیان ڕێك هەوڵ بۆ یەك مەبەست دەدەن ئەویش حەقیقەتە، بەڵام هەریەکێکیان بەڕێگای جیاواز هەوڵ بۆ ئەم ئامانجە دەدات.

لە کاتێکدا کە (شەریعەت) یارمەتی خەڵکی دەدات بۆ گەیشتن بە (حەقیقەت) لە ڕێگەی سروشی خوداییەوە، یان نەقڵ (النقل)- واتە ئەو سروشە خوداییەی کە پێغەمبەر بۆ مرۆڤەکانی دەگوازێتەوە، ئەوا (حیکمەت) پشت دەبەستێ بە توانایی خەڵکی بۆ گەیشتنیان بە (حەقیقەت) لەڕێگەی (عەقڵ)ەوە. ناکۆکییەکیش لەنێوان شەریعەت و حیکمەتدا نییە تەنیا لە ڕێباز یان ئامرازەکەدا نەبێت، هەرچی مەبەستەکانیانە ئەوا هەر یەکێکە. ڕەنگە ئاشکراترین کەسێك کە گوزارشتی لەوە کردووە (ئیبن ڕوشد) بێت لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا "فصل المقال فیما بین الحکمة و الشریعة من الإتصال".

چالاکی فەلسەفیی ئیسلامی (لەڕووی کاتەوە) دەوری چوار سەدە درێژبووەوە، لە سەدەی دووەمی کۆچییەوە (هەشتی زایینی) -و بە دیاریکراوی لە ساڵی ١٨٥ کۆچی، کاتێك (کەندی) یەکەم فەیلەسووفی موسوڵمانان لە دایکبوو- بۆ سەدەی شەشەمی کۆچی (دوانزەی زایینی) -و بەدیاریکراوی بۆ ساڵی ٥٩٥ کۆچی، کاتێك (ئیبن ڕوشد) دوا فەیلەسووفی ئیسلامی کۆچی دوایی کرد-. بەڵام (لەڕووی شوێنەوە)، مێژوونووسانی فەلسەفەی ئیسلامی فەیلەسووفە موسوڵمانەکانیان پۆلێنکردووە بۆ:

١- فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، و دیارترینی ئەوانە: کەندی (دەوروبەری ٨٠٣ ز لەدایکبووە)، فارابی (٨٧٠- ٩٥٠ ز)، ڕازی (دەوروبەری ٨٧٠- ١٠٢٣ ز)، ئیبن سینا (٩٨٠- ١٠٣٧ ز)، و ئیخوان سەفا (کە لەمیانەی سەدەی دەیەمی زایین دەرکەوتن و لەڕووی هزرییەوە چالاکبوون).

٢- فەیلەسووفانی ڕۆژئاوای ئیسلامی، و دیارترینی ئەوانە: ئیبن باجە (دەوروبەری ١٠٨٨- ١٠٣٧ ز)، و ئیبن توفەیل (دەوروبەری ١١٠٠- ١١٨٥ ز)، و ئیبن ڕوشد (١١٢٦- ١١٩٨ ز).

لەواقیعدا چالاکی فەلسەفی ئیسلامی، زۆری نەبرد کە دەستیکرد بە کفتبوون، لە کۆتاییەکانی ژیانی (ئیبن ڕوشد)دا، بەهۆی ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی دیاریکراو کە

وولاَتی ئەندەلوس- کە ئەو کاتە تێیدا دەژیا، بەخۆیەوە بینی. و لەگەڵ مردنی (ئیبن ڕوشد)دا ئەو چالاکییەش دامرکایەوە. بەڵام ئەوە نەبووە هۆی وەستانی کاریگەرییەکەی، کاتێك توانای هەبوو (واتە ئیبن ڕوشد) کە پشکۆی چالاکی هزری لەو ناوەندە (یەهودییانە)ی ئەندەلوس کە بەتەنگەوەهاتووی فەلسەفە بوون، گەش بکاتەوە، ئەوانەی کە -لە دواتر- ئەو ڕۆڵەیان گرتە ئەستۆ کە (سریان) لە عێراق گێڕایان، کاتێك بەشدارییان کرد لە وەرگێڕانی کەلەپووری فەلسەفی ئیسلامی و یۆنانی بە عەرەبیکراو (واتە وەرگێڕدراو بۆ عەرەبی)- و بەتایبەت (شیکردنەوەکان)ی ئیبن ڕوشد بۆ دانراوەکانی ئەرستۆ، و دانراوەکانی تری ئیبن ڕوشد، سەرەڕای کتێبەکانی فەیلەسووفە موسوڵمانەکانی تر، یەکەمجار بۆ زمانی عیبری، پاشان بۆ زمانی لاتینی بۆ بەیەکگەیشتنی فەلسەفەی ئیسلامی و فەلسەفەی یۆنانی -و بەتایبەت فەلسەفەی ئەرستۆ- لەمیانەی ئەوەوە کاریگەرییان لە فەیلەسووفە (قوتابخانەییەکان) لە ئەورووپا کرد -و بەتایبەت لە ئیتالیا، و فەرەنسا، و تارادەیەك لە ئینگلتەرا- بەدرێژایی سەدەکانی دواتر، تا کاتی دەستپێکردنی ئەوەی بە زاراوەی (قۆناغی ڕێنسانسی ئەورووپی) ناودەبرێت، کە لە سەدەی پازدەهەم لە ئیتالیاوە دەستی پێکرد.

پەراوێز :

---

(١) "وەکو ئەوانە مەبن کە ناکۆکی و دووبەرەکیان لەناودا بەرپا بوو لە یەکتر دابڕان دوای ئەوەی ئەو هەموو بەڵگە و نیشانە ڕوونەیان بۆ هاتبوو ئەوانە سزایەکی سەخت چاوەڕێیانە". و

(٢) "گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەرەکەی بکەن و ئاشوب و ئاژاوە مەگێڕن و بەگژیەکدا مەچن گەر وا بکەن ئەوا شکست دێنن و دەسەڵاتتان نامێنێت". و

(٣) "ئەوانە ی کە دەیانگوت ئێمە گاورین کەچی بەشێك لەو شتانەیان فەرامۆشکرد کە پێیان ڕاگەیەندرابوو ئێمەش هەتا ڕۆژی قیامەت دوژمنایەتی و ڕق و کینەمان پێوە لکاندن لە ئایندەشدا خودا هەموو ئەو کار و کردەوانەیان دەخاتەوە بەرچاو و پێیان ڕادەگەیەنێت". و

# ڕۆڵی جوگرافیا وەك كەرستەیەكی جیۆپۆلۆتیك لە ئەفراندنی ڕووداو مێژوو شارستانیەت*

وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە
أومید ابراهیم محمد خوێندكاری ماستەر – زانكۆی كۆیە

دیارە لێرەدا مەبەستمان نیيە فەزل و گەورەیی زانستی جوگرافیا یاخود زانستی مێژوو بەسەر ئەوەی تر بدەین، هێندەی مەبەستمان ئەوەیە كە باسی پەیوەندی و هاوشانی و تەواوكەری ئەو دوو زانستە وەك دوو زانستی كۆمەلأیەتی بكەین.

جوگرافیا یەكێكە لەزانستە ئەساسی و بنەڕەتیەكانی یارمەتیدەر بۆ لێكۆڵینەوەی مێژوو، چونكە زانستی جوگرافیا زانستێكە لە مرۆڤ دەكۆڵێتەوە لەڕووی پەیوەندی مرۆڤ بە شوێنەكەیەوە واتە مرۆڤ و ژینگەكەی، ئەمەش لێرەدا مانای وایە كە لە بنەڕەتەوە وابەستەیە بە زانستی مێژووەوە كە زانستێكە لە مرۆڤ دەكۆڵێتەوە لە كۆشەنیگای پەیوەندی مرۆڤ بە كات و زەمانەوە، كەواتە لێكۆڵینەوە و توێژینەوەی هەردووكیان مرۆڤە، بەلأم لەدوو دیدگای جیاوازەوە، بۆیە لێرەدا دەبینین بابەتێك سەرهەڵدەدات ئەویش جوگرافیای مێژوویی یە، چونكە ئەو جۆرە لێكۆڵینەوە جوگرافیایانە سوودێكی زۆریان هەیە بۆ توێژینەوەی بابەتی مێژوویی و ڕاستی مێژوویی.

بەجۆرێك هەندێ لە توێژەران سەرهەڵدان و پەیدابوونی ئاینیەكان دەگێڕنەوە بۆ فاكتەر و هۆكاری جوگرافیایی، بەتایبەتی هۆكاری كەش و هەوا كە پێیانوایە

یەکتاپەرستی بەرهەم و دەرەنەنجامی ژیانی بیابانی ، جگە لەوەش زۆرجار پەیوەندی هەیە لەنێوان جوگرافیا و کەش و هەواو ژینگەی سروشتی ناوچەیەك و بیروباوەڕی دانیشتوانەکەی، بۆ نموونە دانیشتوانی ناوچە ساردەکان، بیروباوەڕیان وایە کە دۆزەخ "الجحیم" بریتیە لە جیهانێك کە پڕیەتی لەشەوە زەنگ و سەرما و سۆڵە و هەوایەکی ساردی گورچوبڕ، بەڵام لەبەرامبەردا دانیشتوانی ناوچە گەرمەکان وا سەیری دەکەن کە دۆزەخ دونیایەکە کە هەمیشە ئاگرێکی گڕگرتوو سووتاو باڵی بەسەردا کێشاوە.

لەلایەکی ترەوە هۆکاری جوگرافی و کاریگەریەکانی بە بنەما و کۆڵەکەی دووەم دادەنرێت لە دروست و بوون و سەرهەڵدانی شارستانیەت، چونکە مرۆڤ خۆی کۆڵەکەی یەکەمە. ژینگەی جوگرافی هەر لەجۆری پێکهاتەی زەوی و شێوە و بەرزی و نزمی و ڕاددەی بەپیتی و بێ پیتی زەویەکە و هەروەها زۆری هەبوونی سەرچاوەی ئاو و کەمی سەرچاوەی ئاو پاشان دەرامەتی کانزایی و ڕووەکی و بوونی دەریا و دەریاچە و ڕووبار و شاخ و دەشتو چیا و بەگشتی هەموو ڕواڵە تە جوگرافیایەکان هەموو ئەمانە کاریگەریەکی ئاشکرا لەسەر دیاردەی مێژوویی و ئاستی گرنگی ئەم ڕواڵەتە جوگرافیانە لە ڕەوتی گشتی مێژوویی مرۆڤایەتیدا بەجێ دەهێڵن.

هەر ئەم کاریگەرە جوگرافیایی و بارودۆخە ژینگەیی یە کە پێمان دەڵێ جۆر و "النمط الحضاري" و گەشەی شارستانیەتێك لە ژینگەیەکی سەر ڕووبار و بوونی دیاردەی بەردەوامی لافاوی وەك وڵاتی عێراق و میسر و چین جیاوازە لەو شارستانیەی کە لە ژینگەیەکی بیابانی و ووشك و شاخاویدا دروست دەبێت.

کاتێك مێژوونوسی کۆنی یۆنانی "ئیغریق" {هیرودوت Herodotus ٤٨٤ – ٤٢٥ پ.ز} کە باسی وڵاتی میسر دەکات سەیر دەکات سەرەتا بە وەسفکردنی بارودۆخی ژینگە و ئابووری و لایەنی مرۆیی و جوگرافیایی دەست پێدەکات وە کۆتایی قسەکانیشی بەوە دێنێ کە دەڵێ (أن مصر هبە النیل) واتا میسر بەخششی ڕووباری

نیلـە چـونکە ئـەو ڕووبـارە سەرچـاوەی ژیـانی میـسرە بەشـێوەیەك وای کـردووە کـە دەرامەتەکانی میسر لە بن نەیەن (صارت موارد مصر لاتنضب) چـونکە وای کردبـوو کـە دانیشتوانی میسر زیاتر لە دۆڵە تەسك و بە پیتەکانی دەوروبەری ئەو ڕووبارە کۆببنەوە، هەروەها لەلایەکی ترەوە لافاوی بەردەوامی ئەو ڕووبـارە میـسریەکانی فێـری ئەنـدازەی ئاودێری کردبـوو، جگـە لـەوەش وای لـە میـسریەکان کردبـوو کـە هەسـت بـە یـەکێتی و هاوکاری یەکتری بکەن لەپێناو بەدەست هێنانی بەرژەوەندی هاوبەش، دیـسان دەبیـنین کە ئەو بیابانەی کە دەوری ڕووبـاری نیلـی دابـوو، ئەمـە وای کردبـوو کـە میـسر لـەوێوە پەیوەندی بە جیهـانی دەرەوەی خـۆی بکـات، هـەروەها وای کردبـوو کـە سـنوورێك بێـت لەبەردەم کۆچی بەردەوامی کۆمەڵ و گەلانی تر بۆ ناو خاکی میسر.

ئەوەی کە دەربارەی جوگرافیای میسر و گرنگیەکەی گووترا هەمان شت سـەبارەت بە دۆڵی ڕافیدەین و عیراقیش هەر ڕاستە، چونکە ڕووباری دیجلە و فورات شوێن و پێگـە و کەستایەتیەکی دیـار و بەرچـاو و جیاوازیـان بـۆ وڵاتـی عێـراق دروسـت کردبـوو، بۆیـە دەبینین کە دۆڵی ڕافیدەین شوێنی سەرهەڵدانی کۆنترین شارسـتانیە، هـەر لەسـەردەمی سۆمەر و ئەکەد و بابل و دواتریش بۆماوەی چەندین سەدە.

لە مێژووی نوێ داو بگرە لە مێژووی چاخەکانی ناوەڕاستیشدا بەڕوونی کاریگەری و دەورو فاکتەری شوێن و پێگەی جوگرافیایی وڵاتان هەست پێ دەکـەین لەسـەر ڕەوتـی مێژوویی ئەو وڵاتانە واتا بەگشتی جیوپۆلیتیکی ئەو ناوچانە.

بـۆ نموونـە وڵاتێکـی وەکـو میـسر لـەماوەی سـەدەکانی ناوەڕاسـتداو بەتایبـەتی لەسەردەمی مەمالیکەکانی میسر، ئەو وڵاتە بوو بـووە خـاوەن سـامان و سـەرمایەیەکی زۆر و بێ شومار بەهۆی ئەو کاروانە بازرگانیانەی کە بە زەوی میسردا تێ پـەڕ دەبـوون، ئەم سەروەت و سامانە بوو کە مەمالیکەکان توانیان شارستانیەتێکی پێشکەوتوو بنیـات بنـێن و بتـوانن بـەڕووی شـالاو و داگیرکـاری هێزەکـانی ڕۆژئـاواوە بوەسـتن لـەکاتی

جەنگەکانی خاچ پەرستان و دواتریش، بەڵام کاتێك ڕێگەی بازرگانی سەری ئاواتی چاك "طريق رأس الرجاء الصالح" دۆزرایەوە و ڕێگەی بازرگانی جیهانی لە کۆتایی یەکانی سەدەی پانزەهەمەوە گۆڕا، سەیر دەکەین وولاتی میسر و چەند شارێکی تری ئەورووپی وەك شاری بندقیەی ئیتاڵی تووشی زەرەرێکی گەورە هاتن لایەنی دارابیان لاسەنگ بوو جگە لەوەش ڕژێمی ڕامیاری و سیاسیان بەو هۆیەوە تێك چوو، تاکو وای لێهات سوڵتانی مەمالیك "السطان الغوري" نەیتوانی بەرووی سوپای عوسمانیەکاندا بوەستێ و دواتر دەوڵەتی مەمالیك لە ساڵی ١٥١٧ ز لەناوچوو.

بەڵام لەلایەکی ترەوە میسر توانی بەهۆی هەڵکەندنی نۆکەندی سوێس "قناة السويس" ساڵی ١٨٦٩ جارێکی تر هێز و توانای ئابووری و سیاسی خۆی بگێڕێتەوە، پاشان میسریەکان هەمیشە خەباتیان دەکرد بۆ خۆماڵی کردنی ئەو نۆکەندە و دواجار لەسەردەمی کۆماری و لەسەر دەستی سەرۆکی ئەو کاتەی میسر "جمال عبدالناصر" ساڵی ١٩٥٦ خۆماڵی کرد.

هەر لەڕووی گرنگی جوگرافیا و شوێنی جوگرافی لەسەر ڕەوتی پێشکەوتنی مێژوویی شار و ناوچە و وڵاتان و لایەنی شارستانیان، دەبیبین دوورگەیەکی وەکو "صقليه" لە باشووری ئیتاڵیا و لە ناوەڕاستی دەریای سپی ناوەڕاست وای لەو شارەکردبوو هەمیشە ببێتە شوێنی چاوتێبڕینی داگیرکەران و بکەوێتە ژێر کاریگەری یۆنان و قەرتاجینەکان و ڕۆمەکان و عەرەبە مسوڵمانەکان و نورمانەکان و ئیسپانیەکان. کە لە ئەنجامی ئەو تێکەڵاویە وای لێهات کە ڕەگی شارستانیەتێکی نوێ و جیاواز لە شارەکانی تری ئیتاڵیا دروست ببێت لەڕووی بیرو فیکر و زانست و وێژە لەنیوەی یەکەمی سەدەی سیانزەمی زایینی هەر بەوهۆیەشەوە بوو کە یەکێك لە قۆناغەکانی سەرهەڵدانی سەردەمی ڕاپەڕین و ڕێنسانس "Renaissance"ی ئیتاڵیا و ئەورووپی لەو شارەدا دەردەکەوێت.

هەروەها تێبینی دەکرێت کە دابڕانی دوورگەکانی بەریتانیا واتا وولاّتی بەریتانیای گەورە بەگشتی لە کیشوەری ئەورووپا وای کردووە کە بەریتانیا لە ولاّتێکی دوورو نائیەوە لە کیشوەرێکی گەورەدا بکات بە ولاّتێکی سەربەخۆ و خاوەن ڕژێمێکی تایبەتی بەخۆی، چونکە ئەو شوێنە جوگرافیەی وولاّتانی تری ئەورووپی قەدەغەکردوە لەوەی دەست بخەنە ناو کاوربارەکانی هەر لەدێر زەمانەوە، وە پاشان کە بەهێز بوو هەمان شت پێگە جوگرافیەکەی وای لێکرد زاڵ بێت و دەسەلاّتی بشکێت بەسەر دەریادا و توانیوەتی بەپێی سەردەم و بارودۆخ دەست بخاتە ناو کاروباری ئەورووپیەوە، جگە لەوەش ئەو بارودۆخە جوگرافیەی کردوویەتی بە گەورەترین داگیرکەر و ئیستعماری مێژوو بەجۆرێك ئیمپراتۆریەتێکە کە ڕۆژ لێی ئاوا نابێت "امبراطورية لاتغيب عنها الشمس" لەبەر زۆری دەسەلاّت و زۆری داگیرکەر (مستعمرات)ی.

لەلایەکی ترەوە لایەنی تۆپۆگرافیش واتا بەرزی و نزمی زەوی کاریگەری و ڕۆڵی گەورەی لەسەر ڕەوت و ئاڕاستە و ئەنجامی جەنگ و شەڕەکانی مێژوو هەبووە، بۆ نموونە پێویستە لێکۆڵەری مێژوویی بزانێت لەکاتی جەنگدا شوێن و پێگەی جوگرافی کامیان باشتربووە لەوەی تر، یاخود ئایا لایەنێکیان توانیویەتی کۆنترۆڵی ڕێگەوبانە گرنگەکان بکات و نەهێڵێت یارمەتی پێداویستی جەنگی بگات بە دوژمنەکەی.

هەروەها لایەنی دەشت و شاخ و ئاووهەوای کاتی شەڕەکە ئایا هەور بووە یاخود ڕۆژەتاو هەساو یان بارانی یان قرچەی گەرما بووە، چونکە هەڵبژاردنی کات و شوێنی شەڕی گەورەی "حطين" لەلایەن "صلاح الدين الأيوبي"یەوە کە لە ڕۆژی (١٧)ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٥٨٣ك – ١١٨٧ز دوای نوێژی هەینی بەڵگەیە لەسەر زیرەکی و لێهاتوویی سەرکردە و شارەزا لە نەخشە و پلانی سەربازی و گرنگی لایەنی جوگرافی و کات و شوێن، چونکە وای لە خاچ پەرستەکان کرد کە لە ناوەڕاستی مانگی تەموزدا هێرش بکەن کە ئەمەش وای لێکردن دەستیان نەگات بە سەرچاوەی ئاو.

هەروەها لەسەر هۆكاری ئاووهەوا ووتەیەكی ناپلیۆن پۆناپەرتی فەرەنسی هەیە كە ووتویەتی ساردی ڕووسیا و گەرمی سوریا، دوو دوژمن بوون كە نەمتوانی تێكیان بشكێنم، وە ڕووس نەبوو كە ناپلیۆنی بەزاند، بەڵكو سەركردە ینایر تێكی شكاند كە مەبەستی ساردی مانگی كانوونی دووەم بوو "ان برد روسیا وحر سورية هما العدوان اللذان عجزت عن قهرهما و الروس لم يهزموا نابليون، ولكن هزمه القائد ينـاير – أي برد شهر كانون الثاني–" دیسان ئەدۆڵف هیتلەریش ساڵی ١٩٤١ لە ڕووسیا "یەكێتی سۆڤیەت" تووشی هەمان كارەسات و مێژوو بۆوە بەهۆی بارودۆخی ئاووهەوای جوگرافیاوە، وە لە كۆتایی سەدەی شانزەش هەڵكردنی گەردەلول لە شەڕی ئەرمادەی "الأرمادا"ی ساڵی ١٥٨٨ نێوان ئینگلیز و ئیسپانیا وای كرد كە ئیسپانیانیەكان تێك بشكێن و ئینگلیزیش باڵادەست تر بێت.

هەروەها كاتێك تەیمور لەنگ لەشەڕی ئەنقرە ساڵی ١٤٠٢ز كە سوڵتان بایەزیدی یەكەمی عوسمانی تێكشاند بەهۆی هەبوونی دەریا نەیتوانی بگاتە ئەورووپا بۆیە ناچار گەڕایەوە بۆ وولاتەكەی خۆی لەناوەڕاستی ئاسیا.

ئەمانەی كە باسكران هەموو ڕۆڵ و گرنگی جوگرافیا دەردەخەن لەسەر ڕووداو و ئاراستەی مێژوو كە هەر لەسەردەمی فەیلەسوف و نوسەرانی گەورەی ئیغریق و ڕۆمانەوە بایەخ بەو لایەنە دراوە، چونكە هەریەك لە فەیلەسوفانی یۆنانی كۆن "أبی قراط و أرسطوا" باسیان لەم لایەنەكردووە، هەروەها مێژوونوسی ڕۆمانی "سترابون strabon" لە كتێبی (الجغرافية) باسی ئەو كاریگەریەی كردووە.

---

* منهج البحث التأريخي : دكتور محسن محمد حسين و دكتور عبدالرحمن حسين العزاوي ، وزارة التعليم العالي و البحث العلمي ، جامعة البغداد ، كلية التربية الاولى ( ابن رشد ) ، بغداد ١٩٩٢ .

# دەوڵەتی عوسمانی

و. لە عەرەبییەوە: د. محمد عبدالله کاکە سوور

دەوڵـەتی عوسمـانی (١٢٩٩-١٩٢٤) (نـاوی فـەرمی دەوڵـەتی عەلیـەی عوسمـانی) بەگوێرەی زاناکانی سونەش خیلافەتی ئیسلامییە، دەوڵەتێکی ئیسلامی بوو، عوسمـانی یەکەم دایمەزراند، فەرمانڕەوایی کردووە بەسەر چەند بەشێکی گەورەی ئاسیای بچووك و حیجاز و عێراق وشام و میسر و سودان و زۆربەی ڕۆژئاوای عارەبی و سۆماڵ و بەلقان و نەمسا و ئەلبانیا و ڕۆمانیا و بولغاریا و ئەرمینیا و جۆرجیا و یۆنان.

بارەگای : یانی شهر: ١٢٨٠- ١٣٦٦، ئەدەنە: ١٣٦٦- ١٤٥٣، ئەستەنبول: لە ١٤٥٣.

زمانی فەرمی : زمانی تورکی عوسمانی.

پایتەخت :

سوغوت (١٢٩٩- ١٣٢٦)

بورصە : (١٣٢٦- ١٣٦٥)

أدرنە (١٣٦٥- ١٤٥٣)

ئەستەمبوڵ (١٤٥٣- ١٩٢٢)

ئاین : ئیسلام

فەرمانڕەوایی : خیلافەت

تەمەنی خیلافەت : ٦٢٥ساڵ

نازناوی سەری دەوڵەت : سوڵتان

دامەزراندن : ساڵی ١٢٩٩

یەکەم سوڵتان موورادی کوڕی صدار : عوسمانی کوڕێ ئەرتوغرول (١٢٩٩– ١٣٢٦)
دوا سوڵتان : عبدالمجیدی دووەم (١٩٢٢– ١٩٢٤)
دەوڵەتی دواتر : تورکیا
ڕووبەر : لەساڵی ١٦٨٠ ز دا (٥,٥٠٠,٠٠٠ کم٢)
دانیشتوان : لەساڵی ١٨٥٦ز دا (٣٥,٣٥٠,٠٠٠) کەس
دراو : لیرەی عوسمانی

ڕەچەڵەکیان و دامەزراندنی دەوڵەت

عوسمانیەکان لە خێڵەکانی (ئۆغۆز)ی تورکمانی کەوتوونەتەوە، لەگەڵ شەپۆلی هێرشەکانی مەغۆلی لە ناوچەی خۆیان لە مەنغۆلیا بەرەو ڕۆژئاوا چوون، لەساڵی ١٢٣٧ ز میرنشینێکی جەنگیان لە بتبینیا (باکوری ئەنازۆل)، بەرامبەر دوورگەکان قرم) دامەزراند، دوای ئەوەتوانیان سەلجوقییەکان لە ناوچەی ئەنازۆل هەڵکەنن، لەسەردەمی سوڵتان عوسمانی یەکەم (عوسمانی کوری ئەرتۆغل) (١٢٨٠– ١٣٠٠ز) ئەوەی کە بنەماڵەکەیان ناوی هەڵگرت، ئینجا ئەوانەی لەدوای ئەو هاتن، میرنشینەکە لەسەر حسابی میرنشینی بێزنتە فراوان بوو (داگیرکردنی بورسە: ١٣٧٦ز، ئیدرین : ١٣٦١) لە ساڵی ١٣٥٤ عوسمانیەکان بۆ یەکەمجار پێیان لەسەرخاکی بەلقان دانا، شاری گالیبۆلی لە تورکیادا یەکەم بنکەیان بوو، عوسمانیەکان یەکەی تایبەتیان پێکهێنا بەناوی ئینکیشاری ناسرا. (زۆربەی ئەندامەکانی لەناوچەی بەلقان بوون)، بەهۆی ئەم هێزە نوێیانە توانیان بەخێرایی لە ئەنازۆل و بەلقان فراوانخوزی بکەن (شەڕی نیکبۆلیس ١٣٨٩ز) کەچی لە ساڵی ١٤٠٢ز بۆ یەکەمجار لە بەردەم هێزەکانی تەیمور لەنگ توشی شکست بوون، لەدوای ئەم شکستە ماوەیەك لە پەشێوی سیاسی هات، دەوڵەت هاوسەنگی خۆی بەدەستهێنایەوە و سیاسەتی فراوانخوازی لە سەردەمی موورادی دووەم

(١٤٢١- ١٤٥١ن) ئینجا (محەمەدی فاتح ١٤٥١- ١٤٨١ن) بەردەوام بوو، ئەوەی دووەمیان توانی لە ساڵی ١٤٥٣ بچێتە ناو ئەستەمبوڵ بەمەش کۆتایی بە چەند سەدەیەك لە بوونی بێزەنتی لە ناوچەکەدا هێنا.

سەرەتای سەرهەڵدانی عوسمانیەکان

لەدوای مردنی ئەرتۆغل، سولتان عەلادینی سەلجوقی هەڵستا بە دانانی میر عوسمان لە جێگای ئەودا، عوسمانی کوڕی ئەرتۆغل لە ساڵی ٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز لە دایکبووە و لە ساڵی ٧٢٦ك/ ١٣٢٦ز مردووە. لە هۆزی قایی یە. لە خێڵی غوز (ئەغۆز)ی تورکییە. سلێمان شای باپیری، میری هۆزی قایی لەگەڵ هۆزەکەی لە ناوچەی ڕەسەنی خۆیانەوە لە ئاسیای ناوەڕاستەوە کۆچیان کرد بۆ ئەوەی لە ئەنازۆڵ بگیرسێنەوە، بە ئازایەتییەکی بێ وێنە فراوانخوازی ئەنجامدا، سولتان عەلادین پاداشتی کرد و ڕێزی لێنا، بەوەی نیشانەی سەلجوقییەکانی پێدا، کە بریتی یە لە ئاڵای سپی و جل و بەرگێك و دەهۆڵێ:، و سەربەخۆیی پێدا، نازناوی بەگی پێ بەخشی، ئەمەش لە سەرەتای ساڵی ٦٨٨ك/١٢٨٩ز، و ڕێگەی پێدرا کە دراو بەناوی خۆی دەربکات، واتە ناوی خۆی لەسەر بنوسێ. هەروەها لەسەر مینبەرەکانی مزگەوتەکانی سەلجوقی لەدوای سولتان ناوی دەهات، سولتانی سەلجوقی کەی قوبادی سێیەم ناوچەکانی ئاسکی شەهر وئینۆنۆی لە ساڵی ١٢٨٩ز پێدرا.. بڕیاریدا ئەو ناوچانەی بێزەنتی و ناوچانەی تری پێبدات کە خۆی دەیانگرێت. عوسمان ئابلۆقەی شاری بورسەی دا، بورسە شارێکی ناسراوە لە ڕۆژئاوای ئەنازۆل، ئەم ڕووداوە لە ساڵی ١٣١٤ز بوو، بەڵام نەیتوانی دەستی بەسەردا بگرێت، و ناوچەی قەڵەمڕەوی عوسمانی و میرنشینەکەی فراوانبوو؛ ناوچەکانی سوغود، و دومانیج، ئینەکول، و ینی شەهر و ئین حیسار، و قویون حیسار، و کوبری حیسار، و یونید حیساری دەگرتەوە، و لە ساڵێ ١٣٠٠ز یەنی شەهری کردە سەنتەری ئەو میرنشینە.

بەخیانەتکردنی سەرکردەیەکی بێزەنتی و کۆتایی دەوڵەتی سەلجوقییەکان هاوڕێیەتی لەنێوان عوسمانی یەکەم و سەرکردەی بێزەنتی کوسە میخائیل فەرمانڕەوای قەڵای (خزمن قایا) کە موسوڵمان بوو دروست بوو، و عوسمانی لە پیلانێکی بێزەنتی ڕزگار کرد کە لە داوەتکردنێکی بووک گواستنەوەی بێزەنتی بۆی دانرابوو. لەو کاتانەدا قازانی مەغۆلی هێرشی کردە سەر شارە سورییەکان و لە ساڵی ٦٩٩ک/١٢٩٩ز داگیریکردن، و کۆتایی بە دەوڵەتی سەلجوقییەکانی ئەنازۆڵ هێنا، زۆر لە زاناکانی دەوڵەتی سەلجوقی لە کاتی هەڵاتن لە مەغۆل ڕوویان کردە لای عوسمانی کوڕی ئەرتۆغل، و هەروەها میر و پیاوماقوڵ و دەوڵەمەندەکانی سەلجوقی ڕوویان کردە عوسمان، بەمەش میرنشینەکەیان دەوڵەمەند کرد و وایلێهات لە تەنیا خێڵێك و میرنشینێك بگۆڕێ بۆ کیانێك کە بنەماکانی دەوڵەتی هەبێت، بەمەش دەتوانین بڵێین کە سەڵتەنەتی عوسمانییەکان بەو هەڵاتووانە لە ڕووی مەغۆل لە ساڵی (٧٠٨ک/١٣٠٨ز) دە ستی پێکرد، واتە کاتێك دوا سوڵتانی سەلجوقییە ڕۆمەکان سوڵتان غیاسەدین مەسعودی سێیەم مرد، ئەوەبوو پێشتر میرنشینی عوسمانی سەربە دەوڵەتی سەلجوقی بوو.

### دەستگرتن بەسەر بۆرسەدا

ئەو ئامانجە گرنگەی میر عوسمان هەوڵی بۆدەدا، داگیرکردنی شاری بۆرسە بوو، بۆئەوەی بیکاتە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی، ئەمەش ئامانجێ بوو میر عوسمان تاکو دوا ژیانی هەوڵی بۆ دەدا، کاتێك لەسەر مردن بوو فەرمانی بە کوڕەکەی ئۆرخان کرد کە ئابلۆقە بخاتە سەر بۆرسە، بەوپەڕی توانای هێرشبکاتە سەری و دەستی بەسەردا بگرێت، ئۆرخان لەمەدا سەرکەوتوو بوو، لە سەرەمەرگدا هەوڵێ گرتنی بورسە بە میر عوسمان گەیشت، و تەرمەکەی گواسترایەوە شاری بورسە و لەوێ نێژرا، ئەمەش لە ساڵی ٧٢٦ک/١٣٢٤ز، لەدوای ئەوەی حەفتا ساڵ ژیا، ٢٧ ساڵی لەسەر تەختی

سەڵتەنەت بردە سەر، و عوسمانی یەکەم حەوت منداڵی هەبوو کە ئەوانە بوون: ئۆرخان بەگ، عەلادین بەگ، جوبان بەگ، و حامید بەگ، و فاتیمە خاتوون، و بانارلی بەگ و مەلەك بەگ.

**سەرەتای سەڵتەنەتی عوسمانی**

سوڵتانی عوسمانی یەکەم لە شارۆچکەی سنغوتی سەر بە شاری (ینی شەهر) ساڵی ٦٥٦ك/١٢٥٨ز لەدایك بوو، و کاتێك سوڵتان عەلادینی سەلجوقی مرد، سەڵتەنەتی ڕاگەیاند و میرەکانی سەلجوقی هاتنە لای و چوونە چوارچێوەی پارێزگاریکردنی، و کردیان بە سوڵتان لەسەر ئەنازۆل، و شاری ینی شەهری کردە پایتەخت، و ماوەی حەوت ساڵ لە شەڕکردن بەردەوام بوو، و هێرشی کردە سەر زۆر لە قەڵاکانی ڕۆمە بێزەنتییەکان و هێرشی کردە سەر شاری کبری حیسار و قەڵای ئەزتیقی ناودار و سوپایەکانی بێزەنتی هێرشیان کردە سەر ینی شەهری پایتەختی عوسمانییەکان بەسەرکردایەتی سو پایەکەی لە تەنیشت قەڵای قیون حیسار ڕووبەڕوویان بووەوە و شکستی پێهێنان و تاوەکو دیمبوز ڕاوی نان. و میری شاری کستلی بێزەنتی کوشت، و پاشماوەی میرە بێزەنتییەکان بەرەو بورسە و قوستەنتینیە ڕایان کرد، و لەساڵی ٧١٧ك/١٣١٧ز سوڵتان دوو قەڵای لە نزیك شاری بورسە دامەزراند، کوڕ برای ئاق تەیموری لە یەکێکیان کرد بە سەرکردە و لەوەکەی تردا بلبانجقی یەکێك لە مەملوکەکانی کرد بە سەرکردە، و ئابلۆقەی بۆرسەی دا، و سوڵتان ئورخانی کوڕی وکوسە میخال و صالتق ئالبی بەجێهێشت بۆ پارێزگاریکردن لە وڵاتەکە و ئابلۆقەی قەڵای قرەی دا، ئینجا سوڵتان عوسمان هێرشیکردە سەر قەڵای لبلبنجی، و قەڵای جادر لق و یکنجە حصار و ئاق حصار و تکفور، ئینجا غازی ئورخان و غازی عبدالرحمن و هی تری نارد بۆ قەڵای قەرەجیش، و دەستیان بەسەرداگرت و سوڵتان لە هێرشەکانی بەردەوام بوو بەرەو شاری ئەزمید، (قوجە ئیلی

لەو کاتەدا غازی عبدالرحمن هێرشیکردە سەر ئەزنیق (نیقیا)، لە ساڵی ٧٢٦ک/١٣٢٦ز سوڵتان عوسمان غازی نیازی بوو هێرش بکاتە سەر بورسە، ئۆرخان بەگی کوڕی بەسەرکردەی هێزەکانی هێرشبەر دانا، و دەستی گرت بەسەر چیای أولیمە (اولوداغ) نزیك بورسە (بروسە) ئینجا هێرشی کردە سەر بورسە، و سوڵتان عوسمان نەخۆش کەوت، کوڕەکەی غازی ئورخان سەردانی کرد، سوڵتان عوسمان لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا مرد، لە ١٧ یان ٢٠ی ڕەمەزانی ساڵێ ٧٢٦ک/١٣٢٦ز مرد، ئەوە و عوسمان هێرشیکردە سەر خاکی بێزەنتییەکان و خستییە سەر موڵکەکانی تاکو گەیشتە شازدە هەزار کیلۆمەتر لەکاتی مردنی لە ساڵی ٧٢٦ک/١٣٢٦ز، و ماوەی سەڵتەنەتەکەی ٢٧ ساڵ بوو، و لە گۆڕستانی تایبەتی خۆی لە بۆرسە نێژرا، لەدوای ئەو کوڕەکەی ئورخان غازی بوو بە سوڵتان و کاروباری ئیدارەی دایە دەست عەلادینی برای، لەو ساڵەدا یوو مورادی یەکەمی کوڕی لەدایك بوو.

سەرچاوەکان باس لەو دەکەن کە توغرول یارمەتی میر عەلادینی سەلجوقی دا لە یەکێك لە شەڕەکانی و ئەویش بە ئازایەتی سەرسام بوو و زەوییەکی سەر بە دەوڵەتی سەلجوقی پێدا، و میرنشینەکەی خۆی تێدا دامەزراند و ناوچەکە چەند میرنشینێکی تورکەکانی تری تێدا بوو، لەهێرشی مەغۆل هەلاتبوون بۆ ناوچەی ڕۆژهەلاتی ئەنازۆل.

## فراوانبوونی دەوڵەت

### فراوانخوازی عوسمانییەکان لە ئاسیای بچووك دا

عوسمان سنووری دەسەلاتی فراوان کرد تا گەیشتە دەریای ڕەش، لە ساڵی ١٣٢٦ ئورخانی کوڕی دەسەلاتی گرتە دەست، ئەوەی کە بنەمای سوپای ئینکیشاری دامەزراند.

**فراوانخوازی عوسمانییەکان لە ئەورووپا دا**

لەساڵی ١٣٥٩ز مرد و کوڕەکەی مورادی یەکەم بەدوایدا هات، ئەوەی کە هێرشی کردە سەر نیوە دوورگەی بەلقان و دەستی بەسەر ئەدرنەدا گرت. و لە شەڕی قوصوە (شەڕی کۆسۆڤۆ) لە ساڵی ١٣٨٩ز دوای سەرکەوتنی بەسەر سیرب و بولغار کوژرا. بایەزیدی یەکەم لە شەڕی نیقوبولس بەسەر هاوپەیمانییەتی ئەورووپی خاچپەیدا بەسەرکەوت و ڕۆژهەڵاتی سۆفیا پایتەختی بولغاریای خستە سەر دەوڵەتەکەی.

**فراوانخوزی لە جیهانی ئیسلامی دا**

عوسمانییەکان بوون بە هێزی پێشڕەو لە جیهانی ئیسلامی، و سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢– ١٥٢٠ز) لە شەڕی چاڵدێران بەسەر سەفەوییەکاندا سەرکەوت، ئەوەی وایلێکرد بتوانێ لە ساڵی ١٥١٤ز دەست بەسەر عێراق و ئازربیجاندا بگرێت، ئینجا لە ساڵی ١٥١٦ لە شەڕی مەرج دابق دەستی گرت بەسەر وڵاتی شام و فەلەستین، و لەساڵی ١٥١٧ز دوای شەڕی ڕیدانیە دەستی بەسەر میسردا گرت، و لەسەردەمی سلێمان قانونی کوڕی (١٥٢٠–١٥٦٦ز) دەوڵەتی عوسمانی گەیشتە ترۆپکی خۆی، کە بەردەوام بوو لەسەر هێرشکردنە سەر بەلقان (مەجەر ساڵی ١٥١٩ز، ئینجا ئابلۆقەی ڤیەننا)، و لە ساڵی ١٥٣٢ز دەستی گرت بەسەر کەناری سۆماڵی لە دەریای سوور و توانی گەشتیگەلێك دروست بکات بۆئەوەی بە یارمەتی خێرالدین بربروس دەست بەسەر دەریای ناوەڕاستدا بگرێت کە لایەنگیری خۆی بۆ سوڵتان بەدەرخست، لەدوای ١٥٥٢ چوونە پاڵی هەر سێ دەوڵەتەکە جەزائیر و تونس و تەرابلس بۆ دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیەنرا: ئەمەش لەسەر داواکاری جەزائیر کە ئۆتۆنۆمی هەبوو، کاتێك لە ساڵی ١٥١٨ خێرالدین بربروس داوای یارمەتی لە ئەستەمبوڵ کرد لەدوای کوشتنی بابا عروجی برای لەلایەن ئیسپانییەکانەوە، ئەوانەی کە شاری وەهرانیان داگیر کرد. دواتریش ئەم

ناوچانەیان گرت: کەنارەکانی تلمسان و مستغانم و تنس و دلس و بجایە، ئەوەبوو تەرابلوس لە دەوروبەری ساڵی ١٥٥١ز هاتە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی. بەم شێوەیە دەوڵەت لەسەر زۆربەی ئەوەی بە نیشتمانی عەرەبی دەناسرێ درێژبووەوە، بە دەراوتنی ناوەڕاستی جەزیرە و مەراکیش و عومان و سەرەڕای درێژبوونەوەی لە ناوەڕاستی ئاسیا و باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا.

## پاشەکشەکردن

لەدوای ساڵی ١٥٦٦فەرمانڕەوایی کەوتە دەست سوڵتانە بێ دەسەڵاتەکان یان ئەوانەی شایستەی فەرمانڕەوایی کردن نەبوون، ئینجا ساڵی ١٦٥٦ بەدواوە دەسەڵات کەوتە دەست گەورەی وەزیران (صەدری ئەعزەم) یان گەورە سەرکردەکانی ئینکیشاری. لەگەڵ ئەم سەردەمە ماوەی داتەپینی سیاسی و ڕۆشنبیری دەست پێدەکات. عوسمانییەکان لە ململانێیەکی بەردەوامدابوون لەگەڵ بنەماڵەی هاپسبۆرگ. شایەکانی نەمسا (ئابلۆقەی ڤیەننا ١٦٨٣ن)، کەچی دوای شەڕی ڤیەننا سەنتەری هێزەکان گۆڕان، لە ساڵی ١٧٠٠ بەدواوە بارودۆخی عوسمانییەکان لە هێرشکردنەوە گۆڕا بۆ بەرگریکردن.

لەسەردەمی هەردوو سوڵتان سەلیمی سێیەم (١٧٨٩-١٨٠٧ن) ئینجا مەحمودی دووەم (١٨٠٨-١٨٣٩ن) لەدوای ئەو دووبارە هەیکەلی دەوڵەت دامەزرێنرایەوە، سەرەڕای ئەوەش بارودۆخی دەوڵەت لە داتەپیندا بوو، لە ساڵی ١٨٣٩ چاکسازییەکان ڕاگەیەنران لەسەر شێوازی ئەورووپی. سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦-١٩٠٩ن) بەشێوەیەکی ستەمکارانە ئەم چاکسازییانەی کۆتایی پێهێنا، لەئەنجامی ئەمەش هەموو هێزە نیشتمانییەکان لە تورکیادا دوژمنایەتی سوڵتانیان دەکرد. لە ساڵی ١٩٢٢ز دوا سوڵتانی عوسمانی محەمەدی شەشەم (١٩١٨-١٩٢٢ن) لەسەر کار لابردرا، لە کۆتاییدا و لە ساڵی ١٩٢٤ کەمال ئەتاتورک بەتەواوی خیلافەتی هەڵوەشاندەوە.

## هۆکارەکانی لاوازیی دەوڵەتی عوسمانی

### هۆکارە ناوخۆییەکان

١- لاوازی سوڵتانەکانی دوایی ئەمەش بەدیاردەکەوێ لە:

سەرکردایەتی نەکرنیان بۆ سوپا.

سەرکردایەتی نەکردنیان بۆ دانیشتنەکانی نێو دیوان.

لاوازیی تواناییان لەڕووی ئیدارییەوە.

خەریکبوونیان بە کاروبارە تایبەتییەکانیان.

٢- ڕۆچوونەخوارەوەی ئینکیشاری.

مەشقەکانیان پشتگوێ خست.

پەیوندییان بە سەربازگەکانیان کەم بووەوە، ئەوەی کە بووە هۆی کەمبوونەوەی توانا جەنگییەکان.

٣- خراپی سیستەمی باج کۆکردنەوە.

کۆکردنەوەی باج لە ویلایەتەکان بەشێوەی ئیلتیزام دەبوو.

### هۆکارە دەرەکییەکان

١- جیاوکە بێگانەییەکانی هەندێ دەوڵەتی ئەورووپی بووە هۆی دەستێوەردانیان لە کاروباری دەوڵەتدا.

٢- چاوتێبڕینە ئیستیعمارییە ئەورووپییەکان لە موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانی.

٣- دەرکەوتنی ڕوسیای تزاری وەکو هێزێك لەسەر حیسابی دەوڵەتی عوسمانی، و هاندانی گەلانی بەلقان و کە شۆڕش بکەن دژی دەوڵەتی عوسمانی.

٤- ئەو شکستانەی کە سوپا ئەورووپییەکان تووشی سوپای عوسمانییان کرد بەهۆی:

- داهێنانی چەکی نوێ لەلایەن ئەورووپییەکان و زۆر تێکەڵ بوونیان لەگەڵ شۆڕشی پیشەسازییدا.
- سەرکەوتووتر بوونی شێوازە جەنگییەکان و لاوازی ئینکیشاری.

سیستەمی فەرمانڕەوایی و ئیدارە لە دەوڵەتی عوسمانی

١- لە ئەرکەکانی سوڵتان:

- جێ بەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلام.
- سەرکردایەتی کردنی سوپاکان.
- دامەزراندن و لابردنی وەزیرەکان.

٢- صدری ئەعزەم

- لەسەرەتای سەردەمی عوسمانیدا ڕاوێژکاری سوڵتان بوو.
- لەماوەی لاوازی سوڵتانەکاندا بوو بە نوێنەری سوڵتان و کاروباری دامەزراندن و وەزیفەکان و کاروباری پەیوەست بە سوپا و ئیدارەی بە دەستەوە بوو.

سوپا

سوپای عوسمانی ڕۆڵێکی گرنگی بینی لە دامەزراندنی دەوڵەت و چەسپاندنی پێگەکانی، و سوپای عوسمانی دابەش دەبوو بەسەر سێ بەش بریتی بوون لە:

هێزەکانی وشکانی: لە سوارە و تۆپخانە و ئینکیشاری پێکدەهات و بەناوبانگترین تیپەکانی سوپایان پێکدەهێنا.

هێزەکانی ویلایەتەکان: ئەم هێزانە لە سوارەکان و هێزەکانی قەڵاکان پێکدەهات، هەندێکجار والییەکان هێزی تایبەت بە خۆیان پێکدەهێنا کە بە هێزی لۆکاڵێ دەناسران، ئەوە و والییەکان سودییان لەم هێزانە بینی لە چەسپاندنی دەسەڵاتیان و یەکخستنی ویلایەتەکانیان.

هێزەکانی دەریایی: عوسمانییەکان ئەوپەڕی گرنگییان بە هێزەکانی دەریاوانی دا، بەتایبەتی دوای گرتنی قوستەنتینیە، ئەوە و لە سەردەمی سوڵتان بایەزیدی دووەم چەندین بنکەی دەریای دامەزرا، ئەم گرنگی پێدانە لە سەردەمی سوڵتان سلێمانی قانونی گەیشتە ترۆپکی خۆی، بە دامەزراندنی خیرالدین بربروس وەکو سەرکردەی باڵای هێزە دەریاییەکان. ئەوەبوو کەشتیگەلی عوسمانی لە سەردەمی ئەودا بوو بە بەهێزترین کەشتیگەل لە دەریای سپی ناوەڕاست دا.

ئەمە سەرەڕای هێزی ئاسمانی کە لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانی بەدیارکەوت.

**ڕژێمی فەرمانڕەوایی و ئیداری لە ویلایەتە عەرەبییەکان**

کاتێك دەوڵەتی عوسمانی فراوانبوو عوسمانییەکان پەنایان بردە بەر دابەشکردنی بۆ چەند ویلایەتێك. ویلایەتەکان دابەشکرانە سەر یەکەی ئیداری بچووك بە سەنجەق ناسرا، ئەمانەش دابەشکرانە سەر یەکی ئیداری بچووکتر بە ناحیە ناونران.

جیهازی ئیداری ویلایەتە عوسمانییەکان لە ژمارەیەك فەرمانبەری گەورە بەم شێوەیەی خوارەوە پێکدەهات:

١- والی: ئەرکی والی ئەوەبوو کە لە کاروباری ئیداری و سەربازی جێگای سوڵتانی بگرتایەتەوە، هەروەها لە پاراستنی ئاسایش و کۆکردنەوەی باجەکان و ناردنی پارەی سەپێنراو بەسەر ویلایەتەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەت. والی شام لە والییەکانی تر بەوە جیادەکرایەوە کە پایەی میری حەجیشی هەبوو. ئەرکی میری حەج بریتی یە لە سەرپەرشتیکردنی قافلەی حەجی شامی کە حاجی لە ناوچەکانی وڵاتی شام وئەنازۆل و بەلقانی بەخۆوە دەگرت، و قافلەکە لە دیمەشق دەردەچوو، بە ڕۆژهەڵاتی ئوردوندا تێدەپەڕی بەرەو حیجاز.

٢- سنجەق و ناحیە: فەرمانڕەوایانی سنجەق و ناحیەکان کاریان بریتی بوو لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی والی و ئیدارەی مەرکەزی و ڕاپەڕاندنی کاروباری ناوخۆ و پاراستنی ئاسایش و سەقامگیری لە ناوچەکانیان دا.

٣- دەفتەردار: ڕاستەوخۆ لەلایەن سوڵتانەوە دادەمەزرێندرا، ڕۆڵی بریتی بوو لە کاروباری دارایی لە ویلایەتەکە و وەکو خەزنەدار وابوو.

سەرچاوە: ئینتەرنێت

# الفصل الخامس
# واجبات الشرطة في العصر الأموي

د.أرسن موسى رشيد

كان للشرطة في الدولة الأموية مكانة مميزة بسبب الواجبات المهمة التي كانت تقوم بها هذه المؤسسة تجاه السلطة و المجتمع. فالخلفاء و الولاة إستخدموا الشرطة لحماية أنفسهم من مؤامرات مناوئيهم السياسيين. الى جانب الحفاظ على الأمن و النظام داخل المجتمع. فالمهام التي كانت الشرطة تقوم بها متعددة و متنوعة. منها معاقبة المجرمين و الخارجين على القانون داخل المدن، وتوفير الحراسة للطرقات و حماية المدنيين من اللصوص، مع التشدد في ذلك حين تحدث الإنتفاضات و الإضطرابات من حين الى آخر. ومن المهام التي يقوم بها الشرطة أيضاً تطبيق الحدود التي حددتها الشريعة الإسلامية ضد كل من تسول له نفسه ارتكاب الجرائم التي أوجبت لها الحدود كالسرقة و الزنى و غيرها[١]. كل هذا يفسر القوة السلطوية التي كانت الشرطة تتمتع بها في ظل الخلافة الأموية.

يرى عدد من الباحثين المعاصرين أن مصطلح الشرطة يماثل مصطلح البوليس. وأن مهام الشرطة هي المهام نفسها التي تقوم بها قوة البوليس. فالمستشرق ليفي مثلاً يرى أنّ "الأصل في الشرطة إنها جاءت في البداية كقوة بوليسية"[٢]. ويماثله في الرأي كولسون حيث يُعرّف الشرطة كقوة بوليسية[٣]، ويذهب دينيت أيضاً الى الرأي نفسه[٤]. وقد تمند العالم أمير علي هذه النظرية في كتابه "مختصر تأريخ المسلمين" الذي وضعه بالإنجليزية[٥].

على ما يبدو أن هؤلاء قد فهموا طبيعة عمل الشرطة بصورة أحادية الجانب، وخصوصاً أنه يصعب التمييز بين واجبات الشرطة و واجبات البوليس داخل المجتمعات المدنية. ولكن هذا لا يغطي سوى جانب واحد من القضية. فالمصادر التأريخية قد تبيّن وبشكل واضح، أن المهام التي كانت تقوم الشرطة بها في العهد الأموي، أوسع بكثير من المهام التي تناطُ برجال البوليس. وعلى الأخص صاحب الشرطة التي كان يتمتع بسلطات شبه مطلقة فيما يتصل بالأمن و النظام، وذلك ما لايتوافر لرئيس البوليس عادة. فواجبات الشرطة في ذلك العهد كان يسود الطابع العسكري، وبذلك تكون الشرطة أقرب للجيش منها لمجرد القوة البوليسية. ولعل الإشتباه و الخلط لدى الكثير من الباحثين يعود الى أن مصطلح الشرطة يكتسب معنى قريباً من قوة البوليس في العصر الراهن.

تنقسم المسؤليات الملقاة على عاتق الشرطة الى خمسة أقسام رئيسية الى الوجه التالي:

١- توفير الحماية للخلفاء و الولاة ضد أعدائهم في اداخل، و حماية المدن من ثورات المتمردين.

٢- معاقبة المذنبين و الخارجين على القانون.

٣- تطبيق حدود الشريعة و غيرها من العقوبات التي تقتضيها المصلحة العامة.

٤- مساعدة الجيش و مساندته ضد أعداء الدولة خارج الأمصار.

٥- تنفيذ عقوبة الإعدام و تعذيب السجناء السياسيين وتقديم كل ما يحتاجه صاحب السجن في تعامله مع السجناء.

وسوف نناقش هذه المسؤليات بشكل واف على النحو التالي :

أولاً : حماية الخلافة و ولاة الأمصار ضد مناوئيهم في الداخل

أول من استخدم الشرطة لحمايته الشخصية من الاغتيال، الخليفة معاوية مؤسس الدولة الأموية، الذي خاض صراعاً سياسياً- عسكرياً عنيفاً مع معارضيه

من الخوارج و غيرهم. وكان الشرطة يحرسون معاوية بشكل دائم في حله و ترحاله[٦]، بل حتى في وقت الصلاة كان هناك حارس يقف عند رأسه وهو يصلي في المحراب[٧]، وعلى ما يبدو أن الخليفة ماكان يسير أبداً، بدون الحراسة، بل كان صاحب الشرطة يسير بين يديه متقلداً كامل سلاحه. تبعاً لما يرويه أبو الفرج، من أن الخليفة هشاماً ما كان يخرج بدون حراسة الشرطة[٨]، وبذلك يأمن الخلفاء جانب أعدائهم من الخوارج و غيرهم فيما لو أراد بالخليفة شراً.

تقوم الشرطة كذلك برئاسة صاحب الشرطة بتوفير الحماية للولاة في الأمصار المختلفة بالطريقة السابقة نفسها، و كما ذُكر سابقاً، أن زياد بن أبيه كان أول والٍ يستخدم الشرطة لأمنه الشخصي. وكان صاحب الشرطة هو المسؤل الأول عن سلامة الوالي[٩]. إن ظهور صاحب الشرطة في مقدمة موكب الخليفة أو الوالي في الأماكن العامة ليس دليلاً فقط على الحماية، بل لإشعار العامة أيضاً بالهيمنة و السلطة.

الى جانب ذلك كانت الشرطة أداة بيد الخلفاء و الولاة لفرض سلطة الدولة على الذين يحاولون التمرد عليها أو معارضتها، فالشرطة كانت دائمة الإستعداد لإلقاء القبض على كل من يبدي المعارضة حتى ولو لم يكن قد حدث منه ما يوجب العقاب، كالقسام بحمل السلاح مثلاً أو تحريض العامة. فالخليفة الوليد الأول مثلاً، أرسل الشرطة لإلقاء القبض على أحد الخوارج لمجرد أنه كان مختبئاً في أحد المنازل بدمشق[١٠].

و بالمثل نجد والي البصرة عبيد الله بن زياد –في عهد معاوية– يغضب على أحد الشعراء، وهو ابن المفرق، مما يضطره الى الإحتماء بأحد الأشراف، وحين علم الوالي بذلك يرسل شرطته في إثره لإلقاء القبض عليه[١١].وفي حادثة أخرى نجد والي خراسان قتيبة بن مسلم– في خلافة سليمان– يرسل صاحب شرطته ليلقى القبض على أحد خصومه وهو يدعى وكيعاً[١٢]، و بالرغم من أن الوالي طلب الرفق في الأمر، إلاّ أنه أعطي أوامره بالقتل فيما لو قاوم وكيع الشرطة عند تنفيذ مهمتهم! !.

فالمهام التي قام بها الشرطة تجاه الخليفة و الولاة توفير الأمن لهم داخل قصورهم . فالولاة المشهورون مثل زياد و ابنه عبيدالله، و الحجاج لم يترددوا في اتحدى الشرطة داخل أماكن إقامتهم[١٣].حدث في إحدى المناسبات أن والي العراق عبيدالله بن زياد كان يستوجب أحد المسجونين، وفي أثناء أستجواب استولى الغضب على السجين و حاول أن يستولي على سيف أحد أفراد الشرطة المحيطين به، ولكنه لم ينجح في محاولته[١٤]، هذه الحادثة تدل على مدى حرص الولاة على إبقاء الشرطة معهم دائماً، حتى في مجالسهم الخاصة[١٥].

كما هو معروف تأريخياً إن العصر الأموي كان عصر الثورات المتلاحقة و الاضطرابات المتعاقبة التي كان يقوم بها الخوارج و الشيعة على وجه الخصوص، وبالذات في البصرة و الكوفة. لقد كان الشرطة على استعداد دائماً لمواجهة هذه الثورات و السعي الى وئدها في المهد، ومحاولة القضاء عليها قضاء تاماً، ولم يترك الشرطة سبيلاً أو وسيلة إلاّ أتبعوها لتحقيق مهامهم.

يشير كثير من المصادر التأريخية الى العديد من الروايات التي تفيد استخدام الشرطة وصاحب الشرطة للتجسس أو الاتصال بالأشخاص الذين يستطيعون أن يمدوهم بشتى المعلومات حول المتمردين. من ذلك أن صاحب الشرطة الكوفة المغيرة بن شعبة (٤١- ٦٦١/٢٠/٦٧٠)، كثيراً ما كان يطلب من الوالي أن يعطيه الإذن بالمداهمة للمنازل التي يسمع أنها للثوار[١٦].

من الحوادث التي وقعت في الكوفة خلال ولاية عبدالله بن مطيع عام ٦٨٥/٦٦ أن صاحب الشرطة أخبر الوالي تجمع الشيعة بقيادة المختار بهدف الاستيلاء على المدينة، وعلى مايبدو أن المعلومات قد وصلت الى صاحب الشرطة عن طريق أحد الجواسيس الذين خصصهم لغرض المراقبة[١٧]. وهذا يدل على شدة حذر صاحب الشرطة تجاه الفرق المعارضة للسلطة، وتوقيه للأمور قبل حدوثها. وللأسف فإن

